# بیرەوەرییە هەرگیز لەبیرنەکراوەکانی من

نووسینی

**گەلاوێژ**

پێشەکی

**کەمال غەمبار**

بەشی یەکەم



دەمێکبوو لەدڵمدابوو کەهەندێ بیرەوەرییە لەبیرنەچووەکانی خۆم بنووسم لەگەڵ چەند کەسێکی زۆر بەنرخ و خۆشەویستمدا کە کارێکی زۆریان هەبووە بەسەر ژیان و ڕەوشت و خوو وکردەوەکانمەوە.

یەکەمیان، کەلەتەمەنی پێنج شەش ساڵییەوە ڕایهێنابووم لەگەڵ ڕاستی و پاکی و نەفرەت لەدرۆو پێچ و پەنا، هەروەها ئاشناشی کردبووم لەوشەو ناوی میللەتپەرستی و خەباتکردن و ناوی حەپسخانەو بەندیخانە و گرتن و ماڵپشکنین.

ئەم یەکەم کەسە خاڵی خۆشەویستم بوو، هەمزە عەبدوڵلای نەمرو سەربەرز.

دووهەم کەسیش، خاڵی خۆشەویست و کەموێنە، خاڵە گەورەکەم، (محەمەد عەبدوڵلا)یە. ئەم خاڵەم ژیانی خستە سەرژیانی من و دایکم و خوشکم، ژنیشی نەهێنا و بەبێ نەوەمایەوە و هەر ئیمرۆ بەسبەینێی ئەکرد بۆ ژنهێنان و ئەیگوت: نەوەکا ژن بێنم و لەگەڵ خوشك و خوشکەزاکانمدا باش نەبێت و بکەوێتە بۆڵەبۆڵ، دواییش بکەوینە تەگەرەوە.

ئەم خاڵە خۆشەویست و بێوێنەیەم وای بەخێوئەکردین و وای ۆ ئەکردین کە بەدریژلیی ژیا و مناڵیم تاوەکو شوومکردووە و گەیشتوومەتە ئەو تەمەنە، هەستم نەکردووە قەت لەباوکم دوورم، هەرچەندە من کەم باوکمم دیوەو لەگەڵی ژیاوم، چونکە هەر لەکۆرپەییەوە لەباوەشی بەسۆزی نەنکم (دایکی دایکم) گەورەبووم و هەمیشە بەڕێگەی بەغدا و موسڵەوەبووین لەبەرخاتری و خوێندن و زانکۆ و کولێجەکانی بەغدا کە خاڵە گەورەکەم دەرچووی کۆلێجی عەسکەری بوو و خاڵە هەمزەشم دەرچووی کۆلێجی حقوق بوو لەبەغدا.هەرچەندە باسی ئەم دووخاڵە خۆشەویستانەم بکەم هێشتا هەرکەمە.

هەرچەندە باوکم، صالح فتاح، پیاوێکی زۆر لێهاتووبوو و لەعەشرەتی قوچە بەگی ڕەسەن و بەناوبانگبوو. زۆر پیاوێکی میهرەبان و بەڕەحم بوو، بەجۆرێك کە حەزی ئەکرد پارووەکەی دەمی خۆشی بدا بەلێقەوماو.

هەروەها زۆریش خۆشەویستبوو لەلای هەموومان بەتایبەتی لای خاڵەکانم و نەنکم، بەڵام لەبەر فەرقی تەمەن کە باوکم ژنی تری هەبوو و هەر ئامۆزای خۆی بوو و زۆر ژنێکی بەحورمەت و فیداکاربوو و هەروەها باوکم مناڵیشی هەبوو و کەدایکمی هێنا، دایکم زۆر مناڵکاربوو، بۆیە دایکم ڕێنەکەوت لەگەڵ باوکم، ڕۆژێك لەماڵی خۆی ئەبوو، ڕۆژێك لەماڵی دایکی و براکانی، لەبەرئەوەی کە خاڵە محەمەدم نەفیکراو دوورخرایەوە بۆ خوارووی عێراق بۆ (سەحرای عفك و دیوانییە).

دایکم بەتەواوی لەباوکم جیابووەوە و لەگەڵ براکانی و دایکی ڕۆیشت بۆ خوارووی عێراق، بەڵام بەبێ تەڵاق، چونکە باوکم ئەیگوت ئەگەر مەحکەمەو حکومەت زمانیان بڕیووم تەڵاق نایەتە سەرزمانم، چونکە دایکمی زۆر خۆشەویست، هەروەها ناوی تەڵاقیش ئەوکاتانە شەرم و ناشرین بوو.

کەسی سێیەمی لەبیرنەچووی من، نەنکە شیرینەکەم بوو، (دایکی دایکم) کە لەباوەشی بەسۆزی ئەودا گەورەبووم.

لەو تەمەنە بچووکەمدا لای من جێی سەرسوڕمان بوو کەنەنکم خوێندەواربوو و دایکم نەخوێندەواربوو، ئەویش چونکە نەنکم خەڵکی شاری (وان)ی کوردستانی تورکیابوو.

کچی زانیەکی گەورەبوو ناوی (سەید سلێمانی سری)بوو، باپیری سەید سلێمانی کوڕی شێخ محەمەدی نەوەی شێخ عیسێ و شێخ موسێ بەرزنجی بوو. دایکم ئەوکاتەی هاتبوون بۆ زاخۆ، مەکتەبی کچانی لێنەبوو، تەنیا مەکتەبی کوڕان هەبوو.

چوارەم کەسیش، ئەوە دایکە شیرینە بێوێنەکەمە کە ئەوەندە ژنی باش و میهرەبان و دڵسۆز و ماندوویی نەناس بوو، کە هەر لەباسکردن و دێڕ و لاپەڕەنووسیندا دوایی نایێت. دایکم زۆری ژیانی هەر لەناڕەحەتی و ەگەرەدا بوو، لەبەر زروفی نالەباری خ الەکا بەدەست ترتق و بەدولەگ بوونی حکومەتە دوابڕاوەکانی ئەوسای عێراقەوە کەهەر لەباسکردن نایێن، ئەوەندە دایکم ئەزیەت وئازاری ئەبینی و ئەچێشت کاتێ الەکا ئەخرانخ ژێرچاودێریی وئەگیران ودوورئەخران ونەفیئەکران.

دایکە خۆشەویستەکەم زۆر دایکێکی کەم وێنەبوو و زۆر هونەرمەندێکی دەست و پەنجەزێڕین بوو، هەر لەڕووی درووومان و نەقش و چنین و زەوقی رێکخستنی ماڵەوە تاوەکو کەیبانووی دەستپوختی رەنگینەوە کە نان و چێشتەکانی زۆر بەناوبانگ و بەلەزەتبوون، ئێمەش لەسایەی ئەوەوە فێری چێشتلێنانی خۆش بووین. بۆیە خۆم و هەندێ ەکچەکا، زۆرجار تەگەرەمان هەیە لەگەڵ نان و چێشە لۆشی وت ناخۆشی، هەروەها دایکم دەنگیشی زۆر خۆشبوو.

پێنجەم خۆشەویستم کە هەمیشە یادو رەنگ و شێوە جوانەکەیی و قسەخۆشەکانی لەبەرچاومن و لەگوێچکەمدا ئەزرنگێتەوە و لەناو دەروونمدا هەرتازە ئەبنەوە، ئەویش هاوسەری نەمرو بێ وێنە (مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد)، باوکی هێرۆیە. باوکی هێرۆ بەدرێژایی ژیان و پەیوەندیمان پێکەوە هەمیشە ئەسپسوارەکەی خەووخەیاڵ بوو لەلای من، نەك هەر کاتی گەنجی، بگرە لەهەمووکات و تەمەنێکیدا هەروابووە لەلام. مووی سپی و لاجانی سپی و لەدوایشدا سەری سپی، جوانترین دیمەن و خۆشەویسترین بینینم بوو.

باوکی هێرۆ، هەروەك ئەوچەند دێڕەم بۆ نوسیبوو،کاتێ یەکێك لەکتێبەکا پێشکەش کردبوو و پێیم گوتبوو:



ئەم چەند دێڕانە پێشکەش
بەیەکەم وشەی دڵداری کاتی جوانیم
بۆئاوازی بەسۆزی هەموو لاوێتیم
ۆ سلۆنی و بیۆینەی تەمەب.
بۆ دوادێڕی عەشق و خۆشەویستیم
بۆ ئەوەی لەناو ئەشکەوت و سەرشاخەکانا هاودەمم بوو.
و لەغەریبی و دەربەدەریدا وڵاتم بوو.
بۆئەوەی لەپاکی، پاکترو لەڕاستی، راستربوو
و قەڵای بەرزی هیواو ئاواتم بوو.
بۆئەوەی شەیدای روخسار و شێتی شۆریم بوو.
و دەریای بێسنووری بڕواو نازم بوو.
ئێستە چۆن بێ ئەو بژیم و چۆن بڕوابکەم
کەوا لەچاوتروکانێکدا ئیتر لێم ونبوو؟

ابزا ئەم چەند دێڕانە دەری ئەخەنوە باوکی هیرۆچ مرۆڤێك بووەو چ دڵسۆزێك و پەیوەندیمان لەگەڵ یەك چۆن بووە. بۆیە باسی باوکی هێرۆ هەر ئەوەندە ئەنووسم.

خوێندەوارانی بەڕێزو خۆشەویست لێم ببوورن کە ئەگەر نووسینی یکوەرییەکا هەندێ پشت و پێشبەوتوون بەسادەیی و کوردی پەتیم نووسیووە. بەڕاستی خۆم حەز بەوشێوە نوسینە ئەکەم کەوەکو لەپێشەکی ورەو ئشکەوتی دلیزا نوسیبووم کە حەزئەکەم فاتە.بخوله و ئامە و عەدولیش لەم نوسینانە تێبگەن.

لەڕاستیدا خۆشم قەت حەز لەزۆری ئەم وشەو کەلیمە تازانە ناکەم کە بووە بەعەلمۆدەی ئەم کاتە، بێئەوەی بزانین ئەم وشە و کەلیمە تازەبابەتانە چین و لەکوێوە هاتوون و لەچ قاموسێك دەرهاتوون کەوا سەرلەخوێنەر

ئەشێوێنیٚ و تەنیا ئەم چینە بەسەزمانە منالأنە پێئەگەیەنین کە لەوجۆرە وشەو کەلیمە سەیروسەمەرانە تێبگەن و فێری بن، بەڕاستی ئەمە تەعدایە لەزەوق و زمانی کوردی رەسەن ئەکرێت. من خۆم نەلێیان تێئەگەم و نە حەزئەکەم قەت تێبگەم لێیان.

گەلاوێژ

٢٠٠٨/٧/١٤

سلێمانی

باپیرم عەبدوڵڵا خەڵکی زۆزانی کوردستانی تورکیایە. نەنکم دایکی دایکم کەناوی ئامینەیە خەڵکی شاری (وانە) لەکوردستانی تورکیا. کچی سەید سلێمانی سریە کە کورەزا و نەوەی شێخ محەمەدی نەوەی شێخ عیسیٚ ی بەرزنجەیە.

بێجگە لەوەش سەید سلێمانی سری زانایەکی گەورە بوو، ئێستەش کتێب و دەست وخەتیمان هەیە لەگەڵ قورئانێك کە بەخەتی دەستی ئەو نوسراوە. بە عەرەبی و فارسی و تورکی کتێبی هەیە کە خۆی نوسیویەتی.

بێجگە لەوەش مامۆستای کولیەی عەسکەری عوسمانلی بووە لەشاری وان. هەر بۆیەش ڕازی بووە کە کچەکەی خۆی نەنکم (ئامینەیە)،بدات بە باپیرم عەبدوڵڵا کاتیٚ مامۆستای بوە کە بووە بەئەفسەر (زابت)، لەبەرئەوەی شارەزای ڕەوشت و خوی باپیرم بووە وزۆری خۆشویستوە لەبەرئەوە کە هاتوون داوای ئامینەیان بۆ عەبدوڵڵا کردووە ڕازی بووە و پێی خۆش بووە. ئەگەرچی جیاوازیەکی زۆر لەنێوان خێزانەکەی سەید سلێمانی سری وباپیرم عەبدوڵڵا دا هەبووە ئەویش چونکە خێزان و ماڵی باپیرم عەشایەر بوون و کۆچەربوون و گەرمیان و کوێستانیان کردووە و خاوەن ئاژەڵ و مەڕومالاٚت و گۆلك و گا بوون. خانەوادەی نەنکیشم سەید سلێمانی سری شارستانی و خوێندەوار و خاوەن عیلم و پێشکەوتن و خاوەنی قەڵەم و کاغەزبوون. بۆیە جیاوازی زۆر هەبووە لەبەینیاندا، لەگەڵ ئەوەشدا عەبدولاٚی باپیرم نێراوە بۆ خوێندن بۆ شاری وان.

کە باپیرم عەبدوڵڵا نەنکم ئەهێنێت و بەینێکی بەسەردا ئەچێت حەزئەکات بچێتەوە بۆ ماڵی خۆیان و ژنەکەشی ببات لەگەڵ خۆی و ئیتر لەویٚ بمێنێتەوە چونکە ئیشی ئیتر لەویٚ تەواو ئەبێت.



سەید سلێمان و نەنە حلیمە کە دایکی ئامینەی نەنکمە کە گوێیان لەوە ئەبێت کە ئەبێت ئیتر ئامینە لەگەڵ مێردەکەی بێت بۆ هەر کوێیەك چوو، زۆریان پیٚ ناخۆش ئەبێت لەدلاٚ، وەکو لەبانێکیان بەردەیتە خواریٚ چونکە ئامینەی کچیان نۆبەرەیان بوو، زۆر خۆشەویستیان بووە چۆن وا بەئاسانی ئێستە ئەبیٚ لێیان جیا بێتەوە و دوورکەوێتەوە. بۆیە دایك و باوکی سەریان لیٚ ئەشێوێت. لەگەڵ ئەوەشدا کە کچێکی لەو منالٚتریان هەبووە لەگەڵ کوڕێك، کچەکە ناوی سندس بوو کوڕەکەش ناوی زهنی، بەلاٚم وەکو پێشینان گوتەنی: دیارە هەرپەنجەیە ژانی خۆی هەیە.

ئاخری کاتی ڕۆیشتنی دێت، دایکی نەنکم (نەنە حەلیمە)لەگەڵ مێردەکەی تەکبیرئەکەن کە ئەبیٚ لەگەڵ کچەی بڕوات تاوەکو هیچ نەبێت بزانن جێگاو ڕێگای چۆنە. ئیتر ئەکەونە ڕیٚ بەرەو زۆزان و شاخ و کوێستان. کە ئەگەنە جیٚ و خێزان و عەشرەتەکەی باپیرم(عەشرەتی شەرەفا)ئەبینن سەریان سوڕ ئەمێنێت. دایکی نەنکم زۆر نارەحەت ئەبێت و ئەچێت بەگژ باپیرمدا و ئەڵێت ئێوە بۆ نەتان گوتوە کە ئێوە وان و کۆچەرن ئێستە من ئەم کچەم چۆن ئەتوانێت لەناو گۆلك و مانگاو مەڕو بزندا بژێت. بێجگە لەهەمووشی تۆ ژنی تریشت هەیە.

نەنە ئەیکات بەهەراو عاجز ئەبێت و ئەتۆرێت و نان ناخوات. باپیرم هەر دەستی ماچ ئەکات و لێی ئەپاڕێتەوە و خێزانەکەی باپیرم کەلەژمار نەئەهات هەموویان لەژێر چاودێری باپیرم دابوون. بەلاٚم قسەی دایکی، (قەنتار خان)بەسەر هەموویاندا ڕۆیوەو کەس نەیتوانیوە لەقسەی دەرچێت هەروەها باپیرم خوشکێکی زۆر زیرەك و ئاقڵیشی هەبووە ناوی مریەم بووە. ئەوە هەر لەدوانزە سیانزە ساڵیدا بیٚ ئەوەی خوێندەواریش بێت کردەوەو قسەو ڕەفتاری زۆر لەبەر چاو بووە و هەموو بۆیان دەرکەوتوە کە مریەم لەهەموو دەوروپشتی خۆی جیاوازترە بگرە بەو منالٚییە زۆر شتیان

بە قسە کردووە، ئەوەندە قسەکانی ڕێك و بەبەهابوون. ئیتر مریەمیش گەورە ئەبێت و بیرو بۆچوزنە هەڵکەوتووەکانیشی لەگەڵی گەورەتر ئەبن.

ئەوکاتە نەنکم (ئامینە) و نەنە حەلیمەی دایکی کە ئەچنە لای خێڵی باپیرم شەوئەبێت، نەنە تووڕە ئەبێت کە باپیرم باسی خۆیانی بۆ نەگێڕابوونەوە کە ئەوان کۆچەرن و عەشایرن و گەرمیان وکوێستان ئەکەن. ئەوکاتە ئامینەی دایکی دایکم شانزە ساڵ ئەبێت و ئەو خوشکە زیرەکەی باپیرم مریەم بیست و پێنج ساڵێك ئەبێت،بۆیە هەر زوو خۆی ئەگەیەنێتە ئامینە و دڵی ئەداتەوە و زۆر بەدەوریان دێت لەگەڵ هەموو خێڵ، ئیتر نەنکم ئەوەندە وەکو دایکی تووڕە و ناڕازی نابێت بە پێچەوانە لەدایکی ئەپاڕێتەوە و ئەڵێت: دایە گیان قەی چی ئەکات ئەمان وان و لەژێر ڕەشماڵدان و مەڕومالاَت و حەیوانیان هەیە، ئەبینی چەند خەڵکی باشن چەند ئێمەیان خۆش ئەوێت و چەند ڕێزو قەدرمان ئەگرن. قەی چی ئەکات ڕەفتارو ژیانیا زۆر بەدڵو زۆر لەلا مخۆشە ەر ە.

نەنەش تووڕە ئەبێت و ئەڵێت: چۆن عەبدوڵلاَ ئەم کارە و حاڵەی خۆیانی پێ نەگوتوین؟ سەرباقی دەردان ژنێکی تریشی هەیە و کوڕو کچی هەیە.

هەر نەنە چاك نابێتەوە ئیتر لەئاخریا دڵی ئەویش چاك ئەبێت، سێ بەشی بە هەوڵدان و تێکەڵ بونی مریەم لەگەڵیان. مریەمیان خۆش ئەوێت و ئەبێتە دڵسۆزێکی زۆر نزیك و باوەڕ پێکراوی ئامینەی نەنکم.

نەنە ئەگەڕێتەوە دوای ئەوەی دڵنیا ئەبێت لەحاڵی کچەکەی کەهەموو خۆشیان ئەوێت تاوەکو ژنی باپیریشم کەناوی (شەمسە)بووە و ئەوەندە ژنی چاك و بەحورمەت و دڵپاك بووە، زۆر گەنجێکی ڕەوشت و خوو بەرز بووە هەروەها کچە پیاوی دەوڵەمەندیش بووە. ئەویش هەر دڵی نەنە و ئامینەی کچی داوەتەوە.



ئیتر نەنە ئەگەڕێتەوە بۆ شاری وان و ئەو باس و خەبەرانە بۆ سەید سلێمانی مێردی ئەگێڕێتەوە.

دوای بەینێك نەنە ئەچێتەوە بۆ لای نەنکم چونکە خەریکی مناڵ بوون ئەبێت. وچەند جارێك لەهاتوچۆدا ئەبن کە ئیتر شەڕی جیهانی یەکەم دەست پێ ئەکات و باپیرم ئەچێت بۆ جەبهە و ناوشەڕ و خێڵەکەی ئەکەونە ڕێ بەرەو عێراق و موسڵ و زاخۆ. نەنەش کە تا ئەوسا کچەکەی تریشی (سندس) دابوو بەشوو بە کابرایەکی ناودار و خانەدان کە ناوی مصطفی ئەفەندی شێخ لئیسلام ئۆغرلی بوو خەڵکی شاری وان بوو.

ئیتر نەنە دڵنیا ئەبێت لەشوێن وژیانی کچەکەی تری و شەڕیش دەست پێ ئەکات ناچار نەنە ماڵ و حاڵ و هەموو ڕەزوباخ وموڵکی بەجێ ئەهێڵێت دەستی(زهنی)کوڕی ئەگرێت. دیارە ئەوکاتە هەردوای شووکردنی سندسی کچی سەید سلێمانی مێردیشی ئەمری خوا ئەکات، بۆیە شوێن ئامینەی کچی و ماڵ و مناڵی ئەکەوێت.

دایکم ئەیگێڕێتەوە کە نەنە لەڕێگاو کاتی ڕاکردن لەشەڕ،متیل و چەرچەفی نوێنی ئەدڕاند و لەقاچی مناڵ و خێزانەکەیەوە ئەپێچا، لەبەرئەوەی لەڕێگای سەخت و دوورو درێژ پێڵاویان لەپێدا نەمابوو و دڕابوو بۆیە نەنە وای بۆ ئەکردن. هەرچەندە پێیان نەکرابوو کەهیچ دەرکەن و هیچ بێنن لەگەڵ خۆیان و خەڵك وای بەسەر هاتبوو شتی زۆر بەبەهاو گرنگی خۆی فڕێ ئەداو لەکۆڵ خۆی ئەکردەوە، هەروەك ژنێك کە خەریك بووبوو دوو مناڵەکەی بەجێ بهێڵێت لەسەر ڕێگاکە چونکە خۆی نەخۆش بوو، ئەبوو مناڵەکانیشی هەڵگرێت و بە پێ بڕوات. ئیتر لێ قەومانەکە یەکجار سەخت و ناخۆش بووە بۆیە ماڵ و خێڵی باپیریشم هەر هیچیان پێ دەرنەکراوە لەمتیل و بەرگە نوێن و هەندێ جل زیاتر.

هەروەها دوو مانگای چاکیش کە شیری زۆریان هەبوو لەگەڵ گۆلکەکانیان. دوو مانگاکە هیچ نەبێت هەندێ بوخچە جلی بخەنە سەرپشت. هەروەها منداڵەکانیش بەپێ بڕۆن و بەنۆرە سواری پشتی مانگاکان بن بێجگە لەوەی کە شیرەکەشیان بخۆنەوە.

وەکو نەنکم و نەنەش ئەیانگێڕایەوە بۆمان کەچۆن نەنکم هەندێ پیاڵەی جوان و سەماوەرێکی نایابی خۆی هێنابوو بەڵام لەنیوەی ڕێگا سەماوەرەکەیان فڕێ داوە لەبەر قورسی، بە تایبەتی کەنەخۆشی تاعونیش بڵاوبووبووەوە و زۆری خەڵك لەڕێگا نەخۆش کەوتوون ومردوون.

لەڕێگا ئەبن کە خەبەریان بۆ دێت باپیرم شەهید بووە و ئەبێ کەسێك بنێرن ئەسپ و کەلوپەلەکانی وەرگرێت. ئیتر بێجگە لەوەی کەچیان بەسەردێت بەو خەبەرە، ئەکەونە بیرکردن کە کێ بنێرن تاوەکو ئەسپ و کەل و پەلی باپیرم وەرگرێت، لەگەڵ بەڵگەو فەرمانی تەقاویتی کە بچن ئەوکارە جێ بەجێ کەن لەموسڵ و پارەکەیان بۆ وەرگرن.

مریەم، ئەو خوشکە ئاقڵەی باپیرم کەئەبێتە پووری دایکم ئەڵێت من ئەچم. هەموو ئەڵێن کچێ تۆ چۆن ئەچیت بەناو ئەو هەموو ترس و کوشتن و برینانەدا؟ ئەڵێت هەر من ئەچم. خوشکەزایەکیشی ئەبێت هەرزەکارێکی بە هیمەت ئەبێت ئەڵێت من و قاسم ئەچین و کوڕی نەنەش (خاڵی دایکم)کە ناوی (زهنی)یە عومری هەژدە ساڵە.

ئیتر ئەکەوێتە رێ و خۆی ئەپێچێتەوە و لەگەڵ قاسمی خوشکەزای و زهنی برای نەنکم.

ئازا شوێنەکە کوێ ئەبێت ئەچێت و ئەسپ ذ ش تەکانی باپیرم وەردەگرێت لەگەڵ کاغەزو بەڵگەکانی.

تا ئەگەڕێنەوە نیوەی خێڵەکەیان مردوون یانەخۆش کەوتوون.



لەوانەی مردوون دایکی بوو(قەنتار)وخوشکێکی کەناوی زەینەب بوو و کەیبانویەکی زۆر ئازاو دەست و پەنجە پوخت و زیڕین بوو. هەروەها خاڵم ئەحمەد کە نۆبەرەی نەنکم بوو، ئەوکاتەی ئەمری خوای کردبوو عومری دە ساڵان بوو ئەو تاعونی هێنابووە ناو خێڵەکە، کە چووبووە شوێنێکی زۆر نزیك شوێنەکەیان کە پێیان ئەگوت مەزاری شێخ عبدالعزیزی ئاکرەیی. ئەوانیش لەدەوروبەری ئاکرێ بوون. ئەڵێن ئەو خاڵەم هەر حەزی کردووە بچێت بۆ ئەو ناوە کەلەوێ بەفریان ئەفرۆشت، بچن ئێواران بەفر بکڕن لەگەڵ خەڵکی تر. ئەڵێن زۆر حەزی کردووە هەموو جارێك بچێت کە ئەگەڕایەوە لەڕێگا گۆرانی ئەگوت، ئەڵێن دەنگی زۆر خۆش بووە. ئینجا جارێك کە ئەگەڕێتەوە بەدەم لەرزەوە و باسی ڕەشماڵ و مردووەکان ئەکات. ئیتر ئەوانی تریش لێی ئەگرن و زۆریان ئەمرن وخۆشی هەر ئەمرێ. بۆیە کەمریەم بەسەر ئەو کارەسات و خەمەدا ئەگەڕێتەوە، بێجگە لەخەمی برا شەهیدەکەی، ئیتر مریەم ئەبێتە هەموو شتێکی ئەو خێڵ و خێزانە و بە پێی ئەقڵ و تەکبیری ئەو ئەڕۆن بەڕێوە.

سەرباقی دەردانیش چەتە و دز و پیاوکوژیش لەو ڕێگاوبانە و لەو ناوچەنەدا زۆر ئەبن. وەکو نەنکم بۆی ئەگێڕاینەوە، هەروەها مریەم پووری دایکم خۆشی کە لەدواییدا و لەکاتی منداڵی ئێمە پێمان ئەگوت (مامۆ)،کە شەوێکیان مانگە شەوێکی خۆش ئەبێت بەڕێوە ئەبن چەتە دێتە سەریان و پەلاماری هەردوو مانگاکە ئەدەن بە بوخچەو جلەکانەوە ئەیانفڕێنن و ئەیبەن. هەرچەندە مریەم شوێنیان ئەکەوێت فایدەی نابێت. بۆ بەیانی ئەیکات بەهەراو ئەکەوێتە پرس و پرسیار کە ئەم چەتانە کێن و سەربەکێن ئاخری ئەزانن کە ئەمانە سەر بەکابرایەکن بەناوی (ئۆغز بەگی هەرکیی).

ئیتر مریەم یا مامۆ دەست بەردار نابێت و ئەچێتە بنج و بناوانی و دێ و ماڵی ئەدۆزێتەوە و ئەچێتە سەری و پێی ئەڵێت ئەوە تۆ شەرم ناکەیت

چەتەکانت بەرئەدەیتە گیانی ئەو خەڵکە لێ قەوماو و ماندوو و بێچارانە کە دزیت بۆ بکەن. من بەباریێ منالێی هەتیوەوە هەمووی هەفتەیەکە برایەکم لەشەڕدا شەهید بووەو دایکم و نیوەی خێڵەکەمان لەڕێگا مردوون. منالّ و گەورەم هەموو نەخۆش و بێ حاڵ، تۆ وا ئەکەیت.

ئۆغز بەگ ئەکەوێتە عوزر هێنان و ئەڵێت من نیم و پیاوی من نین و من چۆن وا ئەکەم؟! مامۆش سەیری ئەکات و پێی ئەڵێت: تۆ نیت ؟ ئەی ئەم یەلەگ و کراسەی لەبەرتایە هی کێ یە؟

ئۆغز بەگ ئەشڵەژێ و دەست بە سنگ و بەرۆکی خۆیا ئەهێنێت و ئەڵێت: دیارە ئەوانە هی منن ئەی هی کێن.

مامۆ بەتەوسێکەوە سەیری ئەکات و ئەڵێت: ئەمانە هی تۆن یاخود هی ئێمەن کەلەناو بوخچەو بارەکەی سەرپشتی مانگاکانمدا بووە لەوەش دزی ئاشکراتر نابێ.

دوایی هەردوو مانگاو هەندێ کەلوپەلەکانی بۆ ناردبوەوە گوتبوی: وەڵا زۆر شەرمم کرد کە کچێك ئەوەندە ئازا و بەغیرەت بێت و ببێتە پیاو و لێپرسراوی ئەو هەموو خێڵ و خێزانەی خۆی بەو هەموو ڕێگا سەخت و ژیانە دژوارەوە خەریکی پاراستنیان بێت.

ئیتر خێڵی نەنکم وردە وردە گەیشتبوونە دێهات و ئاوایی تاوەکو گەیشتبوونە موسڵ و لەویادا دائەمەزرێن و مامۆ ئەکەوێتە هەڵپە هەڵپی ئیشی تقاعودی، بەینێکی پێ ئەچێت تاوەکو تقاعودی ئەو هەموکاتەیان بۆ دەرئەچێت. ئێستەش دایکم تقاعودی باوکی وەرئەگرێت. دایکم و مامۆش دوایی بۆی ئەگێڕاینەوە کە دوو بەرگە سەرینی بردبوو لەگەڵ دوو پیاو و شەمسەی باوەژنی دایکم و نەنکم کە هەردوو ژنی باپیرم بوون و پڕ ئەو دوو بەرگە سەرینە ( بانکە نوت ) یان وەرگرتبوو.



ئەگەرچی کە دوایی زروف باش بووبوو وشەڕ نەمابوو، حکومەتی تورکی ناردبووی کە ماڵەکان بگەڕێنەوە، بەڵام ماڵی نەنکم خۆیان دزیبووەوە و نەچووبوون لەبەرئەوەی هەندێ ئاشنایان گەیشتبوونە زاخۆ و پێیان گوتبوون و کەوتبوونە ژێریان کە بێن بۆ زاخۆ و مەگەڕێنەوە. وەرنە زاخۆ لای ئێمە باشترە.

زۆرجار دایکم کە تووڕە ئەبوو ئەیگوت : ئۆه خۆزگە ئێمەش بگەڕاینایەوە، ئێستە منیش وەکو ناجیە خانی خوشکم خوێندەوار ئەبووم. (ناجیە خان)کە ژنی ئەمین ڕەواندزیە رەفیق و هاوڕێی دایکم بووە. لەو ڕێگاوبانەو لەموسڵ خراونەتە خانوویەکەوە، دوایی ناجیەخان و نەنکی گەڕاونەتەوە تورکیا کە حکومەت ناردوویەتی بە دوایاندا. بەڵام ماڵی دایکم و ئەوان نەڕۆیشتوون و تەقاوتی خۆیان وەرگرتوە و چوونەتە لەخۆ و خ اڵەکا کە گەورەبوزە مامۆ و د ایکیان ناردویانن بۆ مەکتەب و، بەڵام ئەوکاتە مەکتەبی کچان نەبوو بۆیە دایکم داخی ئەوەی لەدڵابوو کە بۆچی نەچوون تاوەکو بچوایەتە مەکتەب. ئەگەرچی دایکم هەندێ خوێندن و نوسینی عەرەبی ئەزانی و ئێمە لەدواییدا فێرمان کردبوو.

ئینجا ئەمە بووە هۆی چوونی ماڵی نەنکم و خێڵیان بۆ زاخۆ و ئەو دەرەبەگە حەسودو دواکەوتوانە بەخیلیان پێ ئەبردن کە گوایە ئەوان خەڵکی ئەوێ نەبوون کەچی لەوان پێشکەوتوو ترو خۆشەویست تربوون لەلای خەڵکی زاخۆ.

مامۆ ئیتر ناو دەرئەکات و ئەبێتە (شەخصیەت)لەلای هەموو دەوروپشت و نزیك و تاوەکو حکومەتیش، بەهۆی ئەو کارانەوە کە چەند بەغیرەت و مەردو ئازا ئەبێت.

هەروەك ئەوەی پێش دەرچوونی تەقاوتی باپیرم کە هەندێ زۆری پێ چووبوو مامۆ چووبوو ئیشێك بدۆزێتەوە تاوەکو بژین، لەترسی ئەوەی

منداڵەکان و خێزانەکەی برسی و موحتاج نەبن، کە ئینگلیز ویستویەتی ڕێگاوبان و شارەکان پێکەوە ببەستێت،مامۆ کراوە بەچاوشی عەمەلە لەبەینی ڕێگای زاخۆ و ئامێدی کەویستویانە ئەوێ بکەن بەڕێگا. بەڵام ئەوەندە سەخت بووە و هەمووی شاخ و داخ بووە هەمووجارێك بۆمبایان ئەتەقاند، تاوەکو پارمەتیان بدات و زۆر جاریش بۆمباکە خەڵکی کوشتبوو خەڵکی پێوە بوو بوو.

مامۆ بەهۆی موهەندیسێکی ناسیاویان کە ناوی عەبدولکەریم مورداد بوو وئینگلیزیشی زانیوە، ئەو هەوڵی بۆ مامۆ داوە و دایمەزراندوە بە چاوشی عەمەلە بەمانگانەیەکی باش. هەروەها لێپرسراوانی ئەو ئیشە پارمەتیان دابوو کە زانیویانە ئەوەندە بە غیرەتە و ئەو کارو ئەزیەتە قبوڵ ئەکات لەبەر خاتری برازاو خێزانی، بۆیە چادرێکیان دابوێ. مامۆش ناردبووی نەنە و دایکم کە منداڵ بوو چوار پێنج ساڵان بوو، چووبوون بۆ لای و لەلای مابوونەوە تاوەکو ئیشەکە تەواو بووبوو.

مامۆ، کەهێشا نەگەیشتبونە موسڵ و ئەو ناوە و هەربەڕێوەبوون و هیچ نەمابوو بیخۆن و منداڵان زۆریان برسی بوو، دەفێکی گرتبوو بە دەستیەوە چوو بووە ئەو دێهاتە نزیکانە گۆرانی دەروێشی بۆ گوتبوون، وەکو دەروێش و نان و خواردنی بۆ منداڵەکانی پەیداکردبوو.

من خۆم تاوەکو پۆلی یەك و دووی ئیبتدائی، وەمئەزانی مامۆ پیاوە، چونکە جلی پیاوانەی لەبەر ئەکرد، کراسی پیاوانەی ژێر چاکەت و یەلەکی دامێن درێژو سەریشی ئەبەست بە مشکی. کەچی مامۆ نەك ژن بوو بگرە کچێکی زۆر خوێن شیرینش بوو، بەڵام ژیان و ڕوح و وتەمەنی لەسەر ماڵ و منداڵی برای شەهیدی دانابوو بۆ حەوت باوك و حەوت پشت.

مامۆ ئەسپ سوارێکی زۆر ئازابو و راوڕاوێن کەرێکی بەجەرگ بوو.

هەروەها مامۆ نیشان گرێکی زۆر چاکیش بوو. چەندەها جار گرەوی لەچەندین پیاو بردۆتەوە لەنیشان گرتندا و تێکەڵی ماڵی سەید تەهای نەهری بوو کەگرەوی لەگەڵ سەید تەها و دەوروپشتی کردووە. وکاتی گرەوکردن بۆ نیشان نانەوە گرەوی لەچەندەها پیاو بردۆتەوە. مامۆ ئەوە نییە کە بەم چەند دێرە باسی بکەم. مامۆ ئەگەر کوردی بێکەس نەبوایە ئێستە کتێب و فلمی لەسەر دەرهاتبوو. بەڵام مامۆ و هەزارەهای وەك مامۆی قارەمان و سەربەرز و ئازای کورد مردوون بەبێ ناونیشان. مامۆ زۆر زۆر شتی وای هەیە کە باسی بکەم و لەسەری بنوسم و ئەوە ئەهێنێت کە کتێبێکی تایبەتی لەسەر بنوسم. و نیازم هەیە هەر بینوسم.

من ئەوەتەی هەستی ئەوەم پەیدا کردبوو کە بخوێنمەوە و بنووسم. زۆر جار ئەهاتە خەیاڵم کە ئەوانەی پاڵەوانی چیرۆك و کتێبن کە باسیان ئەخوێنمەوە مامۆ هیچی لەوان کەمتر نییە ئەی، بۆچی باسی مامۆ نەکەم و کەس باسی نەزانێت. چونکە مامۆ کوردە بووە ؟ بۆیە کەس باسی ناکات.

زۆر ئاشکرایە ئەگەر مامۆ نەتەوەیەکی تر بوایە ئێستە چەندین کتێبی لەسەر نوسرابو و باسی کرابوو. چەندەها کەسی وەکو مامۆ قارەمانیان کردوە و چەندەها کاری مەردانەیان کردووە و کەس پێی نەزانیوە و هەرباسیشیان نەکراوە و بۆ خۆیان مردوون و ئەو هەموو بیرو و هەست و حەکایەت و روداوانەشیان لەگەڵ خۆیان بردۆتە ژێر گڵەوە. کەچی هی واش هەن ئەگەر جارێك شتێکی باشیان کردبێ و چەندەها جار شتی خراپیان کردبێ تاوەکو خیانەت و جاسوسی بەسەر میلەتەکەیاندا کردبێ کەچی ئەبینی دوای چەند ساڵێك کتێبیان لەسەر دەرئەکەن و بە شان و باڵیاندا هەڵئەدەن لەوانەیە فلمی سینەماییشیان لەسەر دەرکەن.

باوکم خەڵکی زاخۆیە ناوی صالح فەتاحە لەعەشرەتی (قوچە بەگییە). قوچە بەگی لەعەشرەتی هەرە کۆنەکانی کوردن. بەڕەگەزیش لەکوردستانی تورکیاوە هاتوون.

باوکم پیاوێکی لێهاتوو و دەست و دڵ باز و میهرەبان بوو. ئەگەرچی من ئەوەندە لەگەڵی نەژیاوم بەڵام ئەوەی لەدایکم و کەس و کارم باسی کۆنیم بیستووە و بۆیان باس کردوم من نەنکم بە خێوی کردوم لەگەڵ ا لەکا و نازداری سەر ںوڵی ئەوان بووم‌خاوەکو زۆرجا ارخ زم . خۆشی و ت کەسوکار و ئاشنا لەژێرەوە باسی خۆشەویستی و پەرۆشی نەنکمیان ئەکرد بەرامبەر بە من و کە هەندێکیان بەیەك ئەگەیشتن ئەو باسەیان ئەکرد و ئەیانگوت : دایکم ئامینە شەش جار نوێژ ئەکات پێنجی بۆ خواو یەکێکیشی بۆ کچەزاکەی. دیاربوو ئەوەش لەبەخالەتا وایان ئەگوت.

ە بەرئەوە کە ئیلا تە من نەوەم هەیە زۆرچ لك ئەزا کە نەنکم چەندی خۆش ویستوم کە ئاشناو کەس وایان پیٚ گوتوە. چونکە منیش ئێستە هەروەك ئەوم ئاوهام بەتایبەتی بەرامبەر نەوەی یەکەمم کەوەك نۆبەرە وایە رۆحم بە تاڵێکی مووی سەرسەریەوە بەندە ئەوەندەم خۆش ئەوێت.

موسڵم خۆش ئەوێت چونکە لەویٚ لەدایك بوم و ناوم ساجدە بوو کە گوایە شەوی (لیلەالمحیا ) اتومەتە دنیاوە نازا لیلەالمحیا بە کوردی کام شەوەیە. هەروەها خالەمحمدم کە لەگەڵ هێزی سوپاکەی ئەوکاتە لەسلێمانی و دەوروبەری بونە کە شەڕی بەردەرکی سەرا بووە بروسکەیان بۆ کردوە کە سەلیمەی خوشکی کچی بوەو ناویان ناوە ساجدە زۆری پیٚ خۆش ئەبێت بەڵام جوابیان بۆ ئەنێرێت ئەڵێت ساجدە بکەن بە ژیان. بەڵام هەر بە تێکەڵ و پێکەڵی بانگم ئەکەن و زۆر کەس ئەڵێن ساجدەو هی کەش ئەڵێن ژیان چونکە ئەوانەی لەسەر دەستیان هاتومەتە دونیاوە موسڵاوی

بون و دوو خوشك بوون ناویان حجیە بەیبونە و حجیە خدیجە بوەو ئەوان چوونە منیان بەو ناوەوە تسجیل کردووە.

دایکم سلیمە عەبدوڵڵا خۆی بەمناڵی ئەیدەن بەشو بە باوکم باوکم ژنی تری ئەبێت کچی مامی خۆی خاتونی ناو بوو چەند مناڵ و کوڕو کچی هەبوو بگرە کچەکەی وەکو دایکم ئەبوو.

بەڵام باوکم شەیدای دایکم بوبو بەقسەی کەسی نەکردبوو وەکو ئەڵێن گوتبوی سەری لەسەر دائەنێت و ئەکەوێتە بەرتیل و بەرتیل کاری بۆ خزم و کەسی خۆیی و هانا ئەباتەبەر پیاو ماقوڵ بچن ڕازییان کەن تاوەکو دایکمی بدەنیٚ.

مامۆی پوری لێیان توڕە ئەبێت و ئەڵێت بابەگیان ئەوە مناڵەو هێشتا نەبوە بە چواردە ساڵ من گوناحم ئەگات چۆن ئەو غەدرە ئەکەم : بەڵام هەر دەست بەردار نابێت ئاخری دایکمی ئەدەنیٚ دیارە فەرقی عمریان زۆر ئەبێت لەگەڵ ئەوەشا کە باوکم پیاوێکی لێهاتو و قۆزبو و هیچ تەمەنی پێوە دیار نەبو و خ الەکا زۆریان خۆش ئەویست بۆیە هەمووجارێك کە دایکم توشی نارەحەتی و توڕە ئەبو ئەیگوت : بەخوا ئەم پیاوە نوشتەو ج ادوگەی لە بر کا و نەنکم کردووە چونکە نەنە حەلیمەش دایکی نەنکم ەگەڵ خ الەکا زۆریان خۆشەویست و حەزیان ئەکرد کە دایکمی بدەنیٚ ل لەدوای کەشمەکەشێکی زۆر دایکمیان دابویێ. دایکم مناڵەنۆبەرەکەی مردبوو دوای بەینێك منی ئەبێت و دوای سیٚ ساڵ ڕێسانی خوشکم لەبەرئەوە دایکم چەند ڕۆژێك لەماڵی خۆی ئەبو و چەند ڕۆژێك بە تۆراوی لەماڵی باوکی و ڕیٚ نەئەکەوت لەگەڵ باوکم.

کە خاڵە هەمزەم توشی ئەو گرتن و چاودێری حکومەتە بوو چەند جارگیرا ئیتر حکومەت گڕی خستە ژێر خالەمحمدیشم و کەوتنە بیانو گرتن لەوێش بیرم دێت خالەمحمدم بەو لاوی و تازە دەرچونەی دەستیان

لەکاری ئەفسەری کێشا و ناردیانەوە ماڵی خۆی بە بیانوی پشتگیری کردنی لە(کودتایەك)کە درۆبوو ئەصلی نەبوو بە هیچ جۆرێك خاڵمی تیا نەبوو. کەلەو بەینە گوایە کۆمەڵێ لەسوپا و ویستبویان کۆمەڵێکی تر بگرن و دەسەڵات بگرنە دەست خۆیان ئێمە لەزاخۆ بوین ئەوکاتە خاڵە هەمزەشم گیرابوو خالەمحمدیشم هاتەوە دەستی لەکارکێشراو و بەو مناڵیە و هەستم ئەکرد کە چەند حاڵی دایکم و نەنکم و مامۆو نەنە و هەموو خزمەکانمان ناخۆشە و هەر ئەگرین لەبەر خاڵە هەمزە هەرچەندە خالەمحمدیشم وایان بەسەر هێنابوو بەڵام هەر باشتر بوو بەس نەبو نەگیرابوو لەزیندانا نەبوو ماڵمان پڕبو لەخزم و کەس و کار و ئاشنا هەموو نارەحەت و غەمگین. باوکم لەلامان بوو چونکە لەبەر خاڵم دڵی نەئەهات بەو حالەبەجێی بهێڵێت هەروەها شەوان ئەچوەوە ماڵی خۆی. دایکم لای ئێمە بوو لەگەڵ ڕێسانی خوشکم کە مناڵ بوو. بیرم دێت زۆرجار کە ماڵەکە هەندێ چۆڵ ئەبوو میوان سوك ئەبون خالەمحمدم بانگی ئەکردینە لای خۆی یا ئەهات بۆ ژووری نەنکم و ژووری دانیشتن بانگی منی ئەکرد و ئەیخستمە سەر باوەشی و بەڕێسانی ئەگوت دەی تۆ بڕۆ شتەکانت کۆکەرەوە و بڕۆرەوە بۆ ماڵی خۆتان چونکە ئەو تێکڕا ئەچوەوە ماڵی باوکم ڕێسانیش سێ چوار ساڵێك بوو پریاسکەیێکیان بۆ بەستبوو گوایە شتەکانی تیایە ئەچو پریاسکەکەی ئەدا بەکۆڵیا و ئەیگوت وا ئەڕۆم بەڵام شەوە ناوێرم ئیتر خاڵم زۆرپێی پێئەکەنی بەخۆی و پریاسکەکەی دوایی پەلاماری ئەداو ماچی ئەکرد و ئەیگرتە باوەشی و ئەیگوت نەنە مەڕۆرەوە قەیناکە ئەهێڵین لێرە بیت خاڵم زۆر بە خۆی و پریاسکەکەی پێ ئەکەنی و ڕێسان زۆر قسەی خۆشی ئەکرد و خرپنێکی قەڵەو بوو هەروەها باوکیشمی زۆر خۆشەویست و ئەگریا بە دوایا کە ئەڕۆیشتەوە ماڵی خۆی. بۆیە خاڵم وای پێ ئەگوت.



لەو زروف و وەزعە نالەبارەدا بوین کە ئەو ئێوارەیە ماڵی حازم بەگ شمزین ئاغا هاتبوون بۆ ماڵی ئێمە حازم بەگ ژنەکەی ناوی (سەنیە خان) بو دایکی خەڵکی موسڵ بوو و باوکی کورد بوو سەنیە خان خوشکی سامی فتاح بوو کەلەزەمانی مەلیك دا بوو. کچەکەشی هاو عمری من بوو ناوی (هەدار)وو بەلا م و ابزا   هەندێ لەمن گەورەتر بوو وەکو دایکم ئەڵێت هەرچۆنێك بێت عمرمان حەوت ساڵان بوو چونکە من تازە ناویان نووسی بووم بۆ مەکتەب بەڵام هەدار لەمەکتەب بوو لەسنفی یەك بوو. ئەو ئێوارەیە ئیتر لەگەڵ هەدار لەحەوشەکە ڕامان ئەکرد و یاریمان ئەکرد کەلەپڕ زریکاندی و گوتی وای (شوکریە مان ) بۆهات. منیش قیڕاندم و ڕام کرد شوکریەی بەسەزمان ئەیانگوت کە پێش ئێمە لەم خانوەی ئێمەدا بوون باوکی مودیر المال بوو چەند کچێکی هەبوو یەکێکیان نەخۆش کەوتبوو مردبوو لەو خانوەدا دوایی ڕۆیشتبون خانوەکە خۆش و تازە بوو لەسەر جادەبوو جۆگە ئاوێکی زۆر گەورە کەلەچەمی خاپور جیا ئەبوەوە بەبەردەمیا تێ ئەپەڕی بەرامبەریشمان هەمووی ڕەزو باخی زۆر جوان بوون سەروترمان ماڵی حاجی ئاغای گێرە شێوێن بو خوارتریشمان ماڵی قائیمقام و دکتۆر بوو. بۆیە بەپەلەهاتبوینە ئەوێ چونکە خانوی خۆمان کە لەلای گەرەکی گاوران بوو لەسەر بەرزاییێکی زۆر خۆش بوو کە ئەیڕوانیە سرچەمە زلەکەی خاپور ڕێگایێکی باریکی لەبەردەم بوو نازا  
چۆن خەڵك ئەیان وێرا بەوێدا هاتو چۆ بکەن زۆر ترسی هەبوو من بەباشی بیرم دێت و لەوێ دابو کە هاتن خاڵە هەمزەمیان گرت و من ئەم قیڕاند و ئەمگوت نابێ بیبەن ئینجا ئەو خانووە خۆشەمان کەوتەبەر جادە وکردیان بەشەقام کە ئوتۆمبیلی پیادا تێ ئەپەڕێت بۆ ناو زاخۆ ( گوندك ).

بەڵام من هەر ئەوەندەم لەبیرە کە چوبوینە ئەو خانوەی ترەوە کە شوکریەی تیا مردبوو. ئینجا هەدار بۆ وای گوتبوو چونکە ئێوارەبوو

ژورێکی پڕدارمان بۆ بەکارهاتنی زستان هەبوو دەرگای کرابوەوە یەکیٚ لەحەمام یاخود سەرشۆرك زاخۆ و بادینان سەرشۆرکیان هەبوو حەزیان لەحەمامی گەرم نەبوو بیرم دیتێ لەشوێنێك دایکم و ابزا موسلٚ بوو برا بو بۆ حەمامی گەرم کەچی بورابوەوە.

بێینە سەرباسی ژوری دار یەکیٚ سەری شتبو لفکەکەی بەچڵیٚ لەو دارەوە هەڵواسیبوو تاوەکو وشك بێتەوە. جگە لەخەڵکی شارستانی دێهاتی و کۆچەریش زۆر ئەهات بۆ لامان. بۆیە (هەدار) ویستی فێڵم لیٚ بکات چونکە شەیتان و زۆرزان بوو وا قیژاندی و ئیشارەتی لیفکەکەی بۆ کردم و گوتی شوکریەمان بۆ هات منیش قیڕاندم ڕام کردە ژوریٚ لای میوانەکان و نەنکم و دایکم و ئەوان هەموو ڕاپەڕین و گوتیان چیە چونکە زۆرتێك چوبوم گوتم هەدار گوتی شوکریەمان بۆهات. سەنیە خانی دایکی بانگی کردوو توڕەبو و هەرچەندە دڵیان دامەوە و نەنکم خستمیە باوەشیەوە و خەریکم بوو بەڵام فایدەی نەبوو هەر ئەو شەوە تام لیٚهات ستیر نازا لەبەر ئەو تر ە بوو یلخودچی تر بووچونکەشەو تام لی ٚهات ئ ئیتر ئەو سەرەی دام نا و توشی تیفۆئید بووم بۆ چل شەو و چل ڕۆژ بیٚ هۆش بووم دکتۆرێکی سووری دراوسێمان بوو دوو سیٚ کچی جوانکەلەی هەبو و ناوی دکتۆر فەرید بوو ئەو دکتۆرە رۆژی دووجار ئەهات بۆلام دیارە وەکو دایکم و ئەوان ئەیانگوت. سەیری ئەکردم و شتی پیٚ ویستی بۆ ئەکردم و لەگەڵ خالەمحەمدم قسەیان ئەکرد دوایی ئەچووەوە ماڵی خۆی. نزیکی چل ڕۆژ دکتۆر بە دزی دایکم و نەنکم و ئەوانەوە بە خاڵمی گوتبو کە لەم چەند سەعاتەی ئیمڕۆ سبەینیٚ یا دێتەوە هۆش یا ئەمرێت دکتۆرەکە زۆر دڵی لەلام بوو چونکە دراوسێمان بوو لەگەل کچەکانی پێکەوە زۆرجار ئەیبینیم کە یاریمان ئەکرد.

کە دکتۆر فەرید وای بە خاڵم گوتبو کەلەم چەند سەعاتەدا یا بەهۆشی دێنم یا تەواو ئیتر ئەمرێت. خاڵم ئەکەوێتە مەراقێکی زۆرەوە بیٚ ئەوەی کەس بزانێت لەخۆی و دکتۆر زیاتر ئەو شەوە خاڵم ئارامی لیٚ هەڵەگیرێت و لەژورەکەی خۆی هەر پیاسە ئەکات و جارجار ئەچێتە ناو جێگاکەیەوە دێتەوە دەریٚ ئیتر ماندو ئەبێت خۆشی نازانێت کە چۆن چاوی ئەچێتە خەو.

شێ هەر لەعەینی حا لدا ئە و لەدەوری جێگاکەم نەنکم و دایکم و مامۆ و نەنە کە دایکی نەنکمە بە دانیشتنەوە هەندیٚ بەپاڵ کەوتنەوە ئێشك ئەگرن و بە دیارمەوە ئەبن کە بەهۆش دێم ئێستەش لەبیرمە هەروەك ەناو بیر یکی قو دا بو دەمم جولاندەوە و بە دەنگێلکی زۆر بیٚ تینەوە و ئەسپایی و پچڕ پچڕ گوتم : (ئودا ئاڤیٚ)بە بادینی. مامۆ پورە هەڵکەوتوەکەی دایکم کە گوێی لەم دەنگە ئەبێت و ئەحەپەسێت و لەدڵی خۆیدا ئەڵێت : تۆ بڵێیت خەوم دیبیٚ کەچی جارێکی تریش وا بانگ ئەکەم ئیترمامۆ پەلاماری هەمویان ئەدات و ئەڵێت کچیٚ هەستن (ساجدە) داوای ئاو ئەکات.

نەنە ڕائەپەڕێت و ڕائەکاتە دەریٚ ویەکسەر بۆ سەر ژوری خالەمحەمدم. دونیا سارد و زستان کاتیش نزیکی سەعات چواری بەرەبەیان ئەبێت نەنە لەدەرگای خاڵم ئەدات بەپەلەو بانگ ئەکات محمد محمد هەستە. خاڵم ەقیرە ڕائەپەرێ بە شلەژاوی و لەدلی خۆیدا ئەلێ ئەی وا (چاچان)مرد خاڵم بەو ناوە بانگی ئەکردم. تا ئەگاتە لای دەرگا نەنە لەو دیوەوە ئەقیڕێنیٚ ئەڵێت محمد ساجدە قسەی کرد و داوای ئاوی کرد ئیتر خاڵم ئەقیڕێنیٚ بەسەریاو توڕە ئەبێت ئەڵێت خوا بت گریٚ منت ترساند وەم زانی شتێکی لیٚ هات. ئیتر هەموو زۆر دڵیان خۆش ئەبێت و ئەیکەن بەهەرا. بیرم دێت وەك ەیکەلی ئیسٚ قا لیٚ هاتبوو بەینێکی زۆر قاچم نەبوو

دایکم یا نەنە ئەیانگرتمە کۆڵ و ئەیان بردمە حەوشەکە ئەگەر ڕۆژەکە هەتاو خۆش بوایە.

پرچم هەمووی وەری بەسەرینەکانەوە سەرم روت روت بوو بەڵام وردە وردە لەبنەوە دەرچووەوە نەنکم و دایکم و ئەوان ئەترسان ئەو پرچە پڕ خورماییە جوانە ئیتر نەیەتەوە و ئەگەر هاتیشەوە بەکەمی و تەنکی بێت بەڵام بەپێچەوانەوە ئەوەندە چڕو پڕو هات کە بەڕاستی ئەو پرچە هەمیشە تەگەرەی بۆ دروست ئەکردم.

هێشتا پرچم بەحاڵ دەرچووبوو هەروەکو پرچ و سەری تازە تاشراوی کوڕ وابو خەبەر هات کە خالەمحمدم گەڕایەوە شوێنەکەی و نەجمە و ئەستێرەکەی درایەوە بەڵام نەوەکو جاران لەمعسکر و فرقە و ئەو شوێنانەی کە لێی بو کرا بەزابت تجنید و فڕێیان دایە قەزای عفك سەر بە دیوانیە یا راستر صحرای عفك چونکە عفك لایێکی صحرا بوو لایێکی نزیك چەمەکە و سەوزەو خورماو ڕەزو باخ بوون زۆر شوێنێکی سەرسوڕمانکەر بوو.

نەنکم و خێزانەکەمان کەوتنە خۆ کۆکردنەوە کە بچن بۆ عفك. هەروەها بەبێ دەنگی ئەو خەبەرەشمان بۆ هات کە خاڵە هەمزەم توانیویەتی خۆی بگەیەنەتە کەرکوك بۆ لای جەنابی سەید ئەحمدی خانقاە کاتێ کە بەریان دابوو. ئەویش بە دڵ و پیاوانە گرتویەتە خۆی و شاردویەتەوە لەخانەقاە دوایش ناردویەتی بۆ دێهاتەکانی خۆی. جاران کە یەکێ ئەچوو بۆ سەفەر و شارێکی تر هەروەك بچوایە بۆ ئاخری دونیا و ئیتر تەواو. بیرمە ماڵی ئێمە شتی ناوماڵیان هی زیادە هەموویان دابەش کرد بەسەر خەڵك و ئاشنادا تاوەکو تاقمی قەنەفەی ژووری میوان درا بە حاجی ئاغا چونکە بەناو هاوڕێ و ڕەفیقی خالەمحمدم بوو. کەوتنە ناو مس و مەنجەڵی مس و مەنجەڵی گەورەی ساوەر کولاندن هەموویان فرۆشت سەتڵ و جامێکی



مسی جوان پیالەو بەر سەماوەر ئەوەیان لەگەڵ خۆیان برد بۆ زانین نەنکم زۆرحەزی لەسەماوەر و پیالەو شتی بەرسەماوەر بوو تاوەکو ماڵمان هەبوو لەخوارووی عێراق و ئێمەش گەورەبوین تاوەکو ١٩٧٤ یش ئەو شتانە هەر مابوون لەبەر نەنکم زۆر خۆشەویست بوون لەلام بەڵام کە لەو بەین و سالەچوین بۆ شاخ و دیسان زروفی کورد و حکومەت تێکچو و ماڵەکەمان بەجێ هێشت لەبەغدا ئەو جام و سەتڵە لە ماڵەکەدا بەجێ مان.

خزم و دراوسێ و ئاشنا ئەتگوت ئەچین بۆ جزیرەی واق واق ئەوەندە کردبویان بەگریان و هەرا لەگەڵ ماڵی ئێمە. کەچی ئێستە لەم کات و زەمانە خەڵك بە چەند سەعاتێك ئەچێت بۆ ئەمریکا و ئەشگەڕێتەوە.

هەرچۆنێك بوو لەموسڵ لەماڵی پورم بوین خوشکی دایکم کە شوی کردبوو بە پورزاکەی و لەوێ ئەژیان و مێردەکەی لەوێ ئیشی ئەکرد و منالی هەبوو حسێن کە بێجگە لەپورزا براشمە چونکە هەردووکمان شیری ژنێکمان خواردووە ناوی خەمێ بوو ئەویش لەئاشناو هاوولاتی ماڵی نەنکم بوو. بێجگە لەحسێن دوو کچیشی هەبوو خەدیجە و صبیحە هەمووی ناوی موسلاوین. نەنکم سەرەتای نەخۆشی بوولەخەفەتی خاڵە هەمزەم هەر ئەگریا و زۆر خەفەتی بۆ ئەخوارد و دڵی لەلابوو. هەروەها ئەو نەخۆشیە قورسەی منیش چل ڕۆژ بەبێ هۆشی ئەویش زۆر کاری تێ کردبوو ئیتر نەخۆش کەوت جگە لەوەش مامۆش هەندێ نەخۆش کەوت چاوی خەریك بوو کز ئەبوو لەبەرئەوە مامۆ بەجێ ما لەماڵی پورە فاتمە کە مێردەکەشی مەلا سمایل خوشکە زای مامۆ بوو.

مامۆ بۆیە مایەوە لەوێ لەبەر چوونە سەردکتۆر بۆ چارەسەری چاوەکانی چونکە موسڵ زۆر پێشکەوتو گەورە بوو چەندەها جۆر دکتۆری گەورەی باشی بە ناوبانگی تیابو جگە لەوەکە هەموو شارەزای موسڵ بوون لەبەر ئەوەی بەشی هەرە زۆری کات ماڵمان لەموسڵ بوو.

یرم نیه بچی گەیشتینه بەغدا و ابزا بەشەمەنەفەر لەبەغداش بۆ دیوانیە بەشەمەنەفەر و لەدیوانیەش بە ئوتومبیل بۆ عفك.

خاڵم و پورزاێکی زوتر چووبون و ماڵ و خانویان بۆ ئامادە کردبوین و هاتبون بەپیرمانەوە لەبەغداو دیوانیە.

عفك قەزاێکی بچوك بوو خەڵکەکەی هەموو شیعە بوون و زۆر ئینسانی باش بوون و زۆر ئێمەیان خۆشەویست بە تایبەتی کە زانیان کوردین و حکومەت ناحەزە بەرامبەرمان و هەروەك جەزا و هەق لێ کردنەوە خاڵمیان ناردووە بۆ ئەوێ بۆیە هەموو بە دەوری خاڵما هاتن تاوەکو کابرای خاوەن ڕیزە خانوی تازە کە بۆ مأمورەکان دروست کرابون کە ئەویش دکتۆر. و معاونی شرطە و ئێمەی تێدا بوین و لەسەروی شارەوە دروست کرابون لەبەرامبەر چەمەکە و ئەوبەر چەمەکەشی نادی مأمورەکان بوو پشتی کۆنەکان خانی گە و جۆو ئەو شتانەی خاوەن خانوەکان بووخابرا. کەناوی (صلف )بو خانەکەشی پێیان ئەگوت (سیف) و هەمیشە پڕ بو لەحوشتر و بەحوشتر کارەکانیان ئەکرد ئێمەش و منالی ئەوناوە دائم بە دیار حوشترەوە بوین لەبەرئەوەی حسابی جیایان بۆ ئێمە ئەکرد صلف لەتەنیشت ئەو سێ خانوە خانوێکی گەورەی خۆشی بۆ دروست کردین. لەسەر داخوازی ئێمەش ژور و ئەوشتانەی دروست کردو سەربانێکی زۆر خۆشی لەدوسێ لاوە باڵقۆنی گەورەو خۆشی لێ دروست کرد. سەروماڵەکەشمان ئیتربە باخی خورما دەستی پێ ئەکرد.

ماڵی قایمقام و مأموری تر و خەستەخانە لەوبەری ئاوەکەو مەدحەت تپیگردنی شارەکە بوو و ابزا هەر ساڵێك بوو لەوێ بوین کە نەنکە خۆشەویستەکەم ئەمری خوای کرد لەحەسرەت و داخی خاڵە هەمزەم ئەوەندە زو ئەمری خوای کرد کە هێشتا لەخانوە کۆنەکە دابوین و خانوە تازەکە تەواو نەبوبو بە مردنی نەنکم زۆر دڵتەنگ و چاو بەفرمێسك بووین



بەتایبەتی من چونکە ئەو بەخێوی کردبووم پەیوەندیمان لەگەڵ یەك بێ وێنەبوو هەر بانگی ئەوم ئەکرد ( ئۆدا ) ئەو شەوەی ئەمری خوای کرد دەسڕ و نەقش و دەزوی سەوزو سوری من لەژێر سەرینەکەیابو بەو منالیە کە فێری ئەکردم خۆی زۆر هونەرمەند بوو لەچنینی دانتێل و (ئۆیە)و سەرمێز و ئەو شتانە. خوێندەوار بوو کە ئەهاتمەوە لەمەکتەب دایئەنام لای خۆی فێری خوێندن و دەرسی ئەکردم.زۆر دیمەنی سەیربوو دایکم نەخوێندەوار دایکی خوێندەوار. نەنکم زۆر جوان و هەڵکەوتو بوو. بە تایبەتی کەلەخەفەتی خاڵە هەمزەشم و بە حەسرەت بینینی ئەو مرد. ئیتر ئازاری مردنەکەی ئەوەنەی تری چوە سەر. بە مردنی نەنکم زۆر پەشۆکاین بەڵام خەڵکی عفکی پیاو و مەرد شەو و ڕۆژ بە دیارمانەوە بوون خزمەتیان ئەکردین لەبیرمە هەمیشە دوو قۆری گوڵی بەیبون و ئەو جۆرە شتانەیان لەسەر ئاگربوو ئەیانکوڵاند و بە زۆر ئەیاندا بە دایکم و نەنە و ئێمەش کە بیخۆینەوە تاوەکو هەندێ بێینەوە سەر خۆمان هەر ئاگامان لەنان خواردن و چێشت نەبوو هەمووی ئەوان بە لێشاو ئەیانهێناو ئەیاندا بە خەڵك دوایش ماڵەکەیان بۆ ئەکردین بە گوڵ. بەڕاستی قەت ئەو خەڵکە باشەمان لەبیر ناچنەوە.

چەند ڕۆژێك بەسەر مردنی نەنکما تێ پەڕی کە مامۆ لەموسڵەوە گەیشتە لامان زۆر بەبێ حاڵی و شپرزەیی لەتاو نەنکم هەروەها نەنکیشم زۆرجار کەئەچووم بەسەرا چاوی خۆی ئەسریەوە لەبەر گریان. من نارەحەت ئەبووم بۆی و پەلامارم ئەدا ئەم گوت : چیە (ئۆدا)دیسان بۆ ئەلم ئەگری ؟ ئەیگوت وا زۆر بیری خریەما(مەکەم بە مامۆی ئەگوت ) (مریەما)یەعنی مریەم. بەڵام بە داخەوە ئەویشی نەدیەوە مامۆ سندوقێکی هەبوو لەدار دروست کرابو قفڵ و کلیلیشی پێوەبوو هەموو شتە خۆشەویست و نازدارەکانی لەو سندوقەدا بوو سندوقەکە گەورەبو و بەقەد

جانتایەکی سەفەری ناوەندی بوو. ڕێگای بەینی دیوانیە و عفك زۆر بیابان بو و لەبەرئەوەی شەمەنەفەر ئێواران ئەگەیشتنە دیوانیە لەبەغداوە. بۆیە شەو بەڕێوە ئەبوو ئەوکەسەی ئەهات بۆ عفك مامۆش کەچوبون بەپیریەوە پورزاکەی دایکم صالحی ناوبوو براێکی زۆر دڵسۆزی کەم وێنەبوو بۆ ئێمە و هەر لەمناڵیەوە و لەمەکتەب هاتە دەرێ و مەکتەبی تەواو نەکرد لەبەر خاڵم و ئێمە و بەدیارمانەوە بو لەعفك و دیوانیە و ئەو ناوانە بۆیە مامۆ صالحی لەگەڵ بوو کە ئەهاتن بەرەو عفك بە ئوتومبیل.کابرایەك ناوی (فلەییح)بو ئوتومبیلێکی تازەی کڕیبوو. ئوتومبیلچی بوو دووسێ ئوتومبیلی تریشی هەبوو خەڵکی لەسەر بوو وەکو تاکسی ئیشی پێ ئەکردن بەڵام ئوتومبیلەتازەکەی مأمورەکان هاتوچۆیان پێ ئەکرد بۆ دیوانیە و شارانی تر بەکرێ ئینجا زۆرتری (فلەییح) وەك ئوتومبیلچی خالەمحمدی لێهاتبوو چونکە خالەمحمدم ڕۆژانی جمعان ئەچوبۆ ڕاوە ئاسك لەوێ ئاسك زۆر بوون ئینجا کە ئەچو بە ئوتومبیلی (فلەییح) ئەچوو هەروەها دووسێ هاوڕێی لەدیوانیەشەوە ئەهاتن بۆلای و پێکەوە ئەچوون بیرم دێت ڕەفیقێکی موهندسی هەبوو دوو سێ کچیشی هەبوو حاڵیشی باش بوو چونکە ئوتومبیلی هەبو و خۆی لێی ئەخوڕی هەرچەندە زۆر قەڵەویش بوو لەگەڵ ئەو مالەمهندیسە زۆر هاتوچۆی یەکتریمان ئەکرد ماڵی ئەوان ئەهاتن بۆ لامان بۆ عفك ئێمەش ئەچوینە لای ئەوان بۆ دیوانیە بۆجل و شت کڕین.مامۆ کە ئەو شەوە کەوتبوە ڕێ بە ئوتومبیلی (فلەییح)دیارە شتی زۆر پێ بوو بۆمان وەکو پەنیری کوردستان و ساوەرو زەخیرە جاران جێگای بەستنی کەل و پەل هەبوو لەسەر پشتی ئوتومبیل و سەر سندوقی پشتیش بۆیە وا دیارە ئەو سندوقە جوانە دارەی مامۆ لەو شوێنانە بەسترابوو بۆچی لەڕێگا لەئوتومبیل بەرنابێت و ناکەوێتە خوارەوەی بێ ئەوەی ئاگایان لێ بێت.کە ئەگەنە ماڵەوە و کەل و پەل دا



ئەگرن سندوقی دارنیە. مامۆ ئەگەرچی تا بەینێك لەتاو ئێمەو نەنکم و گریان و بەزم کەس هۆشی نەبوو بڵێت کوا سندوقە بۆرین ئاخری کەچون بەلای شتەکانەوە مامۆ گوتی کوا سندوقەکەم. ئیتر کردی بەهەرا لەصالح و لەئوتومبیل چی و بەوشەوە خاڵم گوتی ئێستە ئەبێ بچنەوە بۆی بێنن و بیدۆزنەوە. چونکە خاڵم ئەیزانی مامۆ چی لێ دێت لەبەر کەل و پەلی ناو ئەو سندوقەی کە زۆری شتی کۆن و ڕەسم و وێنەوی کۆن و قورأن و تەسبیحی زۆر نایاب و کۆنی چەند سالەبوون. ئاخری بوبە ڕۆژو چونەوە بەو ڕێگایەدا سندوق دۆزایەوە بەربوبوەوە و کەوتبو لەئوتومبیلەکە و لاێکی عەزیەتی گەیشتبوو شکابوو کەل وپەلی مامۆ بەوناوەدا لەناو ئەوخۆڵ و زیخی بیابانا بڵاوببونەوە هەموویان دۆزرانەوە چونکە هێشتا هیچ ئوتومبیلێك بەوێدا تێ نەپەڕیبوو. بەڵام تەسبیحە نازدارەکەی مامۆ پچڕابو و دەنك دەنك دۆزیبویانەوە و چەند دەنکێکیشی نەدۆزابوەوە بۆیان. داخی ئەو تەسبیحە لەدڵی من دایە تاوەکو مردن من هەر ئاخی بۆ هەڵەکێشم تەسبیحەکە دار بوو دارێکی وا نایاب بوو ئەتگوت لەشوشە دروست کراوە کە مامۆ لەناولەپیا هەڵیەگلۆفی یەك بۆنی مسك و عەنبەری لێ بڵاوئەبوەوە لەداری عود دروست کرابو و لەزۆر مناڵیەوە ئاشناییم هەبوو لەگەڵ ئەو تەسبیحە جوانەی کە تێکڕا و هەمیشە بە دەست مامۆوە بوو لەدواییا کە گەورەبووم و بوم بەسیانزە چواردە ساڵ مامۆ پێی ئەگوتم ئەم قورأنە خۆشەویستەم و ئەم تەسبیحە نازدارەم ئەدەم بە تۆ کە گەورەبوی و من مردم چونکە زۆر بڕوام بە تۆیە و تۆ زۆر پاك و تەمیز و ئێمنی دلنیا ئە□□ کە تۆ ئاگات لێیان ئەبێت و ئەیانپارێزی هێر پێهێ .
مردنی دایمێ مامۆم خۆش ئەویست و بەشەخصێکی زۆر مەعروفی ئەفسانەیی ئەهاتە بەرچاوم زۆر بۆی گریام. ئێستەش قورأنەکەی هەر لەلامە و زۆر بەنازداری ئاگام لێیەتی کە چاوم پێ ئەکەوێت دڵنیایی و

خۆشیەکی زۆر ئەچێتە دڵمەوە بەڵام دڵخی گرا تەسبیحەکە تاوەکو ١٩٥٦
لەلام بوو شتێکی خۆشەویست و هەرە گران و بەبەهای من بوو. لەکەرکوك بوین شوم کرد بوو خاوەن ماڵ و مناڵ بووم. ئەمجارە لەبەر باوکی هێرۆی خۆشەویستم حکومەت دەوری دابوین و زو زو ئەهاتنە سەرمان بۆ ماڵ پشکنین بۆ گرتن و زیندانی. لەو کاتەدا کە دیسان حکومەتی بەدناوی دوابڕاوی ئەوکاتە هاتبونە ماڵەکەمان ئەگەڕان و باوکی هێرۆ گیرابوو سەماوەرەکەی نەنکم کە ئەویش یادگارییێکی عەزیز بوو لەسەر دڵم لەتاقی ژورەکەم بوو منیش تەسبیحەکەم هەڵگرت لەپەلەپەل و شپرزەییا خستمە ناو سەماوەرەکەوە چونکە زۆرجار کاغەزو شتی قەدەغەشمان بەپەلەفڕێ ئەدایە ناوی دیارە کاغەزێ شتێکم بەدەستەوەبوو ئەوکاتە چونکە ئەوجۆرە کاغەزانەمان فڕێ ئەدایە ئەو شوێنانەی وەکو مەنجەڵ و سەماوەر و ئەوشتانەوە ئیتر ئەوەبوو تەسبیحم خستە ناوی و لەشڵەژان و نارەحەتی و بەزمی ماڵ پشکنین و ئیتر بیرم چو کەزو دەریبێنمەوە چونکە دائم لەژێر سەرم بوو لەنزیکم بوو.

دوای دوو سێ ڕۆژ من ئەچم بۆ سەفەر یاچی ئەبێت بەباشی بیرم نیە بەڵام ئەوەم لەبیرە و تامردن لەدڵم دەرنایێت کە دایکم چووبوو سەماوەرەکەی دابوو بە ماڵی خاڵە هەمزەم بێ ئەوەی بزانێت تەسبیحەکەمی تێدایە و یا سەیرێکی بکات بۆیە تەسبیحەکەم ڕۆیشت و چو و نەمزانی چی لێهات و کێ بردی دوایی زانیم ئەویش دوای چەندەها ساڵ لەدوای چەند جار دەربەدەری و گەڕانەوە و ماڵ دانان و بەجێ هێشتن و ڕاکردن لەدەست حکومەت کە دابویان بە پیاوێکی خزممان لەزاخۆ و هەرنەشی زانیبوو کەئەوە چیە و کەچەند بە نرخ و خۆشەویستە لەلام. ئێستەش لەدوای ئەو هەموو ساڵانە کەدێتە بیرم بۆی ئەگریم.



بەهاتنی مامۆ بۆ لامان بۆ عفك هەندێ دڵمان کرایەوە و ئارام بوینەوە. مامۆ قسەی گەلێ خۆش بوو گەلێ قسەی نەستەقی هەبوو ئەیزانی و ئینسان کەلەلای دائەنیشت چەند دڵتەنگ بوایە. دڵی ئەکرایەوە و گورج وورەی بەرزئەبوەوە و ئەگۆڕاو بڕوای بەخۆی ئەکرد. مامۆ زۆر گاڵتەچی بوو خەڵکی ئەهێنایە پێ کەنین. لەدوای نەمانی نەنکم و گەڕانەوەی بۆلامان بۆ عفك زۆر پێوەی نوساوم و تێکڕا لەگەڵی ئەبووم و گوێم لەقسە خۆشەکانی ئەگرت و سەرم ئەکردە سەری کە حەکایەت و چیرۆکم بۆ بڵێت. ئێستە زۆری ئەو چیرۆکانەم لەبیرە و هەندێکیان پاڵەوانەکانیان گۆرانی ئەڵێن ئینجا مامۆ گۆرانیەکەی بۆ ئەگوتم دەنگیشی زۆر بەسۆز و خۆش وو تیگڕا دایکم و خاڵەکا دەنگیان زۆر خۆشبوو ئێستەش دایکم کە وارلنی ئەلێ ناتوا خۆم بگرم و ئەگریم گ‌ز مشی و رپێ انی . خوشکیشم چوینەتە سەریان دەنگمان هەندێ خۆشە لەمەکتەب کاتی خۆی لەڕۆژی پێنج شەممە بۆ (تحیە العلم )من سرودەکەم ئەخوێندەوە. زۆرجار بیر لەچیرۆکەکانی مامۆ ئەکەمەوە و ئەڵێم بۆچی بۆ مناڵانی نەنوسم ؟ دیارە چیرۆکەکانی لەجۆرە کۆنەکانی کە فۆلکلۆری کوردی بوون کە چین بۆ چین بەردەوام ئەبێت من خۆم چیرۆکەکانی مامۆم بۆ مناڵەکانی خۆمم ئەگێڕایەوە هەروەها دایکیشم چیرۆکی بۆ ئەگێڕانەوە و گۆرانیەکانیشی بۆ ئەگوتن. هەروەها بۆ نەوەکانیشم ئەو چیرۆکانەم گێڕاوەتەوە.

پێنج شەش ساڵ لەعفك ماینەوە چەندەها قائیمقام و مأمور هاتن و ڕۆیشتن و گوێزرانەوە بەڵام ئێمە هەر لەجێ خۆمان ماینەوە بەبێ گۆڕین و گواستنەوە بۆ شارێکی تر بە جۆرێك کە زۆر زۆر بێزار بوبوین چونکە عفك قزایەکی بچوکی دواکەوتوبو لەهەموو ڕابواردن و خۆشیێك و چونە سینەماو گەڕانێك ئەبو شەو و ڕۆژ ئاگامان لەتەقەو یەکتر کوشتنی خەڵکی

ئەوێ بوایە کە جاری وا هەبو لەسەر بستێ ئەرز یا کامیان زیاتر ئاوەکەی بەرداوەتە سەر زەراعەت و ڕەز و باخەکانی ئیتر شەو ئەوە حاڵیان بوو. دوای ئوتومبیلی پۆلیس ئەکەوتە ڕێ و تەرمی کوژراوەکانی ئەهێناو ئەوانەی ڕاشیان کردبوو بەکەلەپچەوە ئەخرانە ئوتومبیلی ترەوە و ئەهێنران بۆ زیندانی ناو سەرا.کە تەرمەکان ئەگەیشتن هەرچی منالەوردکە ۆ ئەبونەوە و ئەچون بۆ سەیری دیارە من و ڕەفیقەکا و خوشکم لەگەڵیان ئیتر دەوری ئەو تەرمە کوژراوەمان ئەدا تاوەکو دکتۆر سەیری ئەکرد و پۆلیس (طبع اصابع)ی ئەگرت جاری واش هەبوو لەکاتێکا تەرمەکان ئەگەیشتن کە (مستوصف)داخرابوو بۆیە تەرمەکان لەبەردەرکی ماڵی دکتۆر دائەبەزێنران و هەروا هەڵیان ئەدانە سەر ئەو ئەرزە. جاری وا هەبوو تاتەرمەکان ئەگەیشتن ئە ئاوسان کەچی بەو حالەو بەو دیمەنە ترسەوە ئێمە کۆ ئەبوینەوە و سەیرمان ئەکردن. جگە لەوەش بەڕۆژیش مردویان ئەهێنایە سەر چەمەکە بۆ شتن. ئەگەر پارەداربوایە لەشوێنێکی تر ئەشۆراو ئەخرایە سندوقی دارەوە و ئەگەر فەقیر بوایە و لەدانیشتوی کوخەکان بوایە کە زۆری عفك هەر کوخ بوون ئەوە ئەهێنرانە سەر چەمەکە ئەشۆران و ئەخرانە ناو پەڕۆی سپی و لەناوحەسیراو لول ئەدران و پارەی بۆ کۆئەکرایەوە و ئەبرا بۆ نەجەف جاری وا هەبوو پێیان ئەگوت (ئامانەت) گوایە بە ئامانەت ئەخرایە قەبرێکەوە دوایی کەپارەیان بۆ کۆئەکردەوە ئەبرانە نەجف لەگەڵ ئەوەشاکە نەجف ئەوەندە دورنەبوو کە پارەی زۆری بوێ تایە بەڵام نازا بۆچی وایان ئەکرد بۆیە هەموو ڕاو لردنی عفك بـ سەیری مردو و کوژراو و محرم و لەخۆدان و تەعزیە و خۆکوشتنی محرم بوو کە بەلای ئێمەوە زۆر ترسناك و دڵ تەنگکەر بوو چونکە نەماندیبوو و هەمووی هەر جلی ڕەش بوو تاوەکو مناڵەکانیشی هەر ڕەش و عەبابەسەر بوو بەڵام ئێمە و کچە مأموری تر وەکو خۆمان بوین و کەس هەقی نەبوو



بەسەرمانەوە. جلی مۆدەی کورت و قۆڵ کورت و سەر ڕوت. دیارە منالّ بوین بەڵام تاوەکو مناڵی عمری ئێمەش دە و یانزە ساڵ رۆب یان عەبابەسەر بوون. عەباکانیشیان بەن و خوری بو و هی عادیشیان هەبوو.

عفك ئەلەکتریکی نەبوو ئەوکاتە بەڵام چرا هەڵەواسرا بۆ شەو بە درێژایی چەمەکەی لەبەردەمی ماڵکەمان دارچرا هەبوو هەروەك دار الکتریکی ئێستا ئێواران پیاوێك ئەهات بەتەنەکە نەوتەوە یەکەیەکە شوشەی چراکانی پاك ئەکردەوە و نەوتی تێ ئەکردن و ئەیخستنە سەر دارەکە کە وەکو قوتویەکی شوشە بو سەرەکەی جێ چراکە بوو ئینجا دەرکی قوتوە شوشەکەی دائەخست و ئەچوە ئەویتریان من ئەوکارەم زۆر ۆر لاخۆش بو و چاوەڕێ ئێوارا ئەکرد کە پیاوەکە بێت و لەسەر عەرەبانەیێکی دەستی نەوت و شتەکانی دائەنا پیاوەکە پیرە مێردێکی زۆر بەهیمەت و گورج و گۆڵ بو ڕاوەستام کە ئەگەیشتە نزیك ماڵەکەمان ئەچووم خواردن و شتم بۆ ئەهێنا بۆیە زۆری ئێمە خۆشەویست. تاوەکو ئێستە ئەو دیمەنی چراو فانۆسەکانی ئەو ئێوارانە جوانترین و دڵگیرترین دیمەنن لەلام ئێواران لەسەر ئەوچەمە جاری وا هەبوو بارانیش ئەباری کە زستان ئەبوو. ئەگەر وێنەکێش بومایە زۆرم لەو دیمەن و تابلۆیانەم روست ئەکرد و ئەکێشا بەڵام وێنەکێش دەرنەچووم مناڵەکا هەندێکیان یەکجار وێنەکێشی هونەرمەندن بەتایبەتی هەڵۆ و هاوڕێی کوڕم و شانازی و هێڤی کچم.

ئێستەش ئەگەر لەشوێنێك چرایێکی نەوتی ببینم حەزی لێ ئەکەم و ئەگەر هی فرۆشتن بێت ئەیکڕم. ئێستە جێ مۆمێکی زەردی قورسی کۆنی مۆمم هەیە کە قۆری چای لەسەر دەم ئەدەم لەلندن ئێوارانی زستان کە دونیا هەورو تاریکە مۆمەکەمی تیا دائەگیرسێنم و قۆری چایەکەمی ئەخەمە سەر و دائەنیشم بەدیاریەوە کتێ و چیرۆکەکا ئەنوسم بەو

ویمەنە جوانە هەموو هەست و بیر ناو دەرو[illegible] ئەوروژێن و چالاك ئەبن و ئەکەومە نوسین.

ئاخری شەشساڵیشمان تەواوکرد لەعفك و حکومەت ئەیویست هەر لەوێ بمێنینەوە.

کە لەوێ بوین سوپا (جیش ) کاغەزی بۆ خالەمحمدم نارد کە وەرە فلاّن رۆژ بۆ بەغدا امتیحان ئەکرێیت لەگەڵ هاو دەستەی دەرچونی خۆت خیالله م فەقره هەستا چوو بۆ بەغدا و ابزا[illegible] دە ڕۆژێك لەوێ مایەوە تاقی کردنەوە و امتحانەکەی داو گەڕایەوە بۆلامان دوایی کاغەزی تاقی کردنەوەو دەرچونی بۆ هات لەسەری نوسرابوو(ممتاز)ئێستەش ئەو کاغەزەمان لەلایە کەچی نەجمەو ئەستێرەکەیان کە ئەبو ئەستێرەی سێهەمی بدەنێ بەلاّم ئێستەش نەیان دێ. بەڕاستی ئەو حکومەتە عێراقیە دوابڕاوانە زۆر خراپ بوون لەگەڵمان و زۆر ئەزیەتمان کێشاوە بە دەستیانەوە.

هەموو ژیا[illegible] لەمناڵیەوە تاوەکو ئێستە کە گەیشتومەتە ئەم تەمەن و عمرە لەژیانما هیچ کات خۆشێکمان نەدیوە لەئازاردان و نائارامی زیاتر بە دەست ئەو حکومەتە عێراقیە بەدناوانەوە جگە لەیەك دووساڵی شۆڕشی تەموزی زەعیم عەبدولکەریم قاسم کە ئەویش دوای ئەوەی دڵیان پیس کرد لەکورد یاخود جێ خۆی گرت و لەخۆی بایی بوو بە کوردیەوەدا وەکو هەنگی لێهات کە بەکوردیەوەدا خۆشی مرد.

هەرچۆنێك بێت دوایی دێینە سەر ئەو باسە هەروەك کە ئەو رۆژەی عەبدولکەریم کودەتای لێ کراو کوژرا لەڕادیۆی پاریسی عەرەبیەوە یەکێ قسەی کردو گوتی : لو کان عەبدولکەریم قاسم قد عالج قضیة الآکراد تعقل لما کان الآن من عداد الأموات. زۆر جێ سەرسوڕمانە کە سەیری دەوروپشت و ناسیاو و ئاشنا ئەکەم هەریەکێك لەوکەسانە کات و زەمان و



زروفێکیان بووە کە هیچ نەبێت ماوەیەك بە خۆشی ژیابن بەهۆی وەزیفەو کاریانەوە یان بەهۆی تجارەت و کاسبیەوە لەگەڵ هەموو ئەو جۆرە حکومەتانە هەر بەینێك بۆی لواوە و بەباشی ژیاوە و کاسبی خۆی کردوە و کەسیش نەهاتوە بەلایەوە بگرە ئاشناشی هەبووە لەناو حکومەتەکان و خۆشی سەربەوان بووە یاخود ئەوانەی لەوەزیفە و کاری حکومەتدابوون هەر بەخۆشی ژیاون ڕەنگە هەندێکیان لەماوەێکا توشی نارەحەتی بوبن بەدەست ئەوجۆرە حکومەتانەوە بەلاّم هەر کەس کەس باوەڕناکەم وەکو یالەکا[illegible] بێبەش و بێبەش خوراو و مەحروم و مەزلوم بوین و لەهیچ کات وخ لەهیچ گۆڕینێك هەقی خۆیان دەست کەوتبێ لەسزادان و ئازاردان زیاتر.

بێینەوە سەرباسی عفك هەر لەوێ ماینەوە وەکو لەوەوپێش باسم کرد بۆ شەش ساڵ زیاتر دوایی خاڵم هەندێ پێوەندی کرد بە ئاشنا و رەفیقیەوە لەوێدا بەختی هەبوو کە مدیر تجنیدێکی کورد گوێزرایەوە بۆ دیوانیە عفکیش سەر بە دیوانیە بوو ناوی مدیر تجنید احمد فخری بوو خەڵکی سلێمانی بوو دیارە ئەویش حکومەت زۆر خۆشی نەئەویست بۆیە ناردبویە دیوانیە چونکە زابتی دەرچوی کولیەی عەسکەری ئەگەر ئەکرابە تجنید ئەوە لەپلەی کەم ئەکرایەوە وە خالّم لەبەرئەوە هەر کاك احمد فەخری گەیشتە دیوانیە خالەمحمدمی هەر زو گواستەوە بۆ لای خۆی بۆ دیوانیە دیارە دیوانیە محافەزەو لیوابوو شارێکی گەورەو خۆش بو و بازاڕی ئاوەدانی بوو. کەلەعفك بوین هەمیشە بۆ جەژنان ئەبوو بچین بۆ دیوانیە تاوەکو جلی جەژنمان بۆ بکڕن و کەل و پەل و پێ ویستی جەژن بکڕن دوکانی چاکی لێبوو بۆ جل وکوتاڵ و قوماشی چاکی انگلیزی و فەرەنسی و خەیاتی جولەکەی یەجگار هونەرمەند و چاك و پێلاوی چاکی لندنی وباتا. شتی وا نایاب هەبوو جاران کەوێنەیان نیە ئێستە.

گەیشتینە دیوانیە دامەزراین هەرچەندە شارەزای بووین لەبەر هاتوچۆی شت کڕین و سەردانی مالەئاشنامان ئەم جارە ماڵەکەمان لەدەست پیێ کردنی شارەکە بوو ئەم بەری چەمەکە بوو دراوسێمان و بەرامبەر بە ماڵمان ماڵی مدیرەی مەکتەبی کچان بوو ناوی ست راحیل بوو گاوری موسلێ بوو مدیرەی مەکتەبێکی زۆر گەورەبوو کە ڕەوزە و سەرەتایی و متوسگە بوو یەجگار مەکتەبێکی گەورە و بەرین و چەند لابو و خەڵك لەناویا گوم و بزر ئەبوو بەڵام هەر بەشە ژور و حەوشەی بەرینی خۆی هەبوو ست راحیل  مدیرەی ئەو مەکتەبە بوو مەکتەبەکەش لەوبەرجادەکە بوو یەعنی لەماڵی ئێمەوە دیار بوو. ست راحیل پیرەژنێکی قەڵەوی هەندێ ناشرین بوو خوشکێکی کە هەر وەك خۆی بو و برازایێکی لەگەڵ بوو ناوی ادیبە بوو تەلەبەی ناوەندی ئەو مەکتەبە بوو راحیل خەڵکی موسلێ بوو بۆیە زۆر ئێمەیان خۆش ویست کە هەم کورد بوین و هەم خەڵکی بادینان و زاخۆین کە لەگەڵ موسلێ زۆر تێکەڵ بوون. لەتەنیشت ماڵەکەمان دیوار بە دیوارەوە ماڵی مودیرێکی مەکتەبی تقاویت بوو. خوار ماڵەکەمان لەسەرجادە گشتیەکە کە ئەوپەڕی مەکتەبەکە بوو ماڵی محامی عبدالهادی البچاری بوو کە ئەویش بەهۆی کلیەی حقوق و خاڵە هەمزەمەوە ئاشنایەتی لەگەڵ خالەمحمدم هەبوو. ماڵی عبدالهادی البچاری زۆر جیاواز بوو لەخانو و ماڵەکانی ئەوناوە خانوەکە لەچاو خانوەکانی تر وەك قەسرو وابوو گەورە بە دیرەگی سپی مەڕمەڕەوە دوو سێ چین بوو. هەرزو ماڵیان هاتن بۆ لامان و مەنجەلەچێشتیان بۆ ناردین کە تازە هاتبوین. ەیەکەم رۆژی چونی مەکتە[illegible] بۆ ئەو مەکتەبە گەورەیە کە گەورە بوبوم گەیشتبومە سنفی پێنجی سەرەتایی و ڕێسانی خوشکم بۆ سنفی سێ لەیەکەم رۆژەوە توشی هەندێ نارەحەتی بووم ئەویش هەروەك هەموو تەلەبەو مناڵێك کە ئەچێتە مەکتەبێکی تازەوە



تەلەبەکۆنەکان دەورو خولی ئەدەن و هەندێ جار شەڕی پێ ئەفرۆشن. منیش توشی ئەوە بووم دیوانیە زۆر گەورە و لواو (محافەزە) بوو سوپای عەسکەری لێبو و چەندەها کچ و مناڵی مأمور و کاربەدەستی لێبو و لەهەموو جۆر سپی قژ کاڵ جوان و ناشرین بەڵام تێکڕا خەڵکی ئەو ناوە هەندێ ڕەش و دێز بوون بۆیە کە مناڵێك یا کە سێك هەندێ جوان بوایە زۆر لەبەرچاو ئەبوو لەبەرئەوە ئەو رۆژە کەست راحیل بردنی و ناوی نوسین ئیتر ئێمەش تێکەڵاوی تەلەبە بووین. سەیرم کرد وردە وردە کۆمەڵێك کچی هاو عمرم بگرە گەورەتریش ئەهاتن و ئەچون و سەیریان ئەکردم و لەژێرەوە چپە چپیان ئەبوو. منیش ئەوسا کە نەخۆش بووم و توشی تیفۆ بوبوم پرچم  هەموو وەری بوو بەڵام  لەپێنج ساڵ زیاتر لەعفك پرچم هەمووی هاتەوە و گەلێ جوانتر و زۆرتر لەجاران هەروەها بەو پێنج شەش ساڵەش وا فێری عەرەبی معیدیانە بوبوین هەر ئەتگوت لەوانین. هەرچەندە زانیبویان ئێمە کوردین بەڵام هەر وەك ئەوان قسەمان ئەکرد هەرچۆنێك بوو ئەو کۆمەلەکچە بە دەورما ئەهاتن و چوون منیش راوەستابوم کەسم نەئەناسی. یەکێکیان هاتە نزیکم و گوتی وای پرچت چەند جوانە لەگەڵ ئەو قسەیەی دەستی دایە پرچە هۆنراوەکەم و پڕی پیاکرد و توند ڕایکێشا ئەوانی تریش دەستیان کرد بە پێکەنین و هەرا و ڕایان کرد. ئەوەندەمان نەمابوو بۆ چونە ماڵەوە منیش سەرم ئێشا و نارەحەت بووم و بەئەسپایش گریام بەڵام قسەم نەکرد و چوینە ماڵێ دایکم و نەنە و هەموو هاتن بە پیرمانەوە کە چۆن بو مەکتەبەکەتان پێتان خۆش بوو ئەوان وایان گوت دامە هاڕەی گریان و گوتم کە کۆمەڵێ کچ هاتن و شەڕیان پێ فرۆشتم و پرچیان ڕاکێشام. وسەرم زۆر دێشێت خالەمحمدم لەماڵ بو هات بەسەرا و کەدی ئەگریم بەپەرۆشەوە هات و پرسی کە بۆچی ئەگریم و وا نارەحەتم منیش بۆم گێڕایەوە کە  کە چیان لێ کردووم. دڵی

دامەوە و دەستی گرتم وگوتی وەرە قسەت لەگەڵ بکەم. ئیتر کە چووین دانیشتین پێی گوتم : بەنی کە هاتی کە ئەزا هەر دێنەوە هیچ قسە مەکە تاوەکو نزیکت ئەکەون ئەوەی وای لێ کردی بچۆرە نزیکی و پەلاماری پرچی بدە و مەترسە و خۆت قایم پیشان دە و پێی بڵێ پرچی تۆش چەند جوانە و ئیتر هەقی خۆتی لێ بکەوە و تێرو پڕی لێدە و مەترسە. بۆ بەیانی چووین بۆ مەکتەب دیسان هەر عەینی کۆمەڵ هاتن و لەدورەوە دەرکەوتن کە هاتن بەرەو لای من هەرچەندە ڕێسانی خوشکیشم تێرو پڕ لێیان دابوو بەڵام ئەو لەلای من نەبو و لەبەشە سنفەکەی خۆی بوو کچەکان هاتن و هێشتا بەڕێوە بوون خۆمم گەیاندنێ و لەپڕ پەلاماری کچەکەم دا کە دوێنێ وای لێ کردبووم پرچیم ڕاکێشا. ئەوەندە لەپڕ بو کچەکە حەپەساو هیچی پێ نەکرا و پرچی بەدەستمەوە بو و کەوتمە لێدانی تێرو پڕ لێمدا کچەکانی لەگەڵی بوون هەموو رایانکرد و کچەیان بەجێ هێشت کچەش بەپەشۆکاوی قژ و دەم وچاوی ڕنراوەوە شوێنیان کەوت بەگریان و جنێودانەوە کە بۆچی لەسەریان نەکردەوەو بۆچی بەجێیان هێشت.

قسەکەی خاڵم زۆر ڕاست دەرچوو لەو ڕۆژەوە ئیتر یەك کەس نەیوێرا بێ بەلامەوە و شەڕم پێ بفرۆشێن ئەم قسەو نەسیحەتەی خاڵم ئیتر بوو بە قاعیدە کە گەورە بووم و خۆشم بوم بە خاوەن منداڵ و منداڵەکا کە یەکەم جار ئەچونە مەکتەب ئەو نەسیحەتەم ئەکردن کە هەرکەسێك شەڕی پێ فرۆشتن و غەدری لێ کردن نەترسن و هەقی خۆتانی بە چاکی لێیان بکەنەوە ئیتر کەس ناوێرێت بێت بەلاتانەوە بەڵام قسەتان نەکرد و خۆتان کزۆلکرد پێیانن فێرئەبن منداڵەکا نەوەکا هەروایان کردووە و کەس پێیان نەوێراوە کە چەندەها مەکتەبیشیان گۆڕیوە و بۆ چەند شارو ولاتیش چوونە.



لەدیوانیە ئەوبەر چەمەکە معەسکەری لێبو و ماڵی احمد فخری مدیری تجنید و ملێ عوصمان فایق و ابزا برا یا خوشکەزای ماجد مصطفی بو و چەند ماڵێکی تری کوردی لێبو لەگەڵ مهندسەکەی ئاشنای خاڵم کە لەگەڵی ئەچوو بۆڕاوە ئاسك بۆیە زۆریان لەخاڵم کرد کە ئەبێ بگوێزینەوە بەری ئەوان هەرچەند مەکتەبەکەمان زۆر دورکەوتەوە ئەو مەکتەبە چاکەش و ست راحیل یش کە ئێمەی زۆر خۆش ئەویست هەموو چوار پێنج مانگێك بوو هاتبوین ئیتر گواستمانەوە بۆ ئەوبەر و نزیك بە ماڵی ئاشنا کوردەکانمان. شەڕی عالەمی دووهەمیش دەستی پێ کردبوو وەکو ئەمان بیست و باسیان ئەکرد بەڵام ئێمە هیچ شەڕمان نەدیت هەر ئەوەبوو فلمی شەڕیان دەرئەخست کە ئەچوینە سینەما وەکو دیعایەی پێش فلم و کوشتن و بڕین و دەبابە و تۆپ ئەو چەشنە شتانە بەڵام ئێمە و هاو عمرمان ئەوەندەمان گوێ نەئەدایێ بەتایبەتی کە وەکو ئێستە تەلەفزیۆن و کۆمپیوتەر و ئیمێڵ و ئەوشتانە نەبو لەڕادیۆ زیاتر ئەویش کەم کەس هەیبوو زۆری خەڵك لەچایخانەکان گوێیان لەو دەنگ و باسەی ڕادیۆ ئەبو یاخود ڕۆژنامەیان ئەخوێندەوە (تێ بینین ) من لەتەمەنێکی زۆر کەمەوە توانیبوم ڕۆژنامە بخوێنمەوە هەروەها کتێبی چیرۆك و شتی واش کە زۆر لەووشە و کەلیماتی تێ نەئەگەیشتم بەڵام هەر لەمناڵیەوە زۆرم حەزلەقەڵەم و کاغەز و کتێب ئەکرد.

دیوانیەمان پێ خۆش بوو بەتایبەتی کە ئاشنای زۆرمان هەبوو لەعەرەب و کوردیش و هەروەها پورێکیشم لەوێ بوو لەگەڵ مێردی و سێ مناڵی پورم خوشکی باوکم بوو مێردەکەی نائب زابت بوو لەسوپاو مەعەسکەر. ئەو پورەم زو زوش ئەهاتە لامان بۆ عفك هەرچەندە قەڵەو بوو بەڵام زۆر جوان بو و زۆر قسە خۆش بو و ئەوکەسەی لەلای دانیشتایە سکی خۆی ئەگرت بەقسەکانی ئەیکوشت لەبەر پێ کەنین تاوەکو

لەڕوداوی ناخۆش و تاریکیش خەڵکی ئەهێنایە پێ کەنین زۆر بەرەحم و دەست و دڵ باز بو هەرچەندە خۆشی ئەوەندە حاڵی باش نەبو بەڵام هەر چاوێکی لەخۆی حاڵ خراپتر بوو هەروەها دائم ئامادە بو بۆ یارمەتی دانی نەخۆش و بێ کەس زۆرجار بەدزیەوە ئەچوو سەری پیرێژنی بێ کەس و سەقەتی ئەشت و یارمەتی ئەدان ئەگەر پێی بزانیایە بۆیە هەمیشە لەگەڵ مێردەکەی لەمشت و مڕو قڕە قڕدابوون. مێردەکەی زۆزانی بو و لەدەربەدەرەکانی شەڕی یەکەمی جیهانی بوو بۆیە زۆر عەشایری و ڕەفتار توند بو بەرامبەر ئەو ڕەفتارانەی پورم و ئەیگوت بۆچی ئەچیت خزمەتی ئەوانە ئەکەیت خۆیان کەسی خۆیان هەیە و تۆ هەقت چیە دایکم و ماڵی ئێمەش ئەچوون بەگژیا کە بۆچی وا ئەکەیت خێر ئەکەیت پاروی دەمی مناڵەکانت ئەبەخشی قەیناکە بەڵام بەم جۆرە سەرشتن و کردنە کوڵ ؟

ئەویش دائەنیشت باسی ئەکردن و ئەحواڵی ئەگێڕانەوە و وای ئەکرد لەوانە بو دایکیشم بچێت وایان بۆ بکات.

نەنەشی ئەهێنایە گریان بۆیە هەر گورج لەجیاتی توڕە بوون و لۆمە ئەکەوتنە دەست خۆشی و یاڕەبی خێرت بنوسێت و لەم جۆرە قسانە.

هەرچەندە گواستبومانەوە ئەوبەری چەمەکە و پردەکەی شار بەڵام مەکتەبەکەمان هەر لەشوێنی خۆی بو ونەمان گواستەوە بۆ مەکتەبێکی تر لەبەر دوری بە عەرەبانە ئەیانبردین بەڵام بە پێ ئەگەڕاینەوە چونکە خۆش بوو لەڕێگا زۆری لەگەڵ تەلەبە ئەهاتینەوە و بازاڕ و دوکانیش لەڕێگامان زۆر بوو. جار نەنە ئەهات بە دوامانا. جاریش صالحی خزممان لەگەڵ مەکتەبەکە ڕاهاتبوین و هاوڕێمان پەیداکردبوو ئەگەرچی زۆریش هەبوون کە ناحەزمان بوون و ڕقیان لێمان بوو.

جارێکیان هەندێکم پێ فێربوون بە کۆمەڵ ڕائەوەستان چەپڵەیان لێ ئەدا وگۆرانیان ئەگوت گۆرانیەکەش ئەوە بوو : ( انا کوردی و لابس



عمامە. انا کوردی فۆگ راسی عمامە ) یەعنی گاڵتەیان پێ ئەکردین کە ئێمە من و ڕێسانی خوشکم کوردین و کورد سەری ئەبەستێت و مشکی و سەربەستیان بەسەرەوەیە.

منیش بیرم لێ کردەوە و بۆ سبەینێ گۆرانییێکم بۆ گوتن و بەدەوریانا هاتم و چووم و بەچەپڵەوە گوتم : (انا عربی ماعندی لباس. امشی حافی و هگول یاناس ماعندی لباس ) : (ن عەرە[illegible] دەرپێم نیە و  پێم پەتیە و هاوار ئەکەم خەڵکینە دەرپێم نیە ) ئیتر هەندێکیان شوێنم کەوتن و هەندێکی تریان دایانە قاقای پێکەنین. تێکڕا لەم بەزم و ڕەزمانەی باسی کورد و عەرەب زۆرمان هەبوو بەڵام من هەروەك خاڵم فێری کردبووم و هەمیشە کوردایەتی کردبو بە ناوێکی پیرۆز و مقدس لەلامان بۆیە قەت قەت سەرم دانەئەنەواند و ئەوەی ناوی کوردی بە خراپە ببردایە وەك دڕندەی کێو تێیان بەر ئەبووم. هەروەها هەر زو و کە هێشتا لەصەحرای عفك بوین ڕۆژێك خاڵم هاتەوە بەسەرا کە لەگەڵ ڕێسانی خوشکم بە عەرەبی قسەمان ئەکرد هەڕەشەی لێ کردین کە ئەگەر جارێکی تر لەناو ماڵ بە عەرەبی قسە بکەین زمانمان ئەبڕێت. چونکە ئەوسا کوردی خۆمانمان لەبیر ئەچێتەوە. ئیتر ئەو قسەیە چوە مێشکمانەوە بۆیە لەدوای یانزە ساڵ لەناو عەرەب و ژیان لەگەڵ عەرەب و صحراو شاری عەرەب کوردیەکەمان لەبیر نەچو و هەروەك خۆی مابوەوە کە گەڕاینەوە کوردستان و خزمەکانمان ئەهاتن بۆلامان سەریان سوڕئەما کە چۆن وا بەجوانی بەکوردی قسە ئەکەین و کوردیمان لەبیرماوە بەپێ ئەو تەمەن و عمرەی کوردستانمان بەجێ هێشتبوو کە مناڵ بوین و لەصەحرای عفك چووبوین بۆ مەکتەب بۆ یەکەم جار.

ئەو کەسانە سەریان سوڕ ئەما و ئەیانگوت کە زۆری ئەو کوردانەی لەموسڵ ئەژیان نەك مناڵیان گەورەکانیش کوردی و عەرەبی موسڵاوی

تێکەڵ یەك ئەکەن کە ئەو کوردانەی لەموسڵ ئەژین دائم و هەمیشە ئەوەندە لەگەڵ کورد و هاتوچۆکەری دهۆك و زاخۆ تێکەڵن کە هەر ئەڵێی لەو شارانە دانیشتون بەتایبەتی کە ئەوەندە ئەو شوێنانە لەموسڵەوە نزیکن.

چەند مانگێك بوو گواستبومانە خانوە تازەکەی ئەم بەر شاری دیوانیە کە ڕۆژێك خالەمحمدم بەڕوێکی خۆش و هەراسان و شپرزەییەوە هاتەوە ماڵێ و هەمومانی بانگ کردو گوتی : وەرن قسەیەکتان بۆ بگێڕمەوە بەڵام بێ دەنگ بن و مەیکەن بە هەرا. دایکم. مامۆ.نەنە و ئێمە و ئەوانەی لەگەڵمان بوون هەموو وەك بتمان لێ هات و چاومان زەق بوو ترسایین کە ئەمە ئەبێ چی بێ. و ئەبێ باسی خاڵە هەمزە بێ ؟ ئەبێ چی بەسەرهاتبێ ؟ بەڵام ڕوی خۆشی خالەمحمدم بەدەم ئەو شپرزەییەوە سەرنجی بۆ کاری خراپ نەبردین خالەمحمدم کاغەزی لەگیرفانی دەرهێناو گوتی : نامەی هەمزەیە. عەفوی بۆ دەرچوە و ئێستە لەبەغدایە و چەند ڕۆژێکی تر دێت بۆلامان !!

خ ا ڵە هەمزەی بەسەزما[illegible] لەوساوە کە من مناڵ بووم و هاتن گرتیان و بردیان بۆ موسڵ ئیتر چاومان پێ نەکەوتبوەوە لەیەك دووجاری تر و بۆ ماوەیەکی کورت کورت ئێستە لەدوای ئەم هەموو ساڵە. عەفوی بۆ دەرچو و بەرەڵابوو. ئەویش حکومەت گۆڕا بوو چەند وەزیرێکی کورد و کاربەست خرابونە حکومەتی بەغداوە و یەکەم کار وایان کرد بو کە خاڵە هەمزەم ڕزگارکەن لەو حاڵەی کە تێیدا بوو.

خاڵە هەمزەم تا ئەوکاتە هەر لەژێر چاودێری و پاراستنی جەنابی سید احمد خانقاە دابو. زۆرجار حکومەت ئەیزانی کە لەلای ئەوەو ئەیپارێزێ بەڵام زاتیان نەبو و نەیان ئەتوانی پۆلیس و مۆلیس بنێرنە سەر خانقاە و ئەو شوێنانەی شکیان لێ ئەکرد لەبەر گەورەیی و حورمەت و ناوبانگی سید احمدی خانقاە. هەرچۆنێك بوو چەند ڕۆژێکی بەسەر نامە ناردنی



خاڵە هەمزەم تێ پەڕی کرد خاڵە هەمزەم گەیشتە لامان بۆ دیوانیە دیارە پێش هەموو شتێك گریا بوو دڵ تەنگ بوو بۆ نەنکم کە ئەمری خوای کردبوو لەعفك و ئەیزانی کە زۆری لەحەسرەت ئەودا مرد و هەمیشە چاوی بەفرمێسك بو لەبەرئەو. و چاوی لەڕێی بوو بۆی.

هەر بەجارێك سەرمان لێ شێواو نەمان ئەزانی چی بکەین و چۆن ڕەفتار لەگەڵ خاڵم بکەین خاڵیشم هەروەها لەدوای ئەو هەموو دوریە و لەدوای ئەوەی بە مناڵی بە جێی هێشتبوین وا ئێستە من و خوشکم گەورە بوین و خۆمان هەڵڕشتوە و جوان کەلەبوین دڵی پێمان خۆش بوو. ئیتر میوان و ئاشنا دەستی پێ کرد لەئاشناو خەڵکی دیوانیەی ناسیاومان تاوەکو ناسیاوی عەفەکیشمان دەستیان کرد بە هاتن بۆ لامان بۆ چاو ڕونی و خۆشی دەربڕین بە تایبەتی کە ئەیانزانی چەند داخ لەدڵ و چاو بە فرمێسك و بەپەرۆش بووین بۆ خاڵم.

خاڵە هەمزەم دە ڕۆژێك مایەوە لەلامان و گوتی ئەبێ زو بگەڕێمەوە چونکە لەژێر چاودێریدام و نابێ بچم بۆ ئەملاو ئەولا بەتایبەتی بۆ ارەکانی کوردستان و ئەوی هەر لەبەغدا[illegible] و ئەم هاتنەم بۆلاتان هاوشێوی وەزیرە کوردەکان هەوڵیان دا تاوەکو هێشتیان بێم. هەروەها ناهێڵین ئیشی محاماتیش بکەم و ئەبێ ئیشی تر بکەم.

خاڵم گەڕایەوە بەغداو هەر زو لەشەریکەی کاك عەلی کمال خوالێخۆشبو دامەزرا کە پێیان ئەگوت شرکە (الغزل و النسیج ) جل و چاکەت و ئەو جۆرە شتانەی دروست ئەکرد ئەو کارگەیە.

ئەوەندەی پێ نەچوو بە گەڕانەوەی خاڵە هەمزەم کە خالەمحمدم گوێزرایەوە بۆ شارۆچکەی قوڕنە سەر بەبەصرە لەدیوانیەوە بەشەمەنەفەر چوین بۆ بەصرە لەوێشەوە بە ئوتومبیل بۆ قوڕنە.

قوڕنە خۆش بوو لەلامان زۆری لەبەر ئەو دوو چەمە شیرینە کە ئەڕژانە ناویەکەوە. قوڕنە هەمووی سەوز بوو هەمووی تاوەکو چاو بڕی کردایە دارە خورما و میوە و سەوزی جوان بوو خەڵکی بۆ زۆر شوێن لەجیاتی ئۆتومبێل بەبەلەم و سەفینە هاتوچۆی شوێنانیان و دێهاتان و یەکتری ئەکرد بەلەمیان ناوی مەشحوف بوو هەر خەڵکی وەکو ئێمە زراوی لێ ئەچو چونکە زۆر پەل و بچوك بوون و هەمیشە بە دەو بیست بەسەر ئاوەوە بوون و پڕ لەخەڵك و مەڕو ماڵات کە خەڵك لەبەسرەوە ئەگەیشتە قوڕنە یەکەم جار ماڵی قائیمقام بوو دوایی ئەوماڵەمعەسکەری دەریایی عێراقی بوو کە صالح زەکی توفیق کورد بو و ڕەفیقی خالەمحمدم بوو سەرکردەی ئەو هێزە دەریاییە بو ئینجا دەشت و ساحەیەکی بچوك بوو کە دوو سێ درەختی کۆنی لێ بوو پێیان ئەگوت درەختی ( ابراهیم الخلیل ) ئەوە زۆر پیرۆز و بەبەهابو لای خەڵکی شارۆچکەکەی قوڕنە.

ئەو ڕیزە خانوەی لەدرەختەکانەوە دەستی پێ ئەکرد دیوارەکانیان لەناو چەمی دجلەدا بوون و ئاو تاوەکو خوار پەنجەرەکانی خانوەکان بوو بەڵام ڕیزە خانوی ئەوبەر کە جادە گشتیەکەیان لەبەین بوو ئەو خانوانە تازەتر بوون. و هەموو ئەو ڕیزە خانوی کابرایێکی کورد کە پێیان ئەگوت ناصر خەڵکی عمارە بوو بەڵام ڕەگ و ڕیشەو ئاجداد و ئابایی کورد بوون.

ئێمە ئەو خانوەمان بەرکەوت کە هەر ڕاست بەرامبەر ئەو درەختانەی ابراهیم الخلیل بوو یەعنی درەختەکان هەر لەبەر دەرگاکەمان بوون و ئێمە یەکەم خانو بووین بۆیە دەرگاکەمان لەسەر ئاوەکە بوو بێجگەلەهەموو خانوەکە کە دیواری لەناو ئاوابوو تا نیوە لەگەڵ هەموو ئەو خانوانەی تری ئەو ڕیزە. بەشەو کە ئەنوستین لەبەر شڵپ و هوڕی شەپۆلی ئاو خەبەرمان ئەبوەوە کە ئەیدا لەدیوارەکان بەقایمی بە تایبەتی ئەگەر پاپۆڕی هێزی دەریایی تێپەڕی کردایە بەوێدا کە زۆر بەخێرایی ئەڕۆیشت پێیان ئەگوت



(مەنوەڕ) پاپۆڕی عەسکەری. ئەوەندە خێرابو ئەو چەمە زلەی ئەقڵیشاندەوە و شەپۆلی زۆر توندو تیژی بە دوای خۆیدا بەجێ ئەهێشت کە پەلاماری دیوارو پەنجەرەکانمانی ئەدا لەدوای یەك دوو مانگ ئەو دەنگ و ئەو شڵپەی شەپۆلانە ئەوەندە خۆش بوون لەلامان ئەتگوت خۆشترین مۆسیقاو لای لایمان بۆ ئەکرا و کە لەسەر ئەو دەنگە بەخەبەر ئەهاتین گورج خەومان لێ ئەکەوتەوە. قوڕنە ئەوەندە مێش و مەگەزی هەبوو کەلەناو ژوریشا کولەمان هەبوو بۆ نوستن هەرکەسە (کولەی)سپی برنجۆك بەسەر کورسی نوستنەکەیەوە بوو. دیارە زۆریش گەرم بوو بە هاوینان و زستانی وەك بەهاری خۆمان بوو. ئەوێمان زۆر پێ خۆشبوو ئاشنا و هاوڕێی زۆرمان پەیدا کرد ماڵی ناصری خاوەن ئەو هەموو موڵکە ناصر کوردبو خەڵکی عمارە بوو زۆر دڵیان بە ئێمە خۆش بوو کە ئێمە کوردین ژنەکەی ناوی نەزیمە بوو زۆر جوان بوو ئەویش کورد بوو خزمی خۆی بوو ئیتر ئەوانە لەدایك و باوك و خوشك و برا زیاتر ئاگایان لێمان بوو هەر ئەوەندەت زانی دەبە شیر و سەتلەماستی ماڵی ناصر هات کە گەیشتینە قوڕنە هەر زو ژنێکیان بۆ دۆزینەوە ناوی ( باشیە ) بوو کوڕێکی شەش حەوت ساڵەی هەبوو ناوی حەسەن بوو مێردەکەی مردبوو( باشیە ) بو بەیەکێ لەهەرە دڵسۆز و خۆشەویستەکانمان و خۆی و کوڕەکەی ئیتر لەلامان بوون ئێستەش دیمەن و ڕەسمی لەبەر چاومە مامۆ قسەی گاڵتە و نیکتەی لەسەر باشیە دەرکردبوو چونکە مامۆی خۆشەویست و زو ڕایەکرد بەدەنگیەوە کە بانگی ئەکرد مامۆ ئەیگوت ئەو ڕۆژەی پەنجا فلسێك بخەمە دەستی باشیەوە مامۆ پێی ئەگوت (باشیکێ ) ئینجا ئەیگوت ئەو ڕۆژەی پارەی بدەمێ کە بانگم کرد ڕائەکات بەپەلەو ئەڵێت : ها عمە وئەو ڕۆژەی هیچم نەدابێتێ کە بانگی ئەکەم بەئەسپایی و ئەڵێیت لەبیرێکی قوڵدایە دەنگی دێت و لەسەر خۆ ئەڵێت ها عمە مامۆ بەرەبەرە

چاوی کز بوبو هەروەها زۆریش بەو گەرمایە سەغڵەت بوو بەو حەشەرات و مێشولەیە  بۆیە زۆرجار بەو دەنگە خۆشەی گۆرانی بێزاری ئەگوت هەر زو من ئەگریام بۆی هەمیشە ناڕەحەت و بۆڵەی بوو جنێوی ئەدا و ئەیگوت یکم من خه لکێ  زۆرز چۆن  ئەتوا لێرە بژیم زۆرجاریش قسەی وای بۆ ئەکردین فرمێسك لەچاومان دەرئەپەڕی لەبەر پیٚ کەنین کە میوان ئەهاتن بۆلای دایکم لەبەر گەرما لەحەوشە دائەنیشتین مامۆش لەسوچێکی تر ئینجا ژنەکان زۆر قسەیان ئەکرد و هەر نەیان ئەبڕیەوە مامۆش کە عەرەبی نەئەزانی دەستی ئەخستە سەرسەری خۆی و سەیری ئەکردن و ئەیگوت ( دادیٚ رائو رائو گێژبووم ). هەرچەندە پێمان ئەگوت ئاخر مامۆ گیان تۆ بۆ وائەڵێیت میوانەکان تەریق بونەوە ئەیگوت قیروسیا ئەوان ئەگەر تەریقی بزانن ئەوەندە قسەناکەن و درەنگە ئەبیٚ بڕۆنەوەماڵەکانیان. ئەو هەموو سالاٌنە لەو خواروی عێراقە و لەناو ئەو هەموو عەرەبە ماینەوە نەنە تەنیا فێری یەك دوو کەلیمەی عەرەبی بو ئەویش کە ئەیگوت : ( روح روح )ئەمەش بە سواڵکەرەکانی ئەگوت کە ئەهاتنە بەر دەرگا. ئەچوین بەگژیاو ئەمان گوت ئاخر نەنەگیان گوناحە سواڵ کەر دەرئەکەیت ئەیگوت و للاٌەی عەرب هەر دەرئەکەم دلخی عەرە لەدڵدایە ئینجا دەستی پیٚ ئەکرد و بۆی ئەگێڕاینەوە بۆ جاری صەدەمین جاری و ئەیگوت : عەرەب دزن من کە ئەوسالەچوبومە لای سندسی کچم لەحلب و کە گەڕامەوە بۆ موسلٚ لەڕێگا عەرەبی بدوی ڕێگر و چەتە ڕێگایان بە موتومبیلەکەمان گرت و هەر بەچاو تروکاندنێك یەك بارو یەك پریاسکە و یەکشتمان لەسەر پشتی پاسەکەو لەناو دەستی خۆمان نەما هی هەموو ڕێبوارەکان هەموویان لیٚ دزین ئیتر چۆن من خێر بەعەرەب بکەم.

ئێمەش پیٚ کەنین و بەدزیەوە ئەچوین شتمان ئەدا بە سواڵکەرەکان. نەنە بە سواڵکەرەکانی ئەگوت ( روح روح خوا بدا ) هەروەها مامۆش هەر



دوو سیٚ کەلیمەی  عەرەبی ئەزانی و فێر بوبو.  بەلاٌم دایکم عەرەبی موسڵی ئەزانی و زۆر بەزەحمەت فێری عەرەبی تر بو ئێمەش من و ڕێسان بە هەموویان پیٚ ئەکەنین چونکە ئێمە بە مناڵی چوبوینە ناویان هەر ئەتگوت معیدی تەواوین.

قوڕنە دیمەنی یەکجار جوانی هەبوو ئەو ڕیزە مالاٌنەی دیواریان لەناو ئاودا بوو هەموو پەنجەرەی دوو دەروازەی وەك دەرگایان هەبوو لەژورەکان کە ئەیڕوانیە سەر چەمەکەی دجلەهەموو ڕۆژێك دوای بەربونی مەکتەب و گەڕانەوەی مأمور و کاربەدەست دوای نان خواردن زیقەی پەنجەرە و دەرگا ئەهات و هەرمالەدەرگاو پەنجەرەی ئەخستە سەرپشت و قولاپ و پارچە نان و وردە گۆشت و شتی وای دائەنا لەتەنیشتی لەجامێکا و قولاپ هەلەدرایە ناو دجلەوە و ئەکەوتنە ماسی گرتن منیش وەکو ئەوان قولاپ و کەرەسەی ماسی گرتنم دەرئەهێنا و قولاپم هەلٚ ئەدا.

سیٚ ژوورمان لەسەر چەمەکە بو ژووری میوان و نوستنی خالەمحمدم و ژووری نوستنی خۆم و دایکم و ڕێسان من  لەژووری نوستنی خۆمانەوە ئەکەوتمە قولاپ هەڵدان دراوسێکانمان ئەبو بەقریشك و هوڕیان و ماسی گەورەو بچوکیان ئەگرت بەلاٌم من هەر ماسی ئەهاتن نان و خواردنی قولاپەکەمیان ئەخواردو و لێیان ئەکردەوە و ئەڕۆیشتن و پێوەی نەئەبون بەلاٌم هەروازم نەئەهێناو هەر خەریك ئەبووم هەندیٚ جار دایکیشم ئەهات و ئەیگوت تۆ نازانی بیدەرە دەستم کەچی ئەویش هەر بۆی نەئەبو ڕێسانیش ئەهات ئەویش خەریك ئەبو بەلاٌم ئەو مناڵتربو ئەوەندە گوێی نەئەدایی و خەریکی شتی تر ئەبوو.

هەرچەندە یەك دوو جار بۆم هەڵکەوت و یەك دوماسیم گرت جارێکیش شتێکی وەکو ماسی بو پێیان ئەگوت ( کوسەج ) ئەوە زۆرجار خەڵك ئەترسان بچنە ناو ئاو ئەیان گوت کۆسەجی لێیە قاچمان لیٚ ئەکاتەوە

پشتی ڕیزێ درکی پێوە بوو وەك پشتی ماسی بەڵام زۆر تیژو ڕەق یەکسەر قاچی خەڵکی ئەبڕی و برینداری ئەکرد زۆر دڵم خۆش بو کە گرتم بەڵام بیرم نیە چیمان لێ کرد.

لەخوار ماڵەکەمانە و کە لێمانە دیار بو زۆرتر نزیك جێ نشینی هێزی دەریاکەی بەرامبەرمان بوو کەلەدەستە چەپەوە چەمی فورات ئەگەیشت و تێکەڵی دجلەئەبو و لەوێ شوێنێکی ترسناکیان دروست ئەکرد کە پێیان ئەگوت (الخورە) لەویا ئاوەکە هەر لولی ئەخواردەوە بەلەم و مەشحوف تاوەکو سەفینەی گەورەش لەو ناوچە لول خواردووە خۆیان لائەدا و ئەترسا نوقمیان کات. دجلەلێڵ بوو فرات رون و صاف تاوەکو ئەگەیشتینە بەصرە ئەو ئاوە بە تێکەڵاویش و وابو بەتایبەتی لەقەراغەکانی ئەو بەریشمان ناوی ( محمرە )ئێرانی بوو.

قوڕنە لەبەر زۆری خورما. زەردەواڵەی بێ ئەندازەی هەبوو ڕۆژ نەبوو هەریەکەمان یەك دوانێکی پێوەی نەدایە زۆرجار ئەچوونە ناو پێڵاوەوە ئیتر کە لەپێمان ئەکرد قریشکەمان لێ هەڵستا بە تایبەتی نەنە زو زو لەهەمووامان زیاتر زەردەوالەپێوەی ئەدا.

خورمای زۆر نایاب هەبوو چەندەها جۆر لەناو تەنەکەو دۆشاو پێیان ئەگوت معسل بێجگە لەهی ناو حەسیر هی وشك دەیان ناویان هەبوو بڕیم. خستاوی. زهدی. خچراوی قوڕنەش وەکو عفك زۆری کوخ بوون خانوی زۆریشی تیابو و چەند جۆر مەکتەبیش بەڵام هەر بازاڕو دوکانی وای لێ نەبوو بۆیە بۆ جەژنان و ئەو جۆرە ڕوداوانە ئەچوین بۆ بەصرە بۆ شت کڕین بەصرە زۆر جوان و خۆش بو و کەل وپەلی چاکی لێبوو چونکە شەڕی دوهەمی جیهانی بوو انگلیزو ئەمریکیشی لێبو حەماڵەکانی بەصرە هەموو انگلیزیان ئەزانی.



شەوێکی زستان کردی بەباو تۆف و هەڵاێکی زۆر ئەلەکتریك کوژایەوە شەپۆلی ئاو خەریك ئەبوو لەپەنجەرەوە بێتە ژورەوە ئێمە هەر وشك بوبوین لەترسانا من و ڕێسان باوەشمان کردبوو بەدایکم و نەنە و مامۆدا و ئەگریاین خاڵم لەماڵ نەبوو لەنادی هێزی دەریایی بوو لەگەڵ هاوڕیەکەی صالح زەکی تۆفیق دڵمان لای ئەویش بوکە لەپڕ بەحاڵ گوێمان لەهاوار هاوارێك بوو لەناوچەمەکەدا. هاوارەکە ئەیگوت : لەڕێی خوادا فریامان کەون ئێرە کوێیە نازانین بۆ کوێ ئەچین خەریکین نوقم ئەبین منالْ و ژنی زۆرمان لەگەلەهاوار فریامان کەون. دیارە ئەم قسانە بەعەرەبی بوون. هەر ئەوەندەمان زانی دایکم پەلاماری چرای دەستی دا کە پێیان ئەگوت چرای انگلیزی و ڕای کرد بەرەو دەرکی حەوشە و ئێمە بە هاوار و گریانەوە ڕامان ئەکێشا و ئەمانگوت چی ئەکەیت ؟ ئێستە تۆفانەکە فڕێت ئەداتە چەمەکەوە. ئەویش خۆی ڕائەپسکاند لەدەستمان و ئەیگوت ئەچم چراکە پیشانی ئەو خەڵکەی ناو ئاوەکە ئەدەم تاوەکو بزانن ئێرە شارە و ئەمەوێت بقیڕێنم بەشکم خەڵك بێت بەلایانەوە. نەنە و مامۆ پێیان ئەگوت کچێ چرا لەم تۆفانە چۆن ناکوژێتەوە و دەنگت بەکێ ئەگات بەڵام دایکم هەرگوێی نەئەدا ینێ و بەپەلەکراسی دا بەسەر چراکەوە خۆی گەیاندە بەر دەرگا و توند بەدەستێکی تر خۆی گرت بە درەختەکانی ابراهیم خلیلەوە و هاواری بۆ ئەبرد کە فریای ئەو سەفینە نەگبەتە بکەوێت هەر ئەوەندە دایکم و چراکەی چوە دەرێ عەسکەری هێزی دەریایی بەجارێك ڕژانە ئەوناوە و پەلاماری گوریس و بەلەم و کەل و پەلی دەریایی خۆیان دا و فریای خەڵکەکە کەوتن و رزگاریان کردن بۆیە هەر زو دایکمیان کردە ژوورێ ئیتر بەرەبەرە ڕۆژ دەرکەوت و دەرکەوت کە چۆن زیان بەشارەکە گەیشتوە و چەندەها دارە خورما شکابوون و دیرەگی ئەلەکتریك هەمووی ڕوخاو و شکابوو چەندەها کوخ تێك شکاو و ڕوخابون ئیتر زۆر تۆفانێکی

سەیر بوو بۆ بەیانی و دونیا هێمن بوەوە بەیانی زوو عەسکەر هاتن
سوپاسی دایکمیان کرد و گوتیان ئێمە گوێمان لەهیچ نەبوو ئەگەر
چراکەی تۆ نەبوایە نەمان ئەزانی و ئەو هەموو خەڵکە ئەمردن چونکە
سەرباقی تۆفان و ئەو شەپۆلەتوند و دژوارانە لەبەر بای قایم سەفینەکە
گەیشتبوە نزیك شوێنە خەتەرناکەکە کە لولی ئەخوارد دوای عەسکەرەکان
و هەندێ کەسی ئەو سەفینەیەش هاتن بۆ بەردەرگامان و گوتیان ئەوکەسە
کێ بوو کە ئیمشەو گیانی زیاتر لەبیست مناڵ و ژن و کەسی ڕزگارکردوە
ئەمانەوێت بیبینین و دەستی ماچ کەین دوو بەرخیشیان بۆ هێنابوو.
دایکیشم هاتە دەرەوە و خۆشحاڵی خۆی بۆ دەربڕین کە سەلامەت
دەرچوون و بەرخەکانیشی لێ وەرنەگرتن وگوتی بیدەن بەو مناڵانەی
ئیمشە و لەناو سەفینەکەدا بوون و ترسابوون و لەمردن ڕزگاریان بوو. ئیتر
دایکم ناوی دەرکرد کە ئیمشەو چی کردووە و چەند لەپیاوان بەغیرەت تر
بووە. خاڵم زۆری پێ خۆش بو و زۆر مەتحی کرد و سوپاسی کرد و
هەروەها دەرو ودراوسێش هاتن بۆ لای و خۆشحاڵی خۆیان بۆ دەربڕی.
تەنیشت ماڵەکەمان دیوار بەدیوارەوە ماڵی حاکم بوو. حاکم خەڵکی بەغدا
بوو خۆی و دایکی بوون دایکێکی قەڵەوی سپی خرپنی هەبوو ئەهات بۆ
لای دایکم لەگەڵ دراوسیەکانی تر من و ڕێسان زۆر لاسایمان ئەکردەوە
کاتێ باسی ڕەزو باخی خۆیانی بۆ دراوسیەکانی ئەگێڕایەوە.

ڕەزو باخی زۆریان لە(شەهرەبان )هەبوو ئینجا مەتحی هەنارەکانی
ئەکرد هەردوو لەپی دەستی نزیك یەك ئەکردەوە و بەهەناسە بڕکێ
قەڵەویەوە ئەیگوت : ( کل رمانە هەلکت ) هەر هەنارە ئەوەندە ئەبێت و هەر
لیمۆ و پرتەقالەئەوەندە ئەبێت. کە دایکی حاکم ئەچووەوە بەلای باخ و
ماڵەکەیاو حاکم بەتەنیا ئەمایەوە لەقوڕنە ژنێك ئەهات لەگەڵی ئەژیا
ئەیانگوت ژنی حاکم هی کەش ئەبو بەچرپە چرپیان ئەیانگوت ئەمە ژنی



نیە لەگەڵی ئەژی ( قەباتمەیەتی )ئێتر نازا ئەوناوە چی بوو بەڵام وایان
پێ ئەگوت بەتایبەتی نەزیمەی ژنی ناصری ئاشنامان هەموو باسی ئەو
خەڵکەی ئەزانی لەگەڵ پیرە کچێکی خوشکەزای ناصر ناوی ( ئەمونە )بو
ئەوە ڕیپۆرتەرو تەلگورافچی گەڕەك و شاریش بوو.

ژنی حاکم زۆر جوان و سەرنج ڕاکێش بوو لەناو ئەو هەموو ژنە مأمورو
کچە مأمور و دەوروبەرە شتی وەکو ئەو نەبو مەگەر بازیگەرانی سینەما
ئەویش هەرە جوانەکان سەیر ئەوەیە هاتوچۆی دراوسیەکانیشی ئەکرد و
گوێی نەئەدایە پرس پرسیار و چرپەچرپی ئەوان.

چونکە ئەوکاتانە و لەو شارۆچکانە جێ ڕابواردن و هیچ نەبو بۆیە ئەو
ماڵەمأمورانە ڕۆژێ ئەچونە ماڵی یەکێکیان و بۆخۆیان خۆشیان ڕائەبوارد
ناوی ئەو گەڕان و چونەماڵانەش( قبولْ ) بوو بۆیە دائم ئەهات بۆ قبولْ.
ئێمە کە مناڵی ئەو ماڵانە بوین سەیرمان ئەکردن و لەشوێنی جیا
دائەنیشتین لەگەڵ هاوتەمەنی خۆمان. ڕێکەوتێکی زۆر خۆشمان هەبوو
ئەویش کە کاتێ لەعفك بوین ماڵی معاونێکی شرطە لەوێ بوون پیان
ئەگوت عەبدولکەریم الظاهر السبع سێ چوار کچی هەبوو کچی سێهەمی
کەلەمناڵەکە گەورەتر بوو ناوی ناجحە بوو لەعفك زۆر دراوسێ و هاوڕێی
یەك بووین کەچی کە هاتینە قوڕنە ئەوانیش لەوێ بوون ئیتر زۆر زۆر
دڵمان خۆش بوو لەگەڵ ناجحە لەخوشك زیاتر بوین ڕێسانیش لەگەڵ
بەشیرەی خوشکی کە مناڵەکەیان بوو هاوعمری ڕێسان بوو. لەبەرئەوە
دائەنیشتین بەو میوانانە ڕامان ئەبوارد و لەژێرەوە گاڵتەشمان پێ ئەکردن.

ناجحە زۆر کچی چاك و ئاقڵ و بەحورمەت بوو زۆریش قسە خۆش و
گاڵتەچی بوو. گاڵتەمان بە درزیەوە بە مدیرە و موعەلیمەکانمان ئەکرد.
مودیرەکەمان ناوی ست خیریە بوو خەڵکی موسڵ بوو نەگبەتە دایك و
باوك و دوو خوشکی زەبەلاحی پیرەکچ و براێکی لەئەستۆدا بوو ئەو بەو

معاشەی بەخێوی ئەکردن بۆیە حاڵیان زۆر شڕ بوو ست خیریە تەنیا یەك دەستە جلی هەبوو هاوین و زستان بۆ مەکتەب بۆ گەڕان و حەفلەهەر ئەوانەی لەبەردابوو کراسێکی شینی ڕەنگ چویتی و چاکەتێکی ڕەش کە ئەوەندە شۆررابوو قۆڵی گەیشتبونە لای ئانیشکی پرچی کورت و لول بوو سنگی زۆر گەورە بوو بۆ نەگبەتی و لەو کراسە سواوە تەسکەدا پیشیان خواردبوو. ئێمەش لەجیاتی بەزەییمان پیادا بێت هەر بەوەدا ئەگەیشتین گاڵتەی پێ بکەین و لاسایی بکەینەوە من بەباشی ئەمتوانی لاسایی خەڵك بکەمەوە هەروەها وەکو ئەوانیش قسە بکەم. دیارە ئەوە هەر ئەو هونەرە بووە لەناودەرونما کە گەورەبووم. بوم بە نوسەر و ڕۆمان و چیرۆك نوس. ئەو تەمەنەی من و ناجحە و هاوڕیەکانی ترمان هی ئەوە نەبوو بیر لەبەزەیی (حقوقی انسان )بکرێتەوە بۆیە گوێمان نەئەدایێ. هەروەها موعلیمەیەکی تریشمان هەبوو ناوی ست دیزێ بوو گاور بوو براکەی مرافقی عەبدوڵلاَ ی خاڵی ملك فیصل ی بچوك بوو زۆر زابتێکی لەپێش بوو بۆیە هەر چەند لەگەڵ وصی عەبدوڵلاَ ئەچو بۆ ئەوروپا و شوێنان قات و پێڵاو و جلی یەکجار جوانی بۆ ست دیزێ خوشکی ئەهێنا بەلاَم فایدەی چی دیزێ پیرەکچێکی زۆر گەورە بوو بە تەمەن. درێژێکی ناوەندی بوو لەقەڵەوی و زەعیفیدا دەموچاوی ساردو سڕبوو ناوچەوانی زۆرپان و قۆقزو دەرپەڕیو بوو دائم بریقەی ئەهات پرچێکی تەنکی دووتاڵی کاڵی بەسەرەوە بوو سەرباقی دەردان زمانیشی هەندێ لاڵ بوو نەیەتوانی حەرفی ( ڕ) (R) لەفزکات موعەلیمەی حساب و هەندەسەمان بوو ئێمە گەیشتبوینە سنفی شەشی سەرەتایی دیارە ئەبو ئیمتیحانی بەکەلۆریمان هەبێت سەری ساڵ ئینجا وەرە لەگەڵ دیزێ بتوانیت تەلەبە بە چاکی ئاگای لەدەرس و دەورو حساب و هەندەسە بوایە لەبەرئەوە هەموو ڕۆژێك دەرسی ئەو هەر قیژەو شاتەو کولیچەو گاڵ گاڵی خواردن بوو. هەموو



تەلەبەکان لەکاتی پشودا شتیان ئەکڕی کەلەسنفی ئەو بەسەزمانەدا بیانخواردایە. دیزێ زۆر زۆر زیرەك بوو هەر بلیمەت بوو لەعیلم دا بەلاَم عیلمەکەی بێ فایدەبوو چونکە تەلەبەی ئەو تەمەنە دوانزە سیانزە سالەنەیان ئەتوانی خۆیان ڕابگرن و پێی پێ نەکەنین. بەتایبەتی جۆری تەلەبەکانیش تێکەلاَوێکی سەیر بوو هەر لەمعیدی عەبابەسەری خوریەوە بوو تاوەکو تازە پیاکەوتو تازە دەوڵەمەند چونکە حەرب بوو شەڕ جیهانی دوهەم بوو دەوڵەمەندی ( حرب ) زۆر پەیا بوبون هەروەها کوڕ و کچی مأموری جۆراوجۆری وەکو ئێمەش هەبوو.

زۆر سەیرە ئەوانەی باسیان ئەکەم پیرەکچەکان هەموویان تەمەنیان سەرو چل و بگرە پەنجا بوو بێجگە لەخوشکەکانی ست خیریە کە ئەوان هەندێ کەمتر بوون و خیریەی خوشکیان پەنجا ساڵ زیاتر بوو هێشتا شوی نەکردبوو کە لەناو عەرەبەکانا هەر زوو کچیان ئەدا بەشو لەعمری و لردە سـ ینزە سـ الچ‌ا کەچی نازا ئەوانە بۆی تا ئەوکاتە شـ ویلن چ نەکردبوو.

ست خیریە لەڕیزی مالەمأمورەکان نەبوو هەندێ ماڵی دورتربوو نزیك بازاڕ بوو بەلاَم ست دیزێ لەڕیزی ماڵەکەمان بوو لەگەڵ دوو موعلیمەی تری مەکتەبەکەمان پێکەوە لەخانوێکا ئەژیان دوو موعلیمەکەی تر یەکێکیان ماری ناوبو گاور بوو زۆر جوان بوو لەئاڤا گاردنری_بازیگەری سینەما ئەچوو. خالەمحمدم حەزی ئەکرد ئەگەر شوی پێ بکردایە بەلاَم دایکی ماری قبوڵی نەکرد کە ماری شوبکات بە ئیسلام.

خالەمحمدم زۆر پیاو و لاوێکی شیرین و ڕەزا سوك و ئازا و بەغیرەت بوو بۆیە دائم کچە مأمور و موعەلیمە هەر بە ئاشکرا ماستاوی دایکمیان ئەکرد کە بەشکم خالەمحمدم یەکێکیان بهێنێت و ئێمەش زۆر لێی ئەپاڕاینەوە بیرمە هەندێ جار دایکم سەرینێکی بچوکی ئەخستە باوەشم و

سەرپۆشێکی پیا ئەدا و ئەیگوت برۆ بەخاڵت بڵێ : ها خاڵۆ گیان ئەوە کوڕەکەتە دایکم و هەموویان وایان پێ ئەگوتم ئەیانگوت چونکە تۆی خۆشەوێت بەشکەم بەقسەت بکات. خاڵم خاڵ و باوك و براو هەموو کەسێکی کەم وێنە بوو هیچ کات و هیچ ڕۆژێك هەستم بەوە نەئەکرد کە باوکم نیە و باوکم لەگەڵم نیە لەبەرئەو خالەمهرەبان و کەم وێنەیەم بۆیە ژنی نەهێنا کەلێی ئەپاڕاینەوە پێ ئەکەنی و ئەیگوت من ژن بێنم لچ لەخوشکم و کچەکانی شۆڕکات و لێیان تورە بێت بەخوا ببێ بە دایکی حەوت کوڕی پەلکە زێڕین تەلاقی ئەدەم ئینجا بۆ کچی خەڵك بهێنم و سەر لەخۆشمان بشێوێنم. بەڵام بۆ ماری حەزی ئەکرد و ئەیگوت ئەو گاورە ڕەنگە باش بێت و ئەوەندە خۆ پەرست نەبێت. کەچی دایکی ماری ڕازی نەبوو کە زۆریش تێکەڵ بوین لەگەڵیان هەمیشە کە ئەچوین بۆ بەصرە لەماڵی ماری دائەبەزین زۆر خزمەتیان ئەکردین زۆر سەیرە ئەو جۆرە کەسانەی گاور و جولەکە کە ئەوسا جولەکەش زۆر بوون و زۆر ئاشنامان بوون لەگەڵمان زۆر ڕێك ئەکەوتن چونکە کوردبووین زۆرجار سکالاو ناڕەزاییان هەبوایە لەکەسێك ئەهاتن بەخاڵمیان ئەگوت. لەعفکیش موعەلیمەیەکی جولەکەمان هەبوو خەڵکی بەغدا بوو ناوی ست نجیبە بوو زۆر هونەرمەند و عاقڵ و زیرەك بوو تاوەکو ئەم دوا ساڵانەش بەیادگار نەقش و چنینی دەست و پەنجەی زێڕینیمان لەلابوو بەڵام لەڕاکردن و ماڵ بەجێ هێشتن و کەوتنە شاخ و دەربەدەری گەلێ شتی یادگارو بەبەهامان لەناوچوو.

لەگەڵ ست ماری و دیزێ و موعلیمەیەکی تریش هەبوو ناوی صبریە بوو خەڵکی ابو الخصیب بوو ئەسمەرێکی ئێسك سوکی زۆر خۆشەویست بوو ئەو دوانە ماری و صبریە زۆر تێکەڵاومان بوون دایکم هیچ خواردنێکی خۆشی بێ ئەوان نەئەخوارد هەروەها لەمەکتەبیش تەلەبە خۆشیان



ئەویستن بۆ دەرسەکانیان خۆمان ئامادە ئەکرد تاوەکو توڕەیان نەکەین بەڵام ست خیریەی مودیر و ست دیزێی باڵا بەرزی بەد بەخت کەس بەقسەی نەئەکردن و لێشیان نەئەترسان.

لەڕیزە خانوەکانی دیوارەکانی ناو ئاو ماڵێ دوا ماڵی حاکم ماڵی مودیر المال بوو. ئەو مالەزۆر ماڵێکی بەحورمەت و سەیر و سەرنج ڕاکێش بوون. مودیر المال خەڵکی مندلی بوو لەگەڵ ژنەکەی حەوت کچی هەبوو کوڕی نەبوو. سێ برازای هەتیویشی بەسەرا کەوتبو برازاکانی یەکێکیان کوڕ بوو یەعنی نۆ کچیان هەبوو لەگەڵ کوڕێك. مودیر المال پیاوێکی قەڵەوی هەندێ کورتە بنە بوو زۆر بەحورمەت و پاك بوو چونکە مأمور لەو شارۆچکانە زۆر دزییان ئەکرد و بەرتیلیان وەرئەگرت بەتایبەتی کە ئەم مودیرو المالیش بوو بەڵام حاڵیان زۆر شڕو فەقیر بوون هەر ئەیتوانی ورگی مناڵەکانی پڕکات و تێریان کات بەو معاشە. هەرچەندە ژنەکەی زۆر بەجوانی نەیەزانی عەرەبی قسە بکات و زۆر لەکورد ئەچوون بەڵام نەیان ئەگوت کەکوردین.

ژنەکەی دایکی کچەکان دەستێکی سەقەت بوو ئەتگوت کاتی خۆی سوتابوو لەبەرئەوە ئەوەندە نەیەتوانی ئیش بکات کەیبانو ماڵدارو سەلارو گوڵی ماڵەکەیان کچە نۆبەرەکەیان بوو ناوی فتحیە بوو حەڤدە ساڵ ئەبوو کچێکی هەندێ خرپنی ئێسك سوکی خۆشەویستەنی بوو دوو پرچی درێژی هەبوو کە ئەیهۆندەوە ئەم کچە ئەو هەموو مناڵ و ماڵ و خێزانەی بەخێو ئەکرد و ئیدارەی ئەکرد باوکی لەگیانی خۆی خۆشتری ئەویست چونکە ئەگەر تەکبیرو ژیری فتحیە نەبوایە حاڵیان شڕئەبوو بە پێچەوانەی فتحیە خوشکێکی لەخۆی بچوکتری هەبوو ناوی وەفیقە بوو ئەو ئەوەندە ئاژاوەچی و قڕەقڕکەرو هار بوو بیست و چوار سەعات هەر شاتەی ئەهات چونکە ماڵەکانیش هەموو بەتەنیشتی یەکەوە بوون بۆیە هەموو ئاگاداری

حاڵی یەکتر بوون. وەفیقە هەمیشە ئاڵوی کەوتبوو و قوڕگی ئەیەشا و کە قسەی ئەکرد ئەتگوت کفتەی لەقوڕگا عاسی بووە. هەموو ڕۆژێك دوای گەڕانەوەمان لەمەکتەب لەماڵی مودیر المال حەرب و جەنگی وەفیقە دەستی پیێ ئەکرد و برنج و شلەئەکرا بەسەر یەکتریا.

وەفیقە بەسەر فتحیەدا ئەی نەڕاندو ئەیگوت : ئەمە تۆ چێشتت بۆ لێناوین ئەم برنجە پەڵوڵەیە و ئەم شلەدەریاو بەحرە مەگەر مەلەوانێکی زۆر ئازا بتوانێت لەناو ئەم شلەیە تا دەنکە پەتاتە یا کوتە گۆشتێك بدۆزێتەوە. من ئەوە ناخۆم فەتحیەی بەسەزمانیش ئەقیڕاند بەسەریاو ئەیگوت : ناخۆی چاوت دەربێ ، باوکی قوڕبەسەرمان هەرئەوەندەی هەیە. ئەوە لەکوێ بۆ جەنابت برنجی دانار دانار و کوتە ماسولکە و سنگی مریشك بێنم و پەیداکەم.

فتحیە بەو عمرو تەمەنەوە کە گەورەبوو لەچاو تەلەبەی تەمەنی ئێمە کەچی موعلیمە و خەڵك ئەوەندەیان خۆشەویست لەبەر کردەوەو و ڕەوشتی ئەیانهێڵا بێت بۆ مەکتەب بخوێنێت ئەگەرچی ئێمە هەمووماں هەرە گەورەکەمان دوانزە سیانزە ساڵ ئەبووین کەچی ئەو بەعمری حەڤدە بگرە هەژدە ساڵەوە ئەهات لەناومان دائەنیشت و دەرسی وەرەگرت چونکە لەبەر زروفی ماڵەوەیان و دایکی دەست سەقەتی و باوکی کۆڵ نەدەری ، مەکتەب ئەو پاداشتەیان دابوەوە کە قەی ناکات بێت بخوێنێت. لەهەمووی سەیرتر لەکاتی دوا فرصەدا ئیزنی وەرەگرت کە بچێت برنجەکە لێبنێت یا نیسکێنەکە ڕۆن و پیازی پیاکات چونکە ئێستە ئەو هەموو منالانە ئەچنەوە ماڵێ و هیچ نیە بیخۆن. مەکتەبەکەشمان زۆر نزیکمان بوو ڕیزە خانوەکانی ناصری کورد کە شەقام ئەکەوتە بەینی ماڵەکانمان و ڕیزە خانوەکانی ئەو.



ئەو پایز و زستانە لەو ماڵەمان مابنەوە کە دیوارەکانی لەناو ئاودا بوون. بەرەو بەهار گواستمانەوە بۆ خانوەکانی ڕیزی بەرامبەرمان ئەو پەڕی شەقامەکە کە خانوەکانی ناصر بوون. ئەو ڕیزە بەم جۆرە دەستی پیێ ئەکرد. یەکەم مەکتەبەکەمان کە خانویەکی زۆر گەورەبوو. دووهەم ماڵی ناصر خۆی بوو سێهەم ماڵی ئێمە بوو. چوارەم ژن و پیاوێك بوو کە کوڕە شێخێکی گەورەی ئال سعدونیان بەخێو ئەکرد و بەدیاریەوە بوون ورکەکە چواردە پانزە ساڵ ئەبوو لەمەکتەبی ناوەندی بوو ئێتر نازا بۆچی لەوێ بو دیاربو لای شوێنەکەی باوکی مەکتەبی وای لێ نەبوو.

تەنیشت ئەوان ماڵی ژنە کۆنەکەی ناصر بوو کە خەڵکی قوڕنە بوو دوو سێ کچی هەرزەکاری گەورەی هەبوو کە بەرۆژ هەر لەماڵی باوکیان بوون و خزمەتی نەزیمەی ژنی و مناڵەکانیان ئەکرد ، نەزیمە زۆر زاڵ بوو بەسەریانەوە و کچەکان لێی ئەترسان هەروەها خوشکێکی پیرە کچی نەزیمەش بەسەر ماڵەکەوە بوو بەڵام ئەو لەگەڵ کچەکانی ناصر زۆر ڕێك بوو لەژێرەوە زۆر زۆر شتی ئەدانێ و ئاگای لێیان بوو زۆرجار لەگەڵ نەزیمەی خوشکی ئەبو بەشەڕیان لەسەر ئەو کچانە بەڵام نەزیمە دەرەقەتی خوشکی نەئەهات.

هەوەندە نەبوو چووینە خانوە تازەکەوە وابزا لەساڵێك کەمتر بوو کە دەنگ بڵاوبوەوە لەماڵی ناصری کوردی ئاشنامانەوە کە وەکو لەوەوپێش گوتم کە نەزیمەی ژنی و ئەمونی خوشکەزای تەلوگراف و ڕۆیتەری هەموو قوڕنە بوون. ئەمون ئیش و کاری نەبو هەر ئەچوە ئەم ماڵ و ئەو ماڵ و ئەم گەڕەك ئەو گەڕەك بۆ دەنگ و باس هێنان بۆ نەزیمەی خاڵۆژنی کە خاڵۆژنی لەخۆی مناڵ تر بوو. بۆیە لەو مالەدەنگ بڵاوبوەوە کە خالەمحمدم تقاعد کراوە کەچی هێشتا ئێمە نەمان بیستبوو. ئەویش دیار بوو خاڵم نەی ویستبوو پێمان بڵێت و ویستبوی تاوەکو بکرێت ئەو

هەواڵەمان لێ بشارێتەوە بۆ ئەوەی خەفەت نەخۆین ئیتر ئەو ڕۆژە کە هاتەوە ماڵێ نیوەڕۆ دایکم پێی گوت کە ئەو هەوالەچیە ئەوە ڕاستە ؟ خاڵم سەری سوڕماو گوتی ئەوە چ زو زانیتان و کێ پێی گوتن. هەرچۆنێك بێ دایکم و نەنە و مامۆ و هەروەها هەموومان خۆمان نارەحەت پیشان نەدا و گوتمان هەر تۆ خۆش بیت بۆمان هەموو دونیا ئەهێنێت دەبا تقاعدت کەن وەزیفەوکاریان سەریان بخوات خۆ ئەمە یەکەم جارنیە. خاڵیشم گوتی : وی ٚمەدەنی ٚپەکمان ناکەوێت لەئیسێتەوە رەفیق و هاورێکا ئیشیان بۆدۆزیمەوە و ئێستە شەڕی جیهانی و زەخیرە دابەش کردنە بە بلیت و کاڕت رەفیقەکا توجاری ئەو کارەن هەر گورج گوتیان ئەتکەینە شەریك هەروەها ناصری خاوەن خانوەکەشمان هاتە دائیرە لەلام و گوتی هەموو انوو مولکەکا ئەخەمە بەردەستت تەنیا نلۆەحەت مەبە ناصرو و دوسێ هاوڕێی خاڵم کە لەبەصرە بوون دەوڵەمەند و خاوەن موڵك بوون هەرچی ڕەزوباخی دەوروپشتی قوڕنە هی ئەوان بوو ئەوانیش زۆر پیاوانە هاتنە پێشەوە لەخاڵم و دەوریان دا. و ئامادەیی خۆیان دەرخست. بەڕاستی پەکمان نەئەکەوت بگرە چەندەها جار حاڵمان لەوسای وەزیفە باشتر بوو.

بەڵام چەند هەفتەیەکی بەسەردا نەچوو کە گورج خاڵە هەمزەم کە هەر لەبەغدا بوو لەژێر چاودێری حکومەتدا بوو لەشەریکەی کاك کمال ئیشی ئەکرد وەزیرە کوردەکان پاراستبویان گەیشتە لامان بۆ قوڕنە لەدوای ئەوەی خالەمحمدم جوابی بۆ ناردبوکە تقاعد کراوە.

خاڵە هەمزەم هەر گەیشت گوتی دەی خۆتان کۆکەنەوە ئەبێ لێرە نەمێنین و بڕۆین بۆ کەرکوك وولاتی خۆمان ئیتر بەسە غەریبی. بەتایبەتی کە وەزیرە کوردەکان و هەندێ عەرەبی ئاشنا و باشی حکومەتیان ڕازی کردووە کە بگەڕێنەوە بۆ کەرکوك. سید احمدی خانەقاە ئەویش فەرمویەتی کە بنێرە بێنەوە و واجێ و خانوشی بۆ حازرکردون. هەرچەند

خالەمحمدم گوتی دەتۆ جارێ ڕاوەستە ئاخر ئەو هەموو هاوڕیانەم دەوریان داوم و ئیشەکەم لەگەڵیان. خاڵە هەمزەم ڕازی نەبوو گوتی بۆ وسی ٚمانگش ڕازی نا کە لێرە بمێنینەوە.

خاڵە هەمزەم گەڕایەوە و گوتی ئەچم لەبەغدا چاوەڕێتان ئەکەم تاوەکو لەگەڵتان بێم بۆ کەرکوك.

ئێمە هێشتا خۆمان کۆ ئەکردەوە بۆ گەڕانەوە کە هەواڵمان پێ گەیشت کە خاڵە هەمزەم دیسان ئەمری گرتنی بۆ دەرچوو ئەویش خۆی وون کردووە وا بۆی ئەگەڕێن بەڵام ئێمە هەر ئەبێ بڕۆین بە شپرزەیی دڵێکی شکاو و پڕ مەراق خۆمان کۆ کردەوە و کەوتینە ڕێ بەرەو بەصرە لەوێشەوە بەشەمەنەفەر بۆ بەغدا. چەند ڕۆژێك لەبەغداماینەوە لەماڵی خزمێکمان زۆرتری بۆ هەواڵ پرسینی خاڵە هەمزەم چونکە ئەو خزمانەمان لەگەڵی بوون و ئاگایان لەهەموو کارێکی بوو. دوای دە ڕۆژێك دیسان بەشەمەنەفەر گەیشتینە کەرکوك یەکەم جار بوو کەرکوك ببینین لەماڵی جەنابی زۆر بەڕێز و زۆر گەورە و محترم سید احمدی خانقاە دابەزین خانوێکی زۆر گەورەو بەرینی دوو چینە بوو حەوشێکی زۆر زۆر گەورەیان هەبوو هەر ڕاست بەرامبەر بەخانقاە بوو ئێستەش ئەوخانو و خانقایە ماوە لەکەرکوك لەنزیك مەکتەبە گشتیەکەی کەرکوکە. خانقاە جێ میوان بوو کە خەڵکێکی زۆر ئەهاتن بۆلای جەنابی سەید احمدی هەروەها سێ ژەمەش فەقیری کەرکوك لەوێ کۆئەبونەوە بۆنان خواردن سەید احمدی خانقاە ئەو فەقیرو هەژارەی بەخێو ئەکرد و سێ ژەمە مەنجەڵی گەورە گەورە لەسەر ئاگردانی لەخشت دروست کراو ئەکولان و شۆربا و خواردن بۆ فەقیر دروست ئەکرا. سەید احمدی خانقاە شەخصێکی زۆر گەورە و بەڕێز و محترم بوو تاوەکو تورکمانی کەرکوکیش وەکو کەسێکی پایە بڵند و

مقدسیان سەیر ئەکرد و خۆشیان ئەویست ئەویش هەروەها زۆری خۆشەویستن.

سەید احمد كچێكی هەبوو گەورەی ماڵ و هەموو لایەك بوو ناوی مریەم خان بوو مریەم لن هەر بەرێتی شازادەیەك بوو بۆخۆی گە ڕەنگێکی باڵا بەرزی شیرینی زۆر خۆشەویستەنی بوو زۆر عاقڵ و سەلار و خوێندەوار بوو ژوورو تاقی هەمووی كتێبی جۆراوجۆر بوو بێجگە لەكوردی عەرەبی زۆرچاك و فارسیشی ئەزانی بە خوێندن و نوسین هەروەها سەید احمد سێ كوڕیشی هەبوو سید عبدالقادر كەوەفاتی كردبوو دوو كوڕ و كچێكی لەپاش بەجێ مابوو دوو كورەكەی كە ناویان عەزیز و صمد بوو دایكیان عەتیەخان بەڵام كچەكە كە ناوی نصرت بوو دوای بوو بەنەسرین هەر لەمناڵیەوە دایكی ئەمری خوای كردبوو زۆر نازدارو عەزیز بوو لەلای و هەروەها لای بابە گەورەشی كە جەنابی سەید احمدی خانقاه بوو نەسرین هاو عمری من بوو بۆیە كە چووین و یەكترمان دیت و بۆ چەند ڕۆژێك لەماڵیان ماین تاوەكو خانو و جێ و ڕێیان بۆ ڕێكخستین هەر زو بوین بە هاوڕێ و هەڤاڵی یەك و تاوەكو ئێستە خۆشەویسترین هاوڕێ و هەڤاڵمە نەسرین هەر بەڕاستی وەك گوڵەباخ و گوڵی تر وابوو تاوەكو ئەم تەمەنەم كەم كەسم دیوە و بەرچاو كەوتوە بەقەد نەسرین جوان بوبن تاوەكو بازیگەرانی زۆر جوانی سینەماشی هێشتا نەئەگەیشتنە نەسرین.

ماڵی سەید احمد دائم و هەمیشە جمەی ئەهات لەخەڵك و میوان و فەقێ. و هەرچی لەدێهات و دەوری شارو بگرە ناوشاریش ئەگەر شتێكیان بەسەر بهاتایە ڕایان ئەكردە لای سەید و هانایان بۆ ئەو و مریەم خانیان ئەهێنا.

خاڵە هەمزەم كە خۆی وون كردبوو دیسان گەڕابوەوە خانقاه و ژێر هیمەتی سەید احمد و هەر دەست بەجێ پاراستبوی و لەحكومەتی شاردبویەوە. بۆیە كە ئێمە گەیشتینە كەركوك و دامەزراین و چوینە ماڵەكەمانەوە. ئیتر خاڵە هەمزەم زو زو بەشەوان بەدزیەوە ئەهات بۆلامان سەری ئەداین جاری وا هەبوو شەوێكیش لەلامان ئەمایەوە ئێمەش زۆرمان پێ خۆش بوو دڵمان كرابوەوە و ئاواتمان هاتبوە دیی بەنزیكیمان لەخاڵە هەمزەم چونكە ئەو ژیان و زروفەی وای لێ كردبوین كە هەمیشە چاومان لەدوی بێت و دائم لەدڵ و دەرونمانا بێت و تێكڕا چاو بە فرمێسك بین بۆی بۆیە خاڵە هەمزەم هەر بوبو بە شەخصێكی ئەفسانەیی گران و ناوی بوبو بەناوێكی جادوی بەرزی بەرز كە هەمیشە ئاواتە خواز و لەئارەزوی ئەوە دابوین كە بەشكەم هەر بێتە خەومان نەك لەنزیكەوە بیبینین.

خالەمحمدیشم هەروا بێ ئیش و بێ كارمابوەوە بەڵام لەكەركوك هاوڕێ و ڕەفیقی زۆری هەبوو. هەر لەو برادەرانەی كە پێكەوە لەسوپا و كۆلێجەوە پێكەوە بوون تاوەكو برادەر و ناسیاوی كوردی دڵسۆز تاوەكو برادەرێكی زۆر خۆشەویستی هەبوو ناوی رەئوفی دەلاك بوو دوكانی دەلاك خانەی هەبوو و زۆر قسە خۆش بوو بیرمە چەند جارێك هاتە ماڵەوەمان پرچی دایكمی لول كرد ئەوسا پرچی لول مۆدەی بوو. خالەمحمدم زۆر دڵی بەوەستا رەئوف خۆش بوو زۆر بەقسە خۆشەكانی پێ ئەكەنی دیار بو لەدەمێكەوە وەستا رەئوفی ئەناسی لەوكاتەوە كە تازە دەرچوو بوبەئەفسەر و ڕەوانەی سلێمانی و دەوروبەری كرابو لەبەر شەڕی بەردەركی سەرا ئیتر بەرێتی بە تەواوی نازا لەكوێ و لەكەیەوە ئەیناسی بەڵام كە گەیشتنە كەركوك خاڵم وەستا رەئوفی دەلاكی دۆزیەوە زۆری پێ خۆش بوو.

سالێك بوو كە گەیشتبوینە كەركوك و خاڵە ھەمزەم حكومەت بە دوایا ئەگەڕا كە بیگرن زۆرجار بە ئاشكرا ئەیانزانی كەلەخانقایە حكومەت زاتی ئەوەی نەبوو كە بچن خانقاە بگەڕێن و بپشكنن بۆیە زۆرجار كەمین و بۆسەیان بۆ دائەنا كە بەشكەم كەھاتەلامان لەڕێگا بیگرن. زۆرجاریش ئەچونە دێیەكانی سەید احمد بۆی ئەگەڕان. وەكو سەرگەڵو. و دێھاتی تر كەلەپەنجا دێ زیاتری ھەبوو شەوێكیان خالەمحمدم درەنگ لەنادی گەڕایەوە زستان بوو كە دایكم دەرگای بۆ كردەوە پێش ئەوەی بێتە ژورێ لەدایكم پاڕایەوە و گوتی توخوا سەلیمە گیان لەڕێگا كە ئەھاتمەماڵێ ئەم سەگە بچوكەم شوێن كەوت بھێلەبێتە ژورەوە گوناحە لەحەوشەكە لەپەنایێك جێگای بۆ ئەكەین. بۆیە وا لەدایكم پاڕایەوە چونكە ئەیزانی دایكم و مامۆ و نەنە ھەموو نوێژكەرن و چۆن ئەھێڵن سەگ لەناو قاچ و قولیان لەماڵەكە بێت.

ماڵمان لەشاترلوبو خانوی توركمانێك بوو ناوی محمد بەگ بوو. دوای ئەوە محمد بەگ زۆر بەكەڵكما ھات لەدواییا باسی ئەكەم.

دایكیشم لەبەر دڵی خاڵم گوتی قەیناكا بابێت و سەگە بچكۆلی ھێنایە ژورێ. لەناو حەوشەكەمان كە خانوێكی قەدیمی سەرگومەزەكانی كەركوكی شیرین بوو لەناوڕاستی حەوشە خۆشەكەی باخێكی چوار گۆشەی تیا بوو قەراغ باخەكەشی شورەكرا بو بەدار بۆیە سەگەكەیان لەناو باخەكە داناو ھەربەو شەوە شوێنێكی وەك پەنایان بۆ دروست كرد لەبەر باران.

لەگەڵ سەگەكە ڕاھاتین من و ڕێسانی خوشكم ناومان نا چاكی ئیتر نان و خواردن و شتمان ئەدایە چاكی وردە وردە گەورەبوو بو بەسەگێكی قاوەیی جوانی خرپن بەڵام لەسەگە بچوكەكان بوو لەسەگە زلەكان نەبوو. ھەموومان زۆرمان خۆش ویست و لەگەڵی ڕاھاتین.



دراوسیێ دوو خانومان بەین ماڵی ئەمین ڕەواندوزی بوو ناجیە خانی ژنی ڕەفیق و دەستە خوشكی دایكم بوو كاتی مناڵی و دەربەدەری كەلەتوركیاوە ڕایان كردبوو لەبەرشەڕی عالەمی یەكەم بۆیە زۆر ڕێكەوتێكی خۆش بوو بۆ دایكم و ناجیە خان زۆر دڵیان بەیەك خۆش بوو بۆیە زۆر ھاتوچۆی یەكیان ئەكرد بەتایبەتی خالەمحمدم و ئەمین ڕەواندوزی دراوسیێ ھەندێك لەسەرومانەوە ماڵی علی عبدالعزیز بوو برای شەھید عزەت عبدالعزیز بو كە لەگەڵ سێ ئەفسەری ھاوڕێ حكومەتی بەدناوی عێراقی لەسێدارەیان دان. كە پێمان ئەگوت خالەعلی ئەوانیش زۆر تێكەڵ بوون لەگەڵ دایكم و خاڵم ژنێكی ئێسك سوكی ھەبوو ناوی عەتیە خان بوو دایكی ناوی صافیە خان بوو. بوك و خەسو لەگەڵ یەك ڕێك نەبوون زو زو صافیە خان ئەھات بۆلامان لەگەڵ مامۆ و دایكم و ئەوان ئەكەوتە باسی بوكەكەی و ناڕەزایی خۆی دەرەبڕی مامۆش ئەكەوتە دڵدانەوەی و خاوی ئەكردەوە و دڵی چاك ئەبوو ئەچوەوە ماڵێ ئەوەندەی پیێ نەچو عەتیەخانی بوكی ئەھات كەلەكچە خانەدانەكانی ئامێدی بوو ئەویش ئەكەوتە گلەیی و بۆڵەبۆڵ لەخەسوی كە چەند دەست گیرە و چەند ڕەزیلەو ئەم ناتوانێت ئەو كردەوانەی قبوڵ كات. ئینجا دایكم و مامۆ ئەكەوتنە خاو كردنی ئەمیش و دڵیان ئەدایەوە و ئەچوەوە ماڵ ئیشكەرێكیشیان ھەبوو ناوی ئامۆ بوو ئەویش ھەر بەوا ئەگەیشت بێریڤانی كچی عەتیەخان كە مناڵێكی ئێسك سوكی دو سێ سالەبوو ئەیدا بەكۆڵیا و ئەیھێنایە لامان.

ڕۆژێكیان خالەمحمدم لەدەرەوە بوو ھاتەوە ماڵێ و گوتی حكومەت دایانمەزراندوم بە مأموری ( تموین ) تموین بەو دەزگایەیان ئەگوت كەلەبەر زروفی شەڕی دووھەمی جیھانی و كەم بونی دەرامەت بە بلیت

خواردن و کەل و پەل بدەن بە هاوڵاتی. بۆیە ئەو دەزگایە لەهەموو شارێك هەبوو.

دیسان دیارە کوردە دەست رۆیشتە باشەکان لەبەغدا بوون سەریان کردبوە سەرحکومەت و وا خالەمحمدیان دامەزراند بوو کە بچێت بۆ ناحیەی قەرەتەپە بۆیە خالەمحمدم رۆیشت بۆ قەرەتەپە نەنەش چو لەگەڵی کە ئاگای لێ بێت و بەدیاریەوە بێت. قەرەتەپە نزیکی کەرکوك بوو بۆیە خالەمحمدم هەموو پێنج شەممە و جومعە سەری ئەداین. ماڵی سەید احمدی خانقای بەڕێز و جوامێر هەر زو کە هاتبوین بۆ کەرکوك ژن و کوڕێکی بۆ ناردین کوڕەکە عمری دە ساڵ ئەبوو ناوی ئەنوەر بوو دایکیشی ناوی فاتمە بوو. بەڵام هەر لەچاو خۆمان بە تەنیا ماینەوە هەرچەندە خاڵە هەمزەم زو زو بەشەو بە دزیەوە سەری ئەداین و هەروەها دوو کوڕی خزمیشمان کە هەر بەدوای خاڵە هەمزەوە بوو لەلاشمان بوو لەگەڵ کوڕێکی تر کە ناوی حەمید باتاس بو ئەو دوانە دەست و یاریدەدەری خاڵم بوون هەروەها ئاگاشیان لەئێمە بوو.

لەو بەینە لەپڕ خاڵە هەمزەم نەما دیار و ئیتر نەهات سەرمان بدات هەرچەندە ناردمان پرسیمان لەهاوڕێ و برادەرانی کە ئەمانزانی پەیوەندی پێ یانەوە هەیە کەس هیچی پێ نەگوتین و هەروا بێ ئارام و نارەحەت ماینەوە. خالەمحمد هات سەری داین کە هەواڵی خاڵە هەمزەمان لێ پرسی گوتی شکور سەلامەتە و نارەحەت مەبن چوە بۆ سەفەرێك دیارە ئەو ئەیزانی بەڵام ڕاستیەکەی پێ نەگوتین هەر ئەوەندە دڵنیای کردین.

حکومەت و پۆلیس و ئەمن سەریان کردە سەرمان لەبەر خاڵە هەمزەم دەوری ماڵیان داین و هەر لەو ناوانە بوون کە هێشتا خاڵە هەمزەم لەکەرکوك بوو گواستمانەوە بۆ خانوێکی تر هەر لەو گەڕەکە لەشاترلو هەندێ سەروی کۆنەکەمان ئەمیان هەر زۆر خۆش بوو باخێکی زۆر



گەورەی هەبوو کە دەرکی ماڵەکەی لەسەر بوو دەرکی پشتەوە نەك هی حەوشە باخەکە هەموو هەر درەختی زەیتون بوو جۆگە ئاوێکیش بەناوی تێ ئەپەڕی لەو دیویش تا چاوبڕکات باخی سڵق و خیارو دەلو بیبەرو سەوزە جوانەکەی کەرکوك بوو زۆرجار کە پێویستان بەو شتانە ئەبو لەپەنجەرەکەوە یاخود لەباڵقۆنەکەوە دایکم بانگی باخەوانەکەی ئەکرد کە ناوی یەکێکیان حەسەن بوو پێی ئەگوت ئەوەندە دەسك سڵق و ئەوەندە خەیار یا دەلو بیبەرمان بۆ بنێرە زۆر خۆش بوو ئەو خانوە بەتایبەتی بۆ سەگە جوانەکەمان جاکی کە گەورە بوبو لەخۆشیانا لەناو ئەو باخە خۆشە گەورەیە هەر رایەکرد و کەیفی ئەکرد.

ئەمن و پۆلیس بەو خانوەشمان فێر بوون و شەو ئێشکیان ئەگرت بەشکەم خاڵمیان دەست کەوێت بەڵام جاکی گەورە بوبو بۆیان ئەچو پێیان ئەوەڕی و ئەیکرد بە هەرا زۆرجار کە دایکم بەیانی ئەچوە باخەکە نان بدات بە جاکی سەیری ئەکرد لەسەر دیوارەکەوە لەکۆڵانەوە نان و ئێسقان و کەباب یان بۆ جاکی هەڵداوە بەشکم بیخوات و پێیان نەوەڕێت.

بەڵام جاکی دەمی بۆ نەئەبردو هەر پێیان ئەوەڕی و ئاشکرای ئەکردن.

خاڵە هەمزەم نەما دیار و ئیتر نەهات بۆلامان ئێمەش هەرچەندە خالەمحمدم دڵنیای کردبوین کە سەفەری کردوە و سیحەتی باشە بەڵام هەر لەمەراقابووین و ئەترساین. و خەفەتمان بۆ ئەخوارد ئاخری ناچار خالەمحمدم گوتی ئەبێ بێن لەگەڵم بۆ قەرەتەپە هەرچەندە ناحیەیە و وەك لادێ وایە بەڵام ئێمە بێ تاقەت بوبوین و حکومەتیش ئەوەندەی تر سەری کردبوە سەرمان و دەوری ماڵیان دابوین و شەو رۆژ لەژێر چاودێری دابوین. بۆیە ئێمەش پێمان خۆش بو کە لەگەڵ خاڵم بڕۆین بۆ ئەوێ هیچ نەبێت بۆ چەند مانگێك تاوەکو بمانزانیایە کە دوای چی بکەین.

ماڵ کۆکرایەوە و خرایە ماڵی ئاشنایێکمان کە زۆر خاڵە هەمزەم هاتوچۆی ئەکردن و زۆری هاوڕیەکانی لەو ماڵەئەبینی هەروەها ژنێکی خەڵکی دهۆکیش هەر هاتوچۆی ئەکردین ناوی زەکیە بوو چاوی سەوز بوو زۆر خۆشەویستەنی بوو ئەو باجی زەکیەیە هەمیشە ئەترسا و توشی گرێ بوبو کاتی خۆی لەدهۆك ڕای کردبو چونکە شوی بەکوڕێکی گاورکردبو هەرچەندە بۆشی بوبو بەئیسلام بەڵام کەسوکاری ویستبویان بیکوژن بۆیە خۆی و مێردەکەی ڕایان کردبوو هاتبون بۆ کەرکوك لەوێ ئیشیان ئەکرد و خاڵەعلی عبدالعزیز کە ئەویش لەسوپا ئەفسەر بوو ئاگای لێیان بوو هەڕەشەی لەکەس و کاری کردبوو ئیتر وازیان هێنابوو لەباجی زەکیە و عەبدوڵڵا ی مێردی. باجی زەکیە بوبو بەدڵسۆزێکی زۆر خۆشەویستمان و مێردەکەی ئاشنای ئەو ماڵەبوون خاڵە هەمزەم لەوێ هاوڕیەکانی ئەبینی باجی زەکیەش و مێردەکەشی یارمەتی خاڵە هەمزەیان ئەدا و کارەکانیان بۆ جێ بەجێ ئەکرد بەدزیەوەو دڵسۆزی بوون.

زۆری ئەو ڕۆمانانەی تا ئێستە نوسیومن زۆریان لەزروفی ئەوساوە هەڵقوڵاون بەتایبەتی لەدایك و کوڕا زۆری شێوەی حەمەی پاڵەوانی ڕۆمانەکە لەزروفی بەسەرهاتی خاڵە هەمزەمەوە هەڵقوڵاوە هەروەها ڕێبوارێکی سەرگەردانیش زۆری لەزروفی خاڵە هەمزەمەوە هەڵقوڵاوە. بۆیە ڕۆمانەکا□□ هیچیان خەیاڵی و دور نین هەر ئەوەیە من کەرەسەیەکی زۆرم پەیدا کردوە لەو ژیانە نالەبارەی خۆمی تیا ژیاوم ئینجا هەر نوسەرە ئەو کەرەسەیەی کە پەیدا ئەبێت لەناو دەرونیا وەکو کەرەسەی بینا دروست کردن وا ئەبێت ئینجا ئەوە ئەمێنێتە سەر نوسەرەکە خۆی و زەوق و لێزانینی بۆیە نوسەری وا هەیە بەو کەرەسەی بینایەی کۆشك و تەلاری پێ دروست ئەکات هی واش هەن کە تەویلەو ئاخوڕی پێ بینا ئەکەن کە



بریتی ئەبن لەدرۆو دەلەسە و فس فس پاڵەوانی و خۆ هەڵکێشان کەسەری مرۆڤی پێ سپی ئەبێت و شاخی لێ دەڕوێت کە ئەو درۆو فیشاڵانە ئەخوێنێتەوە.

ئاخری ئامادە بوین بۆ سەفەر لەگەڵ خاڵم بۆ قەرەتەپە کەوتینە گیژاوی ئەوەوە کە جاکی گەورە بوبو ئیتر نەئەبو لەناو ماڵابێت ئەویش وەك لادێ وابوو دوایی وامان بەباش زانی کە بیدەن بە ماڵی خاڵەعلی و کەگەڕاینەوە بمان دەنەوە چونکە ئێمە بۆ ماوەیەکی کەم ئەچوین هەروەها ماڵی خاڵەعەلیش زۆرجاکیان خۆشەویست و دڵنیا بوین کە زۆر ئاگایان لێ ئەبێت هەرچەندە زۆریش بۆی گریاین من و ڕێسان بگرە دایکیشم زۆری خۆشەویست بەتەنگیەوە بوو. نیوەڕوان لەباخەکەوە دەرکی باخەکە نزیك چێشتخانەکە بوو کە گوێی لەدەنگی قاپ و کەوچك وشت ئەبوو ئەیزانی کە خەریکی سفرە دانانین بۆیە لەباخ ئەهاتە بەردەرگای هەیوانەکە و پیا ئەکێشا و خۆی پیائەداو ئەیکرد بەهەرا هەروەك بڵێت ( خەریکی نان خواردنن منیش برسیمە )دایکم بەپەلەقاپەکەی بۆ پڕ ئەکرد بەدەم قسەی نازو لاواندنەوەوە بۆی ئەبرد و ئەیخستە بەردەمی.

هەروەها لەبەردەرکی حەوشەکەشمان لەکۆڵان سەگێکی گەورەی زلحۆرتی زەعیفی لێ بوو زۆرجار دایکم بەزەیی پیا ئەهاتەوە و ئەچوو چێشت و ئێسقان وخواردنی بۆ ئەبرد و بۆی دائەنا لەبەردیوارەکە لای دەرکی حەوشەکەمان ئەوەندە ئەوسەگە زەعیف و داماو و زلحۆر بوو دایکم ناوی نابوو حۆلان ئیتر حۆلان هەمیشە لەوبەر دەرگایەمان و لەو کۆڵانەمان بوو زۆرجار ئەگەر بچوینایە بۆ بازاڕ و شوێنێك لەنیوەی ڕێگا سەیر ئەکەین حۆلان شوێنمان کەوتوە ئێمەش دەرمان ئەکرد و لێی توڕە ئەبووین ئەترساین بکەوێتە ژێر ئوتومبێل و عەرەبانەیەك.

رۆژی سەفەرمان هات و هەموو ئامادەبوین خالەمحەمدم هاتبو بەدوامان لەگەڵ پیاوکێش کە ئیشی بۆ ئەکرد هەروەها دوو کوڕەکەی خزمیشمان هەرچەندە حەمید باتاس خزممان نەبوو بەڵام لەزۆر خزمان خۆشەویستر و دڵسۆزترمان بوو هەروەها خزمی ڕاستیشمان نایف عەبدوڵلاٚ کە خزمێکی دووری باوکم بوو خەڵکی زاخۆ بوو هەردوکیان یاریدەدەری خاڵە هەمزەم بوون و تێکڕا لەوانە بوو هەمووکاتێك توشی روداوی پڕمەترسی و گرتنی بونایە لەبەر خاڵە هەمزەم لەبەر ئێمە کە بەدیارمانەوە بوون. نایف لەگەڵمان هات حەمید باتاس لەکەرکوك مایەوە و خەریکی کەل و پەلی ماڵەکەمان بوو ئێوارەبوو کەوتینە ڕێ بەرەو ئێستگەی شەمەنەفەری کەرکوك دونیا ساردبو باران ئەباری بەسێ عەرەبانە کەوتینە ڕێ چونکە ئەوسا زۆری هاتوچۆ لەجیاتی تاکسی ئیتر هەر بە عەرەبانە خۆشەکانی ئەوسا بوون کە دو وڵاخ رایەکێشا کەسێك ئەیتوانی لەلای عەرەبانچیەکە دانیشێت دیارە ئەبوو پیاو بوایە و چوار کەسیش لەپشتەوە. بەڕاستی زۆر خۆش بوو بەتایبەتی کەلەکاتی رۆیشتنا تەقەتەقی پێ و سم و ناڵی وڵاخەکان بە ئاوازێکی خۆشی تایبەتی ئەهاتە بەر گوێی رێبواران.

گەیشتینە ئێستگەی شەمەنەفەر کەبەردەم و ماوە و پانایێکی پان و خۆش و پاك رازاوە بوو بەفلکە و گوڵ گوڵزا بەدەیان عەرەبانە و ئوتومبێل و خەڵك لەو شوێنە هەموو دائەبەزین بەجانتاو کەل و پەلەوە و ئەچونە ناو بینای ئێستگەکەوە بۆ بلیت بڕین و سوار بوون هەروەکو هی فلم و سینەماکان بوو ئێستە لەدوای پەنجا ساڵ زیاتر ئەو شوێنە رازاوە خۆشانە بونە بەزبڵ خانەو کەلاوەو کاول کەری بەعسی دوابڕاو لەجیاتی وڵات دوای ئەو هەموو سالەخۆشتر و ئاوەدانتر بوایە کەچی حاڵی بەم حالەگەیشتوە کەرکوکی ڕەنگین و شیرین ئەوکاتانە ئەتگوت شاری گوڵ و



گوڵزار و خۆشی و جوانی دونیایە. ئاواتە خوازم دیسان وای لێبێتەوە و خۆشتریش بێتەوە.

هەرچۆنێك بوو ئێمەش هەموو دابەزین لەعەرەبانەکانمان و ئەو کەل و پەلەسوکەڵانەی کە پێمان بوو پیاوەکان پەلاماریان دا کە بیان بەنە ژوری ئێستگەکە نەنەو مامۆ و دایکم و من و رێسان بوین بێجگە لەخاڵم و سێ پیاو بەنایفی خزمانەوە خەریکن بڕۆین کەسەیر ئەکەین سەگێك لەناو قاچ و قولمانا هەر دێت ئەڕوات ئێمەش زۆر سەرنجمان نەدا و هەر ئەڕۆیشتین بەرەو بیناکەی ئێستگەکە نەنە توڕەبوو گوتی ئەمە چیە ئەم سەگە بۆ وازمان لێ ناهێنێت و هەندێ توڕە بو لێی لەپڕ دایکم بەشپرزەییێك و دڵپێوە بونێکەوە بەدەنگی بەرز گوتی وەی خۆ ئەمە حۆلانە. تمەز حۆلان لەشاترلووە شوێنی عەرەبانەکەمان کەوتوە تاوەکو ئێستگەکە کە زۆر دوور بوو بەو شەو و بارانە و لەسەر ئەو هەموو شەقام و جادانە رای کردوە بە دوامانا. هەر هەموومان نارەحەت بوین بۆیە خالەمحەمدم گوتی بەخوا ئەگەر بەدزیەوە خستومەتە ناو ژووری فارغونەکەوە هەر ئەبێ بیبەین ئەگینا ئێمەش ناڕۆین زۆر دڵی بۆی سوتا خالەمحەمدم زۆر سەگی خۆشەویست کەلەبەغدا و معەسکەرو ناو لەشکریش بوو سەگی هەر هەبوو بۆیە پیاوەکان چوون بە لێپرسراوەکانی بلیت بڕەکانیان گوت کە شتێکی وایە و ئەبێ ئەم سەگە بەرین لەگەڵ خۆمان. حەزئەکەن بۆ ئەویش بلیت ئەبڕین. یەکەم جار هەندێ بۆلەبۆڵیان کردو گوتیان نابێت دوایی ڕازی بوون و گوتیان کەوا ژووری تایبەتی خۆتان هەیە ئەتوانن بیبەن.

گەیشتینە قەرەتەپە لەگەڵ حۆلان. حۆلان چونکە لەکۆڵان بوو فێری کۆڵان بوو بۆیە زۆر بە ئاسانی توانیمان چارەسەری بکەین ئیتر حۆلان لەبەر دەرگاکەمان بوو لەقەرەتەپە ماڵەکەمان لەسەر پەڕبوو خانوێکی گەورەی قەیمی بوو. خەڵکی قەرەتەپە زۆر زۆر خەڵکی باش بوون هەروەها

خەڵکی زۆر ئاشنا و ناسراوی لێ بوو وەکو عائیلەی ونداوی دوو سێ خێزانی بە ناوبانگی تر لەو چەند مانگەی خالەمحمدم لەوێ بو بوبون بە ئاشناو ناسیاوی و زۆر بەتەنگەوەی بوون بەتایبەتی کە زانیان کە حکومەت چۆن دژایەتی ئەکات و چەند خراپن لەگەڵمان و باسی خاڵە هەمزەیان ئەزانی بەتایبەتی هەندێ لەوەنداویەکان هاوڕێی خاڵە هەمزەبوون کاتێ کەتەلەبەی حقوق بو لەبەغدا.

ئیتر هەموو ماڵەکان هاتن بۆلامان و هەر خەریکی چێشت و دەعوەت و سینی و خواردن ناردن بون مدیر ناحیەکەی ناوی ئەمین یامڵکی بوو زۆر پیاوێکی فەقیر و بەحورمەت و باش بوو ژنەکەی ناوی فاتمە خان بوو دوکچی گەورە و سێ کوڕیان هەبوو. هەروەها مفەوەزی شورتەش کە ناوی حەمە سەعید قازی بوو خەڵکی سلێمانی بوو ئەویش زۆر پیاو و دڵسۆزمان بوو کاك حەمە سەعید دوو ژنی هەبوو ژنێکی فاتمە خان بادینی بوو و ابزا خەڵکی دهۆك بوو ژنی دوهەمیش ناوی دولبەر خان بوو خەڵکی سلێمانی خوشکی عەزیزی میرزا صالح بوو. بەهەردو ژن مناڵیان هەبو و پێیان خۆش بو کە چوین و یەکترمان دیت بەتایبەتی بادینیەکە هەر زۆر دڵی خۆش بوو لەخۆشیانا کە ئێمەش بادینین و ئێمەی بەپشت و پەناى خۆی ئەزانی و ئەیگوت وائەزا هەموو کەس و کارم هاتون و پشتیان گرتوم.

ئەگەرچی کاك حەمە سەعید فەرقی نەئەکردن و زۆر ئاگای لەماڵ و مناڵی بوو. بەڵام ژنەکانی زۆر لێی ئەترسان چونکە زۆر شەڕی لەگەڵ ئەکردن و لەهەردوکیانی ئەدا.

بۆیە من ئەم رود و انە ئەزا چونکە هەموویان ئەهاتن بۆلای دایکم و سکالایان بۆ ئەو ئەکرد و دایکم زۆر ژنێکی ڕوخۆش و دڵ پاك و چاك و دەست و دڵ بازبوو زۆریش بەتەنگ خەڵکەوە بوو زۆر بەپیر تەگەرەو



نارەحەتیەوە ئەچوو لەگەڵ ئەوەشا کە ئەو ژیانی نائارامی و پڕ لەستەم و ئازاری ئەو لەژیانی هەموو ئەو کەسانەی تر ناخۆش تر بوو لەگەڵ ئەوەشا زۆرگوێی ئەدایە دڵ ڕاگرتنی و بەپیرچونەوەی تەگەرەو ناخۆشی کەسانێ کە هانایان بۆ ئەبرد. قەرەتەپە مەکتەبی کچانی لێ نەبوو تەنیا تاوەکو سنفی سێ و چواری سەرەتایی لێبوو ئەویش تازەبو یەك موعەلیمەی هەبوو ناوی ختام بوو خەڵکی موسڵ بوو دایك و باوك و خوشك و براشی لەگەڵ بوو لەدوو ژووردا بوون لەناو مەکتەبەکە مەکتەبەکە تازەو خۆش بوو زۆر نزیك ماڵی ئێمە بوو.

باوکی ختام ناوی خەسرەو بوو شتی زۆر بیر ئەچوو بازاڕەکەش زۆر نزیکیان بوو کە وەکو پێیان ئەگوت بڕۆ بۆ بازاڕ شتێك بۆ ماڵەکە بکڕە ئەچوو لەبیری ئەچوو بۆچی هاتووە ئەچو لەجیاتی چایخانەیەك دائەنیشت جاری وا هەبو قوماریشی ئەکرد کە ئەگەڕایەوە یاخود کوڕەکەی ئەچوو بە دوایا و ئەیگوت ئەوە چیت لێهات لەماڵەوە چاوەڕێت ئەکەن کوا شت وەکو گۆشت بێ یا چا ئیتر ئەو شتانەی ماڵ و خێزانی لەسەری ئەژیان و پێویستیان پێبوو هەڵەستاو ئەیگوت :ۆش تی چی ؟ وا بیرم نیە جاری واهەبوو پارەکەشی ئەدۆڕاند لەقومارا خۆشیان فلسیان نەبوو لەمعاشی ئەو ختامە فەقیرە زیاتر مامی ختام حاکمێکی بەناوبانگ بوو لەسلێمانی ناوی حاکم_شیت بوو قەرەتەپە ئاوی زۆر نەبوو هەر مالەبیرێکی لەحەوشەدا هەبوو ئاوی بیرەکەشی هەندێ سوێر بوو بۆیە ئیش و کارو جل شتن و سەر شتن و هەموو کارێکی تر ئاوی بیرە کەبوو تەنیا بۆ خواردنەوە پیاوێك بەتەنەکە ئاوی بۆ ئەهێنایەن و ئەیخستە کوپەوە ئاوەکە زۆر لێڵ و قوڕاوی بوو بۆیە دایکم پارچە ( شەب )ی تیا ئەتواندەوە تاوەکو پاك و ڕون بێت شەب تەعقیمیشی ئەکرد لەمیکرۆب و شتی وا.

ئێمە سەر پەڕ بووین دراوسیٚ دوهەممان ماڵی حاجییێك بوو ماڵێكی بە حورمەت و دوكچی گەورەی جوانكەڵەیان هەبوو هەموو جلی درێژو دەستوری ئەوێیان لەبەردابوو ماڵی سێهەم ماڵی جولەكەیەك بوو ناوی موشی بوو تاقە كچێك و دوو سیٚ كوڕی هەبوو هەر لەبەیانی زوەوە تاوەكو شەویٚ كاتی نوستن ئەو ژنە فەقیرەی موشی دەنگی ئەهات و هات و هاواری ئەبوو بەدەست مناڵەكانیەوە.

هەر جنێوی پیٚ ئەدان و هەر دەنگی شتی فڕێدان و گرمەی دەرگاو شەقی دارو بەرد و شت شكاندن بوو كە هەمو مناڵەكانیشی گەورەبوون موشی زۆر هاتوچۆی خالەمحمدمی ئەكرد زۆرجار لەگەڵ خۆشی ئەیهێنایە كەركوك ماڵی ئێمە ئەو پێنج شەمەو جومعەیەی كە ئەهات لەگەڵ خاڵم بۆلامان كەلەكەركوك بوین زۆرجار كە موشی ئەهات لەبەر خاڵم كە میوانی ئەوە ئەبو جێگا و رێگای باشی بۆ دانێن لەچینی سەریٚ ژورێكی میوانی زۆر گەورە و خۆشمان هەبوو كە ئەیڕوانیە سەر ئەو باخە خۆشەی خۆمان و باخە گەورەكەی سەوزیمان لیٚ ئەكڕی دایكم لەو ژورەوە جێگایان بۆ موشی دائەخست و نوێنی پاك و جوان و رێك و پێكەكانی دایكم كە زۆربە سەلیقە و یەكجار ئیشەكانی هونەرمەندانەو رێك وپێك بوون سەر جێگای جوانی بۆ بەسەرئەدا ئیتر كە بەیانیان ئەچون نوێنەكانی هەڵگرن دایكم ئەكۆكی و ئەیقیڕاند و خەریك ئەبو بڕشێتەوە و ئەیگوت هاوار وەرن بۆنی شوێنی قاچی موشی ئاگر تێبەربو بكەن بزانن چەند نوێن و لێفەو شتەكانی بۆگەنی كردووە. دیارە كە موشی و خاڵم ئەگەڕانەوە ئیتر ئەبو بەهەراێك و پێكەنینێك نەبێتەوە حەمید باتاس ئەیگوت بەخوا ئەم جارە بێت دەری ئەكەم بەلاٚم ئەی چۆن ئەوێرم لەبەر خالەمحمد هیچی پیٚ بڵێم هیچ نەبێت پێی ئەڵێم گەمالەزلەبڕۆ قاچە بۆگەنەكانت بشۆ.



موشی زۆر زل و قەڵەو درێژ بو جلی كەركوكی لەبەر ئەكرد كەوا و چاكەت و ئەوشتانە.

سەفەرێكیان كە هێشتا لەكەركوك بوین خاڵم هاتەوە نەنەشی لەگەڵ خۆی هێنابوەوە نەنە دوای ئەوەی خاڵم چوە سەری بشوات و بنوێت هاتە لای دایكم و مامۆ و ئێمە و بەئەسپایی گوتی : كچیٚ دایكم وەرن فریای محمد بكەون بەخوا موشی خەریكە كچەكەی بەسەردا ساغ ئەكاتەوە هەموو ماڵەكەمان و خواردن و هەرچیەكمان هەیە هەمووی ڕەوانەی ماڵی موشی ئەكرێت كچەكەی موشی ناوی نعیمە بوو خرپنێكی ئێسك سوكی جوان بوو عمری بیست ساڵێك ئەبو یا زیاتر بوو دایكیشم بەنەنەی گوت ئینجا قەی چی ئەكات ئەگەر كچەكە جوانە با محمد بیهێنێت. نەنە ئەیگوت مشى و ابزا□□ بهمطيةتى.

ئیتر كە ئێمە چوین بۆ قەرەتەپە ئەوەندە پەیوەندیان لەگەڵ موشی نەما موشی كەم كەم ئەهات بۆلامان ژنەكەشی هەر قیڕەی ئەهات. بەلاٚم خاڵم بەسەزمانە لەبەرئەوەی دیسان حكومەتە دوا بڕاوەكە خەیاڵی داییٚ و دیسان كەوتینە گێژاوەوە ئیتر كچی موشی و هەموشتێكی لەبیرنەما. خالەمحمدم هەر بەوەدا ئەگەیشت كە مدیری ناحیە ئەمین یامڵكی و حەمە سەعید قازی كە مفەوەزی شرطە بوو بەدڵ پێوە بونەوە بێن و بڵێن فەرمان هاتووە لەسلێمانیەوە كە بچن لەویٚ متصرف( محافز )ناردویەتی بە دواتا كە بەپەلەبڕۆی بۆ ئەویٚ بۆ لێپرسین و( تحقیقات ) متصرفی سلێمانی ناوی معروف جاووك بوو زۆر زۆر هەڵوێستی خراپ بو بەرامبەر بە خەباتكەرانی كورد.

بە پێچەوانەی هەندیٚ كاربەدەستی حكومەت كە كورد بوون و بگرە هی عەرەبیش هەبوون كەلەبنەوە زۆر یارمەتی خەباتكەرانیان ئەدا كە یەكێكیان سەعید قەزاز بوو كە ( متصرفی ) موسڵ بوو كاتیٚ كە خاڵە

هەمزەم جنسیەی عێراقی لێ سەندرایەوە و نەفی کرا بۆ تورکیا و توانی بەهۆی چەند پۆلیسی دڵسۆز لەئاوی خاپور بدات و بگەڕێتەوە زاخۆ و موسڵ سەعید قەزاز لەبنەوە زۆر یارمەتی دابو کەچی ئەم معروف جاوکە دو سێ هەفتەی جارێك ئەبو خاڵم بچێت بۆ سلێمانی و ئەم خۆی ( تحقیقاتی ) لەگەڵ بکات لەبابەت خاڵە هەمزەمەوە کە بۆ کوێ چوە و ئێستە لەکوێیە ؟

زۆر باش بیرم دێت ساڵی ١٩٤٥ بوو. جارێکیان کە خاڵم دیسان خۆی ئامادە ئەکرد کە بچێت بۆ سلێمانی چونکە ( جەنابی متصرف )ناردبوی بە دوایا. لەو کاتەی کە خالەمحمدم ئەیویست بڕوات و خواحافیزی لەگەڵ کردین. دایکم لێی هاتە پێشەوەو گوتی : محمد ئەڵێن ڕۆنی سلێمانی زۆر خۆشە وەکو باسی ئەکەن بەشکەم تەنەکەیەکمان لەگەڵ خۆت بۆ بێنی. خاڵم پێکەنی و گوتی : عەزیز زۆرجار خالەمحمدم بەدایکمی ئەگوت عەزیز چونکە زۆری خۆشەویست خاڵم گوتی : عەزیز قسەکەت لەو حەکایەتە ئەچێت کە جارێك سوڵتان ئەنێرێت بە دوی پیاوێکا و ئەڵێن وەرە تۆ خەتایێکی گەورەت کردووە و چیت کردووە و سوڵتان زۆر توڕەیە لەوانەیە لەسێدارەت بدات بۆیە دوعا خوازی لەماڵ و مناڵت بکە. لەو کاتەدا کچە گەورەکەی کە دابویان بەشو ئەبوو چەند ڕۆژی تر بگوێزرێتەوە بۆ مێردەکەی لەباوکی داماوی دێتە پێشەوە و ئەڵێت توخوا بابە گیان کراسێکی زۆر سورم بۆ بێنە لەگەڵ خۆت بیرت نەچێت. خاڵم کە نەیەویست خەفەتمان بداتێ و ڕاستی ئەم هاتوو چۆیەمان پێ بڵێت کە چەند نارەحەتی ئەو معروف جاووك کەیە کە چەند سەرەکاتە سەری ئەوکات ئێمە هێشتا سلێمانی و ئەو ناوچانەمان نەدیبوو چونکە کە نەفیان کردین بۆ خوارووی عێراق و صحرای عفك هێشتا هیچ کوێمان نەدیبوو لەبەغدا و موسڵ زیاتر کە بەشێکی مناڵیم لەگەڵ نەنکم و



خاڵەکا[illegible] کە لەکولیەی عەسکەری و حقوق بوون لەبەر ئەوان نەنکم و نەنە بەماڵەوە ئەچوون بۆ بەغدا هەروەها زۆریش لەموسڵ بوین ئەویش لەبەر خالەمحمدم کە بەینێك لەمعەسکەر غزلانی بوو پورێکیشم لەموسڵ بووە. بەشێکی کەمیش لەزاخۆ لەبەرئەوە نەمان ئەزانی سلێمانی لەکوێیە و چۆنە بگرە کە بۆکەرکوکیش هاتین یەکەم جار بوو ئێمە کەرکوك ببینین بەڵام خاڵەکا[illegible] زۆریان دیبوو.

خالەمحمدم کە ئەچوە سلێمانی بۆ پرس و پرسیار و دەست بەسەری متصرف و دەزگاکانی حکومەت. لەسلێمانی خەباتکەرانی کورد بەتایبەتی ( مامۆستا ئیبراهیم ئەحمدی نەمر ) زۆر ئاگایان لەخالەمحمدم ئەبو و زۆر لەژێرەوە و بەپەرۆش ئەبوون بۆی بەتایبەتی کە ( مامۆستا برایم ئەحمەد) هاوڕێ هەڤاڵی خاڵە هەمزەم بوو لەکولیەی حقوق و کاتی خۆی چالاکیان هەبوو پێکەوە و یەك دوجاریش پێکەوە گیرابوون و حەپس کرابوون لەسەر امیلکە دەرکردنێك بەبشی نازا[illegible] لەسەرچی گیرابوون ذ کام نامیلکە بوو. و ابزا[illegible] نامیلکەی ولعرب ولکرد (اوو ب.

قەرەتەپە وەکو لەوەوپێش گوتم دێیێکی زۆر دواکەوتو بوو هەرچەندە ئەو ماڵەخانەدانانەشی لێ بوو زۆری هەرباخ و باخات و موڵکی ئەوماڵەنەبوو هەرکەگەیشینە ئەوێ ژنێکی زۆر باشیان بۆ هێنایین کە خەڵکی دێهاتی دەوروپشتی قەرەتەپەبو کوردی ئەوناوە بوو هەروەها کوڕێکیشی هەبوو لەمەکتەب بوو دە یانزە ساڵێك بوو قەرەتەپە مەکتەبی کوڕانی لێ بوو تاوەکو(متوسطە ) ناوەندی بەڵام کچان تەنیا تاوەکو سنفی سێی سەرەتایی بۆیە کوڕی ئەوژنە کە ناوی رەحیم بوو هەموو ڕۆژێك ئەبوو بچێتە دێیەکەیان بۆ نوستن و بەیانیان لەو دێیەوە کەنزیك نەبوو بێت بۆ قەرەتەپە بۆ مەکتەب لەبەرئەوە کوڕەکە و دایکیان بۆ هێنایین کەلەپێش ئێمەش هاتوچۆی نەنەی ئەکرد. دایکی رەحیم مێردەکەی

ئەمری خوای کرد کوڕی گەورە و عەسکەری هەبوو کچی بەشوی هەبوو. دایکی رەحیم باڵا بەرزێکی ( رەشیقی ) خۆشەویستەنی بوو هەموو جارێك ئەو ئاوی بیرەکەی بۆ دەرئەهێناین چونکە ئاو دەرهێنان زۆر زەحمەت بوو دیمەنی دایکی رەحیم دڵگیر بوو کە خەرەکی سەر بیرەکەی بائەدا تاوەکو سەتلەئاوەکەی لیٚ دەرئەهێنا ئینجا ئاوی سەتڵەکەی ئەڕشتە شوێنی ئامادەکراوەوە دوای سەتڵەکەی بەبەتاڵی هەڵ دەدایەوە ناوبیرەکە و جارێکی تر بەپڕی ئەیهێنایەوە و دایکم و هەموویان بە دایکی ڕەحیمان ئەگوت کە ئەو فێری ئەو ڕیازەیە بو بۆیە ناوقەد باریك و ( ڕەشیق )بو بەو عمرو تەمەنەوە کە چەند کچی بەشو ئەوەی هەبوو. ڕەحیم زۆر کوڕێکی خۆش و پێکەنین بوو لەگەڵ ڕێسانی خوشکم ئەچوون بۆ مەکتەب چونکە مەکتەبی کچان نەبوو ڕێسانیش گەیشتبووە شەشی سەرەتایی بۆیە ئەبوو بچێتە مەکتەبی کوڕان باش بوو رەحیمی لەگەڵ بوو ئەویش هەر لەو سنفە بوو. بەڵام من کە هاتین بۆ کەرکوك ئیتر هەر نەچووم لەقوڕنە شەشم تەواو کردبوو و دەرچووم بۆ یەکی ناوەندی بەڵام ڕقم گرت و نەچووم و گوتم تاقەتم چوو هەموو رۆژێك مەکتەبێکمان پیٚ ئەگۆڕن و شارێکمان پیٚ ئەگۆڕن هەروەها زروفیشمان زۆر نالەبار بوو بەدەست حکومەتەوە. دائم هست لسەردڵ و چاو بەفرمیٚسك بووین لەبەرخاڵکا [illegible] بۆیە ئەوسا ل ۆ .
نیوەی لەکەرکوك بوین نەچووم بۆ مەکتەب. قەرەتەپە ئێستگەی شەمەنەفەری بەغدای لەسەر بوو بۆیە هەموو شەوێك نزیك سیٚ و چواری بەرەبەیان کە دەنگی پاسەکە ئەهات و بەکۆڵانەکەدا تیٚ پەڕیایە خەڵك ئەیزانی کە ئەوە ڕێبوارن لەئێستگەی شەمەنەفەرەوە هاتوون. یاخود ئەگەر کەسێك بیویستایە بچێتە کەرکوك ئەبوو پێش ئەوکاتەی شەمەنەفەر ئەگەیشت بگەیشتایەتە ئیستگەکە.



بۆچونە بەغداش ئەبوو ئەوانەی لەقەرەتەپەن ئەوکاتە بڕۆن. دوو هەفتەیەك بوو خالەمحمدم گەڕابووەوە لەتحقیقاتی سلێمانی کە شەوێك هەمووومان نوستبوین کاتی گەیشتنی پاسی ئێستگەیەکی شەمەنەفەر بوو لەسەر دەنگی لێدانی دەرکی حەوشە ڕاپەڕین.

فەسڵ سەرەتای پایز بوو لەهەیوانی چینی سەرەوە نوستبوین. تەنیا مامۆ لەخواریٚ بوو لەگەڵ نەنە چونکە مامۆش نەخۆش کەوتبوو چاویشی زۆر کزبوبو بۆیە نەنەش لەبەرئەو هەر لەخواریٚ ئەنوست بۆیە دایکم بەپەلەڕاپەڕی و چووە خواریٚ بەشپرزەیی و ترسەوە هەروەها نەنەش پێش ئەو گەیشتبوە بەردەرگا هەرچەندە خاڵیشم هەستا چونکە ژوورەکەی لەچینی سەریٚ بوو خاڵم گەیشتە سەر پێپلیکەکان دایکم دەرکی کردەوە ئەگەرچی ئێمە فێر بووین چونکە زۆرجار هەندیٚ خزممان ئەهاتن بۆلامان بەڵام ئەوبەینە زۆر پەشۆکابوین شپرزەبوین دەرگا کرایەوە کابرایێکی جل کوردی کردی بەماڵدا.

کابرا هەرهاتە ژوریٚ بەپەلەدەرگاکەی داخستەوە لەدوای خۆی و گوێی نەدایە حەپەسان و سەرسوڕمانی دایکم و خاڵم و نەنەش. کابرا ڕووی خۆی خۆش کردوو بەئەسپایی و بەچرپەوە گوتی بڕۆنە ژووریٚ کاغەزی خۆشم بۆ هێناون. ئیتر خاڵم باوەشی کرد بەکابرادا لەخۆشیانا و بەبیٚ دەنگی و بەئەسپایی روویان کردە ژوورەکەی خوارەوە کە ژورێکی زۆر سەیر و گەورەبوو. ژوورەکە دوو پەنای وەك ژووری زەخیرەی تیابوو سەروی ئەو ژوورە گەورەیەش وەك سەکۆی نوێنی زیاد بوو شتی وایان لەسەر کەڵەکە ئەکرد و متیل و یا جاجم و شتی جوانیان پیا ئەدا. کابرا ئەتگوت هەموومان ئەناسێت کەچی یەکەم جاربوو بمان بینێت و ئێمەش بیبینین کابرا سەری هێنایە پێشەوە لێمان و بە چرپەوە گوتی من ناوم مەسعودە لەلای کاکە هەمزەوە هاتووم کاك مەسعود دەستی دایە گیرفانی

بەرباخەڵی و نامەیەکی دەرهێنا و دایە دەست خالەمحمدم. ئێمەش لەخۆشیانا خەریك بوین باڵ بگرین و خەریك بوین کاك مەسعود بکەینە کۆڵمان و دەست و جل و بەرگی هەموو ماچ کەین چونکە بەلای کەمەوە خەریك بو ئەبو بەساڵێك بەهیچ جۆرێك هەواڵی خاڵە هەمزەمان نەئەزانی تاوەکو خالەمحمدیشم کە شتێکی لەسەفەرەکەی ئەزانی کەوتبوە مەراقەوە و مات بوبو هەندێ جار نەخۆشیش ئەکەوت و قاچێکی بەگیر ئەوەستا دکتۆر لەکەرکوك پێیان گوتبو کە نائارام و نارەحەتی بۆیە وات لێ دێت دەوری کاك مەسعودمان دا ئەویش کەوتە باس و هەواڵی خاڵم کە چەند دڵی لامانە و چەند مەراقی ئێمەیەتی بەتایبەتی کە زانیبوی هاتوین بۆ قەرەتەپە. کاك مەسعود پیاوێکی کەڵەگەتی درێژ بوو زۆر ڕوخۆش و دەم بە پێ کەنین بوو.

کاك مەسعود پێش ئەوەی بچێت بنوێت و پشوبدات چونکە بەرەبەیان بوو دایکم جێگاو نوێنی بۆ ئامادەکرد پێش ئەوەی بچێت سەری هێنایە پێشەوە لێمان و وەك چرپە بەدایکمی گوت : ئەبێ خۆتان ئامادە بکەن تۆو هەردووکچەکان کە بڕۆین بۆ لای کاکە هەمزە زۆرتان بیر ئەکات بەڵام پێی نەگوتین بۆ کوێ ئەبێ بچین و لەکوێیە و گوتیشی ئێوە نابێ هیچ پرسیارێکم لێ بکەن تەنیا خۆتان ئامادە بکەن ئەبێ بڕۆین. هەرچەندە خالەمحمدم گوتی سبەینێ زۆر زوە تۆ زۆر ماندو دیاری گوتی : نەو ئەبێ سبەینێ بڕۆین.

کەوتینە خۆمان خۆمان کۆکردەوە بەپەلەپەل بەڵام کوڕەکەی لامان ڕەحیم کە زۆر ڕاهاتبو لەگەڵمان هەروەها ئەوەندە باسی خاڵە هەمزەمان ئەکرد و خەفەتمان ئەخوارد ئەویش وەکو ئێمەی لێهاتبو لەبەرئەوە ئەویش دڵی زۆر خۆش بوو گوتی بەخوا من نەبەن یەکسەر خۆم ئەخەمە



ناو ئەم بیرەوە و ناچار بردمان چونکە وەکو یەکێ لەئێمەی لێهاتبوو خۆی و دایکی زۆر دڵسۆزمان بوون.

سبەینێ شەو کاتی گەیشتنی شەمەنەفەر خۆمان گەیاندبوە ئێستگەکە بەترس و لەرزەوە ئەویش لەبەر ئەوەی چەند شەو لەوەپێش عەشرەتێکی دەست ڕۆیشتوو سەر بەحکومەت پێیان ئەگوتن ( ال عاصی ) هاتبونە لای خالەمحمدم داوای منیان کردبو بۆ کوڕی شێخ ئێمە نەمان ئەزانی شەوێك لەپڕ لەبەر دەرگا کەمان بو بەهەرا ئەو کاتەی خالەمحمدم لەنادی ئەگەڕایەوە ماڵێ شەو نزیك دوانزە ئەبو کە دایکم گوێ لەهەرا و قسەی قەڵەبالغی بو ڕاپەڕی و بەترسەوە گوتی : ەی ٚوا□□ ئەمە دەنگی محمدە توڕە بوە کە بەباشی گوێمان گرت خالەمحمدم ئەیقیڕاند بە توڕەبونەوە ئەیگوت : من تاکە پێڵاوەکەی خوشکەزاکەمتان نادەمێ نەك خۆی سەرتان داوە لەبەرد.

بەترس و لەرزەوە ڕامان کردە خوارێ دایکم دەرگای کردەوە کاك حەمە سەعیدی دڵسۆز و پیاو قوڵی خالەمحمدی گرتبوو هێنایە ژوورێ ئیتر کە خاڵم دی وا ئێمە شپرزەین و من و ڕێسان ئەلەرزین دەستی هێنا بەسەرمانا و گوتی : بڕۆنە ژوورێ هیچ نیە ، دوایی دایکم وازی لێ نەهێنا چونکە زۆر نارەحەت و نائارام بوین بەدایکمی گوت کەوا ئەو شێخی ئالی عاصیە هاتۆتە سەرم ئەڵێت یا خوشکەزاکەت ئەدەی بەکوڕەکەم یاخراپتان بەسەر دێنین و هەر ئەبێ بیرفێنین چونکە کوڕەکەم ئارامی لێ هەڵگیراوە و ۆیەوێت. ئەمە ماگیگەجوا□□ بۆ ئەنێرن و هەر دەریان ئەکەم ئیتر وا ئیمشەو بەچەکدارەوە هاتونەتە سەرم و دایان نابو کە لەڕێگای گەڕانەوە ماڵێ تەقەم لێ بکەن و بمکوژن وا مدیر ناحیە و کاك حەمە سەعید پێیان زانی لەگەڵم هاتن و پۆلیسیشیان لەگەڵ خۆیان هێنا ئیتر ئەوە بو بەتەگەرە لێمان کە ئەمە ئەمانە لەکوێ منیان دیوە من هەر قەت نەئەچومە دەرێ

چونکە قەرەتەپە لادێیەکی ناخۆش بوو لەو دوو سێ ماڵەزیاتر کە هاتوچۆیان ئەکردین و جاربەجار لەگەڵ دایکم ئەچووم بۆلایان هەروەها خۆم بە تەبیعەت گۆشە گیر و حەز لەگەڕان و سەیران و دەرەوە ناکەم یێ تێی هەرو لم ئێر نازا ئەمە لەکوێ منی دیبوو یاکەسێ باسی بۆ کردبون بەتەواوی نەمان ئەزانی هەروەها ئەو ماڵەو عەشرەتە لەقەرەتەپەش نەبوون لەکفری و ئەو ناوە بوون دوای ئەوە منی منداڵ کار و خاوەن ئەو ژیانە نالەبارە ئینجا نۆرەی تەگەرە و تەشقەلەی ئەمان بوو.

ترسێکی ترمان لەدڵا بوو لەبەر کاک مەسعود کە وەك قاچاغ وابوو لەحکومەت و سەرو سەکوتی زۆر پێچابوو هەم لەبەر ئەو عەشرەتە عەرەبەی هەڕەشەی لێ کردبوین دەستیشیان زۆر ئەڕۆیشت و حکومەتیان لەگەڵ بوو. هەروەها دوای ئەو شەوێ خاڵم شەڕی لەگەڵ کردن و بوبە قڕە لەبەر دەرگاکەمان بۆ شەوی دوایی ماڵەکەمانیان دایە بەر دەست ڕێژو گولەبۆ بەیانی نەنە و دایکی ڕەحیم نیوە بێژنگێك گولەیان لەحەوشەکە کۆکردەوە. دیارە پۆلیس و مدیری ناحیەش نەیان ئەوێرا بێن بەلایانەوە چونکە کێیان بویستایە وەکو ئاو خواردنەوە ئەیانکوشت و لەناویان ئەبرد. ئاخری شەمەنەفەر گەیشت و سوار بوین و گەیشتینە کەرکوك بەیانی زو بوو دابەزین کاک مەسعود یەکسەر سواری عەرەبانەی کردین و بردینی بۆ گەراجی ئوتۆمبیل.

ئێمەش لەگەڵ دایکم هەر سەیری یەکترمان ئەکرد کاک مەسعودیش هەر بەئەسپایی ئەیگوت بێ دەنگ بن و پرسیار مەکەن ، سواری ئوتۆمبیل بوین ئوتۆمبیل کەوتەڕێ سەیری یەکتر ئەکەین و بەچاو ئیشارەت و هەندێ جار بە پێ کەنینی بێ دەنگ ئەڵێین ئەمە ئەچین بۆ کوێ ؟ ئێمە ئەم ڕێگایەمان نەدیوە. ئوتۆمبیلیش هەر ئەڕوات کاک مەسعود لەتەنیشت لێخوڕەکەوە ئێمەش لەگەڵ ڕەحیم و دایکم لەپشتەوە.



ئێمە تەگەرەیەکی تریشمان هەبوو چونکە لەخواروی عێراق گەورە بوبوین و فێری شەقام و ڕێگاو بانی ڕێك و ڕاست بوین بۆیە لەو ڕێگای بەرزو نزم و پێچ پێچانە گێژ ئەبوین و دڵمان تێکەڵ ئەهات و جاری وا هەبوو پەکمان ئەکەوت ڕێگاکان وەکو ئێستە نەبو زۆر ناڕێك و پێچ پێچ و ناخۆش و درێژ بوون بۆیە هەر زۆر ناڕەحەت بوبوین کاک مەسعودیش دڵی پێمانەو بوو کە ئەڕشاینەوە و هەر هوعە هوعمان بوو بەنۆرە بۆیە لەدوای بەینێك ئاوڕی لێ ئەدایەوەو گوتی : دەی تەحەملتان هەبێت ئەوەندەمان نەماوە هاکە گەیشتین ، بەینێکی تری پێچو لەدوای هەندێ چایخانە شارێکی بچوك و گرد و شاخ لەسەر بەرزاییێك دەرکەوت دڵمان خۆش بوو کە ئیتر ئەوەندەمان نەماوە دوای کەمێك گەیشتینە ناو شار ئەو شارەی کە هەر نەمان ئەزانی کوێیەو ناوی چیە ئوتۆمبیلەکەمان بەپێ ئامۆژگاری کاک مەسعود لەشەقامە گشتیەکە پێچی کردەوە ناو شەقامێکی بچوکی قەڵەباڵغی پڕ هاتو چۆکەر و دوکان و بازاڕەوە لەوێشەوە پێچی کردە دەستە چەپی کە ئەویش هەر عەینی ناوچە بوو چوو لەبەر دەرگایەك ڕاوەستا کاک مەسعود دابەزی و گوتی دەی دابەزن سەفەر سەلامەت دابەزین دوای پارەدان و ڕاگرتنی ئوتۆمبیلەکە لەدەرگای دا ئێمەش سەرو پۆتەلاك شێواو و تەپیو لەبەر دڵ تێکەلاتن و بێ حاڵی. دەرگا کرایەوە کردمان بەژوورا کە خاڵە هەمزەم بە جلی کوردیەوە لەپشت دەرگاکەوە پەلاماری داین و دەستی کردە ملمان و خەڵکی ماڵەکەش هاتن بەپیرمانەوە. شارەکە تمەز شاری سلێمانی خۆشەویست شاری هەڵمەت و قوربانی بوو. ماڵەکەش ماڵی مامۆستا برایم ئەحمەدی محامی بوو کە خوشك و براو خێزانێکی زۆر بوون.

ئەو خانوە بوو کە ئێستە کراوە بە ( زاموا ) دڵمان خۆش بوو. ماڵەکە هەر زو بردیانینە سەرێ لەهەیوانەکە جێ و ڕێیان بۆ داخستبوین کە

دانیشین و پشوبدەین بەدەورمانا هاتن چایان بۆ هێناین ، ئاوی لیمۆی بەصرەی کولاّویان بۆ هێناین ، پاڵ کەوتین هەندێ هاتینەوە سەر خۆمان و بوژاینەوە. بەلاّم خاڵە هەمزە نەهاتە سەرێ و لەژووری پشت دەرگاکە مایەوە کە ژوورێکی گەورەی خۆشی میوان بوو دیار بو خاڵە هەمزەم لەبەر چاو نەبو شاراوە و قاچاغ بوو لەحکومەت بۆیە لەو ژوورە مایەوە کە نەبادا کەسێك بهاتایە و بیانبینیایە چونکە نەئەبو خەڵك بیبینن. ماڵەکە قەڵەباڵغ بوون چوار خوشك و دوو برای بچوك و کچێك کە بەخێویان کردبوو ناوی مینا بوو هەروەها کوڕێکی هەندێ کوتوکوێر پێیان ئەگوت ڕەشە کوێر. چونکە یەکەم جار بوو بیان بینین بۆیە بەخەیاڵ لەدڵی خۆمدا ئەمگوت کە خوشکە گەورەکەیان کە نەمان ئەزانی هەموو خوشکن وامان زانی کە دایکی ئەوانی ترە.

لای نیوەڕۆ ئەوەندەی پێ نەچوو کە خاوەن ماڵەکەش هاتەوە خۆی و جانتای محاماتی کە بەدەستیەوە بوو ئەویش ( مامۆستا برایم ئەحمەد )بوو هاوڕێی خاڵە هەمزەم ئەویش زۆر بەگەرمی بەخێرهاتنی کردین ئێمە تەنیا بادینیمان ئەزانی بۆیە بەئاسانی لەیەکتری حاڵی نەئەبوین لەگەڵ ئەهلی ماڵەکە. چەند ڕۆژێك لەوێ ماینەوە ، دایکم خاڵە هەمزەمی ئاگادار کرد لەڕوداوی عەشرەتی( ال عاصی ) عەرەب خاڵم زۆر ناڕەحەت بوو گوتی تۆ برۆ خۆتان بپێچنەوە و بەپەلەوەرنە سلێمانی بەلاّم گەلاوێژ نابێت بیبەیت من لێرەم با لەلام بێت.

دوای ڕۆیشتنی دایکم ئەبو منیش بشارنەوە لەهاتوچۆکەر چەند کەسێکی زۆر بڕوا پێ کراو نەبێ وەکو پورە فاتم کە پوری ( مامۆستا برایم ئەحمەد )بوو کچەکەی کەناوی رەحمە خان بوو. خالەحەسەن کە خاڵی مامۆستا برایم ئەحمەد بوو ژنەکەشی ناوی بەهێ خان بوو کچی پورە فاتم بوو. هەر ئەمانەم ئەدیت کە ئەهاتن بەلاّم خەڵکی تر ئەبو وەکو خاڵە ەمزەمش ارو[illegible]ە.

خاڵە هەمزەم لەسەفەرەکەی گەڕابوەوە ئەو سەفەرەی سەری لێ شێواندبوین و دڵگیری کردبوین ئەگەرچی خاڵە هەمزەم هەر دوربو لێمان و هەموو جارێك لەچەند ڕۆژێك زیاتر نەمان ئەبینی و هەمیشە چاو بەفرمێسك بووین بۆی نەنکیشم ئامینە کە دایکی بوو هەربەو حەسرەت و داخەوە چاوی لەسەر یەك ناو مرد کەلەعەفك بوین زۆرچاك بیرم دێت ئەو شەوەی کەنەنکم کەوت بەلایا چاوی هەر بەکراوەیی مایەوە و هەر چاوی ئەگێڕا دایکم ڕایکرد بەگریان و سنگ کوتانەوە بۆ ژورێ و بەپەلەگەڕایەوە لای نەنکم کە دکتۆر گەیشتبوە سەری دایکم چاکەتێکی بەدەستەوە بوو خستیە سەر سنگی نەنکم و گوتی ئەوە هەمزە هاتەوە ئەمە چاکەتەکەیەتی ئینجا ڕاست بوو ئەو چاکەتەی هی خاڵە هەمزەم بوو لەلای نەنکم بوو هەڵیگرتبو جاربەجار ئەچو دەری ئەهێنا و بۆنی ئەکرد و ئەگریا ، نەنکم هەروەك چاوەڕێی بونی خاوەنی ئەو چاکەتەی ئەکرد دوای دانانی چاکەت لەسەر سنگ و لای دەم و لوتی هەناسەیەکی بچوکی هەڵکێشا ئیتر نەنکم چاوی لێکنا و بەیەکجاری. بۆیە ئێمە بە درێژایی کات لەو حەسرەتەدا بوین بۆ خاڵە هەمزەم. بەلاّم بەپێ توانا ئاگاداری ئەکردین و بەدزیەوە نامەی بۆ ئەناردین کە لەلای جەنابی سەید ئەحمەدی خانقاە بوو لەکەرکوك و دێهاتەکانی بەلاّم ئەم چەند ماوەیە کەلەپڕ نەما دیار زۆر کاری تێ کردبوین.

ئیتر چۆن لەخۆشیانا ئێستە دڵ خۆش نەئەبوین و نەئەبوژاینەوە و ێو ا ئێتر من لەگەڵێ ئە[illegible] تاوەکو دایکم و خاڵم و ماڵمان دێت بۆ سلێمانی ک ، خاڵە هەمزەم کە لێمان ون بوبو چوبو بۆ ئێران لەگەڵ خەباتکەری تر بۆ لای شەهید قازی محمد کاتی جمهوریەی مهاباد. هەروەها ئەو کاتە

خوالێخۆش بوو مەلا مصگفی بارزانیش چوبو بۆ ئەوێ لەدوای ئەوەی لەدەست حکومەتە بەد ناوەکانی ئەوکاتە هەڵهاتبون. بۆیە خاڵە هەمزەم گەڕابوە کوردستانی عێراق کە خەریکی دامەزراندنی حزبی پارتی بێت لەدوای ئەوەی لەگەڵ مەلا مصطفی ی نەمر وایان دانا بوو کە خاڵم بەدزیەوە بگەڕێتەوە و پارتی دامەزرێنێت مەلا مصطفی ی نەمر لەدوای ڕوخانی جمهوریە مهاباد توانیبوی لەگەڵ چەند هەمراهێکی خۆیان بگەیەنێتە اتیحادی سۆڤێتی ئەوسا. کە گەیشتە سلێمانی بەو نیازە ئەوەبو خاڵم و خەباتکەران بەهانایەوە چوبون و دەستی یارمەتیان بۆ درێژ کردبوو لەهەموو ڕویێکەوە بە تایبەتی خواڵخۆشبو شێخ لەتیفی شێخ مەحمود و مامۆستا برایم ئەحمەدی هاوڕێی. شێخ لەتیف بردبوی بۆ سیتەك و لەوێ شاردبویەوە و هەروەها لەشوێنانی تریش ئەوە بوو کە مامۆستا برایم ئەحمەد بۆ ماوەیەك هێنابویە ماڵی خۆی و لەوێ شاردبویەوە و هەروەها یارمەتیشی ئەدا بۆ دروست کردنی حیزبەکەی ئەگەرچی مامۆستا برایم ئەحمەد خۆی حیزبی خۆیان هەبوو هیوا بەلاَم هەر پێیان خۆش بوو لەگەڵ شێخ لەتیف و برادەرانی تریان کە ئەو هاتوە حزبێکی تر دروست ئەکات ئیتر زۆریان یارمەتی یان ئەدا.

ئەگەرچی مامۆستا برایم خۆشی هەر لەژێر چاودێری حکومەتدا بوو زۆری لێ ڕازی نەبوون و ئەیان زانی لەبنەوە خەریکی چیە و چەند کوردایەتی ئەکات و هەوڵی ئەوەیان ئەدا کە بەشکەم واز لەمحامات بێنێت وەزیفە وەرگرێت. ئەوەبو کە کرا بوو بە حاکم لەهەڵەبجە. لەبەرئەوە مامۆستا برایم ئەحمەد ئەیویست وا خۆی پیشانی دەستگاکانی حکومەت بدات کە ئەو خەریکی سیاسەت نیەو خەریکی خواردنەوەو دەعوەت و کەیف و سەیرانە بۆیە هەرچەند ڕۆژ جارێك دەعوەتێکی ئەکرد هەموو هاوڕێیەکانی ئەهاتن و بەزمی گۆرانی خوالێخۆشبوی ڕەشۆل و خولەی



لیلی و بەزم و گۆرانی و پۆست و ئیدارە مێژو خوان ئەڕازانەوە تاوەکو نیوەی شەوان ئەمە بەشەرتێك خاڵە هەمزەش لەژورێکی ماڵەکە شاراوەبوو. لەو میوانانەی ئەهاتن بۆ ئەو دەعوەتانە وەکو باسیان ئەکرد ئەمانە بوون شێخ لەتیفی شێخ مەحمود بوو. قادر ئاغای ڕەئیس بەلەدیەی ئەوسا بوو. ڕەشید ئەفەندی فەتاح ئەفەندی ناوێك بو. غفور ئاغا. قادر ئاغا حاجی مەلا سعید. ڕەئوفی شێخ صالح بو دکتۆر هاشم دۆغرەمەچی بو. دکتۆر عبداللە ن بو وخ ە لکی توش ناویان نازا□□ لەمجۆرە دەعوەتانەش ەو لی . جمعان ئەکران هەر بۆ ئەوەی حکومەت بڵێت کە برایم ئەحمەد خەریکی کەیف و دەعوەت و ڕابواردنە نە خەریکی سیاسەتە و نە هەمزە عەبدوڵلاَ ش لەماڵی شاراوەتەوە.

لەقەرە تەپە خاڵەمحەمدم پەلەی لەدایکم و نەنە کردبو کە ماڵەکە کۆکەنەوە و وەزیفە و کاریشی واز لێ هێنا و بە خێرایی قەرەتەپەیان بەجێ هێشتبوو گەیشتبونە کەرکوك لەوێشەوە کەل و پەلەکانی کەرکوکیشیان بارکردبوو هەمویان کەوتبونە ڕێ بەرەو سلێمانی لەسلێمانی خانوی نوری مەلا حەکیممان بۆ ئامادەکرابو کەهاتن بچنە ناوی کاك نوری مەلا حەکیمیش لەهاوڕێ و خەباتکەرو دڵسۆزی میلەت بوو. خانوەکە لەئەسحابەسپییەوە نزیك بوو لەدەست پێ کردنی کۆلاَنی قەزازەکان بوو. لەو خانوە گەورە قەدیمانەی شار بوو باخ و حەوشەیەکی زۆر دڵگیری هەبوو.

خاڵم دایکم و ئەوان گەیشتن ماڵ دامەزرا هەموو دڵنیاو ئارام بوین منیش چومەوە ماڵی خۆمان خاڵە هەمزەشم گەڕایەوە بۆ سیتەك لەدوای ساڵێکیشی پێ نەچو منیان دابە (مامۆستا برایم احمد ) دەنگ و هەواڵ بلاَوبوەوە لەشار. هەندێ پێان خۆش نەبو ئەوانەی خۆیان بۆ ( مامۆستا برایم احمد ) دانابو. کە منەتیشیان ئەخواست هەر ئاوڕیان لێ بداتەوە لەو

کەسانە زۆر بوون بە تایبەتی کە مامۆستا برایم احمد نوسەرو ئەدیب و ناودارێکی زۆر خۆشەویستەنی بو لەلای میلەت و کورد پەروەر و محامێکی زۆر پێشکەوتو زیرەك و بەناوبانگ بو کە زۆر لەسەر فەلاح و بیّ دەسەڵات و بەش خوراو ئەکاتەوە و هەروەها خاوەن گۆڤاری خۆشەویست و گەش و بەرزی گەلاوێژ بوو کە هەموو خوێندەوارو ڕۆشنبیرو خەڵکی کوردستان لەسەر ئاگر چاوەڕێی کاتی دەرچونیان ئەکرد کە مانگی جارێك بو ئەو مەجەلەبەرزەی کە ناوەرۆکی پڕ بو لەبەرهەمی دەست و پەنجەی زێڕینی مامۆستا برایم احمد  هەر لەچیرۆك نوسینەوە تاوەکو وەرگێڕانی چیرۆك و نوسینی بەرهەمی ڕوناك بیرانە و بەکەڵکی انگلیزی لەهەموو جۆرێك تاوەکو شعری بەرزو بەبەهای خۆی هەمووشی بەناوی ئاشکرای خۆیەوە نەئەنوسی یەك دوو حەرفی دا ئەنا لەژێریان. هەروەها زۆر نوسین و بابەتی نوسەرانی کوردی تریشی تیابو لەگەڵ نوسینی( علاالدین سجادی )و لاپەڕەی بۆ پێکەنین. خەڵك کە ئەم خواستانەی بیست و شەکراو بەخش کراو بڵاوبوەوە ئیتر زۆرکەس لێیان بو بەمەراق کە ئەبیّ بچن ئەو کچە ببینن کە ئەمە کێیە خەڵکی شاریش نیە. ئەمە کێیە کەوا لەپڕ هات و دڵی برایم احمدی چاو لەدوی چەندەها خەڵکی تری فڕاند و تیا جیّ گیر بو ئەمە کێیە ؟ بە تایبەتی ئەوانەی نەهاتبون بۆ شەکراو خواردن و نیشانەکردن و منیان نەدیبو. لەبەرئەوە لەدوای ئەو نیشان کردن و شەکراو خواردنە هەر دەرگاکەمان بو لیّ ئەدرا و ژن و کچ بوون ئەهاتنە ژوریّ بە بیانویەکەوە. هەو ئەیگوت وا تۆزیّ ئاومان ئەوێت لەڕێگای دورەوە هاتوین ئەو ئەیگوت خانو ژوری بەکرێتان نیە. هی کە بیانوی تری ئەدۆزیەوە ئیتر هەرکەسە بە بیانوێکەوە  منیش زۆرجار ڕام ئەکردە ژێرخانە گەورەکە کە ئەوشتانەی ماڵی کاك نوری مەلا حەکیمی تیابو بەتایبەتی ئەگەر لەحەوشە بومایە لەچینی سەرەوە نەبومایە من زۆر



تورە ئەبووم و حەزم لەو چەشنە ڕەفتارانەی ئەو کەسانە نەئەکرد کە سەریان ئەکردە سەرمان.

تا ئەوکاتەش بە مامۆستا برایمم ئەگوت کاکە برایم من لەکویّ ئەمزانی خاڵە هەمزەم و ئەوان وا ڕێکەوتن کە من بدەن بەو وخاڵە هەمزەشم نەعیمە خانی خوشکی بێنێت ئەگەر چی(مامۆستا برایم احمد)ئەوەی نەئەزانی کە وا ڕێکەوتون باجی نەعیمەش شوبکات بە خاڵە هەمزە چونکە خاڵە هەمزە قاچاغ و شاراوە بو و ئەو موعەلیمە بوو ئەو کارە خەتەرناك بوو بۆ هەمولایەك بەڵام لەدوایا مامۆستا برایمیش زانی. لەڕاستیدا خاڵم و باجی نەعیمە پێش داخوازی و داواکردنی من ڕێکەوتبون هەرچەندە لەبەرئەوە توشی زۆر کەشمە کەش و هەلاّ بوین لەبەر نالەباری زروفی خاڵم کە خالەمحمدیشم بەدڵی نەبوو ئەیگوت جاریّ وەختی نیە بەڵام لەدوایا هەمووکارێك ئاسان بوو. خالەمحمدم دایکم و هەموو ماڵی ئێمە مامۆستا برایمیان زۆر خۆشەویست چونکە شایستەی هەموو خۆش ویستنێك بوو. زۆر کەسێکی بەحورمەت و قسە خۆش و ڕاست و بیّ پێچ و پەنا بوو. ئاخری وایان قەراردا کە بڕۆین بۆ بەغدا بۆ جیازی کڕین بۆ من ، دوو خوشکی مامۆستا برایم نەعیمە خان و حەمدی خانیش هاتن لەگەڵ پورزاکەشی کە ناوی رەحمەخان بوو هەروەها من و دایکم و ڕێسان و رەحیمیش ئەوکاتە خاڵە هەمزەم بەقاچاغی گەیشتبوە بەغدا و لەماڵی شەهید علی حەمدی یەکەم کۆنگرەی پارتی بەستبو ئیتر نەگەڕابوەوە و لەبەغدا خانوێکیان بۆ بەکریّ گرتبو بەناوی مهندسەوە و کوڕەکانی ئەوسای لەگەڵ بوو ئەوانی ئەنارد بۆ ئەملاو ئەولا و خۆشی لەژورەوە شارابو ئێمەش چوین بۆلای بۆ ئەو ماڵەی بۆ جیازی کڕین بۆ من هەموو ڕۆژێك دوای بەرچایی هەموومان ئەوانەی هاتبون لەگەڵمان ئەکەوتینە ڕیّ بەرەو بازاڕە ئاوەدانەکانی ئەوسای بەغدا کە جوانترین و باشترین کەل و

پەلی لێبوو هەر ڕاست بازاڕو کەل وپەلی وەکو هی لندن و ئەوروپا بوون قوماش و کوتاڵی لەباشترین قوماشی فرنسی و انگلیزی بوو جلی ئامادەو حازری مۆدە هەروەها هەمووی هەر فرنسی و ئیتاڵی بوو پێڵاو ئەوە هەر باسی ناکرێت. بێجگەلەچەند پێڵاو کە دروستکەری بەغدایی کە پێڵاویان یەکجار بەناوبانگ بو یەکێ لەو پێڵاو دروست کەرانەی زۆر بەناوبانگ بو ناوی ( گەرەبیت )بوو. ژوری نوستن و قەنەفەو شتی لەدار دروست کراو. ئەوە تاوەکو ئێستە کە چەند سالەلەلندن و ئەوروپام ناوماڵی لەدار دروست کراوی وەکو ئەوانەی ئەوسای بەغدام نەدیوە.

بەغدا چەندەها دوکان و سوپەرمارکێتی وای تیابو هەر ڕاست وەك لندن وابون هەر لەئۆرزدی باگەوە تاوەکو حسواخوان الأفراح المقص الزهبی دیانی تریش هەروەها سوق الحرایر. شارع النهر و چەندەهای تر بێجگەلەبازاڕ زێرنگەری هونەرمەند لەهەموو جۆرو باشترین ئاڵتون هەموو جارێکیش یەکێ لەکوڕەکان ئەهاتن لەگەڵمان نایف یا حەمید باتاس. تاوەکو هەموو کەلوپەلەکانمان کڕی تەنیا ژووری نوستن و شتی دارماوەیان بۆ دانرا تاوەکو تەواوئەبن.

خاڵە هەمزەشم لەژورەوە خەریکی کاری خۆی و بەیان دەرکردن بوو ئەوسا مەجەلەی ڕزگاریشی دەرئەکرد هەموشی لەژێر زەمینی ماڵەکە بو ڕۆنێو و تایپ و ئەوشتانە لەوکەسانەی زۆر هاتوچۆیان ئەکرد دکتۆر جعفەر محمد کریم علی عەبدوڵلاَ بوو ڕۆژێکیان خاڵە هەمزەم بانگی من و دایکمی کردو گوتی : ئەبێ نیشانەو حەلقە و ئەوشتانەی برایم احمد بۆی بەریتەوە و من گەلاوێژی نادەمێ.

خوشك و ئەوانەی لەگەڵمان هاتبون گەڕابونەوە چونکە ئێمە ماوەیەکی لێبوین ئەوان بۆ دوو هەفتەیەك هاتبون.



دایکم سەری سوڕما و گوتی بۆ ؟ ئەمە چ قسەیەکە ؟ دیارە من هیچ قسەم نەکرد و نەئەبو بەرامبەر بە خاڵم و خۆشەویستی خاڵم هیچ بڵێم و هەمووی ئەبو قسەی ئەوبێت بەڵام لەدڵا وەکو شتێك حەپەسام کە ئەوە خاڵم بۆچی وا ئەڵێت دایکم دیسان گوتی بۆچی وا ئەڵێیت چی قەوماوە خاڵم تۆزێ لەتوڕە ئەچو دیاربو خەبەرو نامە و شتی وای بۆ هاتبو. بۆیە ڕووی کردە دایکم و گوتی : خەریکم پەشیمان ئەبمەوە گەلاوێژی نادەمێ و ئەبێ نیشانەو ئاڵتون و شتەکانی وەرگری و سواری شەمەنەفەر بیت و بڕۆیت بۆ کەرکوك و سلێمانی و شتەکانی بدەیەوە و تاوەکو ئەم کاغەزەم بۆ ئیمزا نەکات من گەلاوێژی نادەمێ. دایکم بە نارەحەتیەوە دیسان گوتی : ئێ بۆچی لەبەرچی سەبەب چیە ؟ خاڵە هەمزەم گوتی چونکە ئێستە گوێمان ناداتێ و هیچ باسی حیزبمان ناکات و لەسەرمان ناکاتەوە. دایکم هەرچەندە پێی ناخۆش بوو دڵی زۆر لەسەر خاڵە هەمزەم بوو نەیەویست ناڕەحەتی کات بەڵام هەر ناڕەحەتی خۆی دەربڕی و گوتی برایم پیاوی چاکە و هەموو خۆشمان ئەوێت و محمد زۆری خۆش ئەوێت ئێستە چۆن من بچم شتەکانی بۆ بەرمەوە. خاڵم گوتی هەر ئەبێ بچی.

دایکم گوتی باشە کاغەزی چیت بۆ ئیمزا بکات نابێ منیش بزانم هەر وا لەخۆمەوە بڕۆم و شتەکانی بدەمەوە دەست ؟ خاڵە هەمزەم گوتی ئەم کاغەزەم بۆ نوسیوە کە ئەبێ بە چاکی باسی پارتی بکات و پڕو پاگەندەی باشی بۆ بکات و ئەبێ پشتمان بگرێت.

دایکم ناچار نیشانەکەی بردو ڕۆی منیش لەلای خاڵم مامەوە لەبەغدا. دایکم ڕۆیشت و نیشانەکەی پێچایەوە منیش حەلەقەکەمم بۆ داکەندو دامە دەستی بەڵام لەدواییا ناڕەحەت بووم و لەدڵی خۆما گوتم ئەوە بۆ خاڵم وای کرد ؟ عمرم شانزە ساڵ بوو و ئەوکاتانە خەڵك وا بەرەڵا و زۆرزان

نەبون بەشەرم و حەیا بوون. بەتایبەتی من کە کچێکی بێ دەنگ و سەرخۆ و ئارام بووم و زۆرخۆشەویست بووم لای خاڵەکانم و کەس و کارم بووم.

بۆیە بەو حاڵەش وبەو هێمنیەی کەلەڕەوشت و خوم دابوو ناڕەحەت بووم و ڕۆژێك کە هێشتا دایکم نەگەڕابوەوە بەخاڵم گوت.

خالەگیان ئەوە بۆ وات کرد برایم ئەحمەدی هاوڕێت کەی وا ناحەزە وا کەوتیتە گلەیی و بۆلەبۆڵ لێی ، خۆ ئەمە ئیشی گاڵتە نیە منت داوە بەو و ئێستە منی لێ ئەسێنیتەوە بەخوا من زۆر عاجز بووم برایم ئەحمەد زۆر ئینسانێکی باشە و چەند وەختە لەگەڵمانە خاڵم خەریك بو توڕە بێت بەڵام قسەی نەکرد و خۆی خلافاند بە کاغەز و نوسراوەکانیەوە لەدوای دووسێ ڕۆژ دایکی مامۆستا بەسەرزمان هاتەوە بەکاغەزو ئیمزاو ئاڵتونەکانەوە رایکم . ناڕەحەت دیاربوو زۆر بۆ برایم وەکو پێی ئەگوت ( ئیبراهیم ) بەبادینانی دڵگیر بوو چوو کاغەزی دابە خاڵم کە وەکو ویستبوی بۆی ئیمزا کردبوو کە لەمەودوا زۆر گوێ بداتە حیزبەکەی و لەسەری بکاتەوە و قسەی باشی بۆبکات بۆ پەرەسەندنی ، خاڵم دڵی خۆش بوو کرایەوە.

دایکم تا بەینێك هەر لەدڵا ناڕەحەت بوو چونکە ئەیگوت کەچوە ئەو هاتوە بۆلای و کەوای پێ گوتوە و شتەکانی داوەتێ چی بەسەر هاتووە و چەند تێك چووە و ناڕەحەت بووە و هەروەها خالەمحمدیشم کە زۆر مامۆستا برایم ئەحمەدی خۆشەویست لەو کردارەی خاڵە هەمزە توڕەو و ناڕەحەت بووە.

مامۆستا برایم ئەحمەد نامەیەکیشی بۆ من نوسی بوو دایکم دایە دەستم بەڵام من نەمەزانی کوردی بخوێنمەوە هەر عەرەبیم ئەزانی قسەکردنیشم کوردی بادینیم ئەزانی بەڵام بەو چەند ماوەیەی کەلەسلێمانی بووم و مەجەلەی گەلاوێژ ئەهات سەیرم ئەکرد و حەزم ئەکرد بتوانم بیخوێنمەوە بە تایبەتی کە ئەمدیت چۆن هەموو دەرو پشتم ب



پەلاماری ئەدەن و ئەبێتە شەڕ لەسەری بۆیە هەر نامەکەم ئەمدیو و ئەودیو ئەکرد و هەندێ لەسەرو پۆتەلاکی حاڵی ئەبووم و لەناو هەموو ئەو نامە درێژە ئەم دێرەم توانی لێ تێبگەم و ئێستەش لەبەر چاومە و بیرمە کە نوسیبوی بۆم ( نەکەی بڕوا بکەیت هێز هەبێت لەم دونیایەدا بتوانێت دورت بخاتەوە لێم ).

زۆر سەیرە ڕەنگە کەم کەس هەبێت ئەوە بزانێت کە ئەگەر ئەم ڕێکەوتن و ئیمزا کردن و پشت گیریەی مامۆستا برایم ئەحمەد نەبوایە ڕەنگە پارتی هەر دروست نەبوایە و ئێستە شتێکی تربوایە و ناوێکی تری هەبوایە.

زۆر کەس وا ئەزانن مەجەلەی گەلاوێژ بەناوی منەوە ناو نراوە بە پێچەوانە من بەناوی گەلاوێژی خۆشەوەیستەوە ناونراوم. چونکە کەلەموسڵ لەدایك بوبوم وەکو لەسەرەتاوە باسم کردوە و شەوی ( لیلەالمحیا ) هاتبومە دنیاوە کە ئەو شەوە هەموو هەر سوجدەو نوێژ بوە لای زۆرکەس بۆیە وایان ناونابووم ساجدە بەڵام دوایی خالەمحمدم ڕازی نەبوو کردی بەژیان. دوای کەنەفی و دوورخراینە خواروی عێراق من شەش حەوت ساڵ بووم و تازە چوبومە مەکتەب لەبەرئەوەی لەو صحرای عەفەکە کە شوێنێکی زۆر دواکەوتو عەرەب بوون و نەیان ئەزانی بڵێن ژیان و بەچەند جۆری تر بانگیان ئەکردم بۆیە ناوم گەڕایەوە سەر ساجدەی موسڵاویەکان دوایش کە گەڕاینەوە لەنەفی دوای چەند ساڵ و بووم بەدەزگیرانی ( برایم ئەحمەد )ناومی گۆڕی بە گەلاوێژ و گوتی هەر کەسە بەوناوە بانگی نەکات ئەبێ دەفلس جەزا بدات قوتویەکی دانا و گوتی هەرکەس گەلاوێژی بەساجدە بانگ کرد ئەبێ دەفلس بخاتە ئەم قوتووەوە ، لەبەرئەوە زۆرجار ئەوانەی دەوروپشتم بیریان ئەچو و بەساجدە بانگیان ئەکردم و گورج دەمی خۆیان ئەگرت و ئەشڵەژان وئەبو دەفلس بدەن بەقوتوەکە پارەی قوتوەکەش هەمووجارێك ئەدرا بە فەقیر. ئیتر بووم بە

گەلاوێژ و هەموو وایان بانگ ئەکردم تەنیا خالەمحەمدم نەبێت ئەو وەکو خۆی مایەوە و پێی ئەگوتم ( چاچان ).

تا خانوو تەواوبو تا گوێزرامەوە عمرم بوبە ١٧ ساڵ لەو ماوەیەدا زۆر شت ڕووی دا و هەمیشە شار شڵۆغ ئەبوو خۆپیشاندان بوو بەتایبەتی کە چوار ئەفسەرەکە شەهید کران محمد قدسی و مصطفى خۆشناو عزت عبد العزیز و خیرا هەروەها لەوماوەیە جەژنی نەورۆز کرا و ئەمڕۆژیساڵی تازەی پیرە مێرد کە کرابو بەئاواز و سروود لەو ڕۆژەدا یەکم جاربوو خەڵك گوێی لێ بێت لەلایەن صالح دیلانەوە ئەو ڕۆژە جەماوەرێکی زۆر چوون بۆ بەرپاکردنی ئەو جەژنە لەتوی مەلیك ئێمەش هەموو چوبوین زۆر خۆش بوو وێنەم هەیە لەسەر بەرزاییێکەوە وەکو لۆری و سەکۆ و شتی واوابو دەنگ زلکەریشی لەسەر بوو کورسیش ڕیزکرابوون بۆ دانیشتنی خەڵك زۆر دڵیان خۆش بوو لەپڕ بوبە قڕەو هەلاّێك لەلایەکی ترەوە خەڵك شڵەژان و هەموو هەستان بەناڕەحەتیەوە کە ئەمە چیە وەیان زانی حکومەت دای بەسەر زەماوەندەکەیا کەچی دوایی دەرکەوت ئەو شیوعیە کوردەکانن کە ئەیانویست ئەو زەماوەندە خۆشە تێك بدەن چونکە ئەوان بڕوایان بە کوردایەتی نەبوو زۆریش ڕقیان لەپارتی بوو ئەوکاتە مامۆستا برایم هەر تەواو چوە ناوپارتیەوە و بو بەپارتی بۆیە زۆرجار ئاگام لەتەگەرەو ناحەزی شیوعیەکان بوو وەکو باسیان ئەکرد کە چەند دژایەتی پارتیان ئەکرد. لەهەمووشتێك سەیرتر شیوعی عەرەب وانەبوون و پەیوەندی خاڵە هەمزەم و مامۆستا برایم ئەحمەد زۆر گەرم بوو لەگەڵ شیوعی عەرەب وەکو سلام عادل نزیهە الدلیمی و عزیز شریف. رەحیم شریف بەلاّم شیوعی کورد زۆر دوژمنانە بوو ڕەفتاریان لەگەڵیان ئەوە بوو دوای بەینێك کە هێرۆی کچم لەدایك بوو عمری بو بە شەش مانگ باوکی گیرا. کتێبێك دەرچوو کەناوی هەموو خەباتکەرانی تیا نوسرابوو کتێبێکی



هەندێك گەورەبوو بەتایبەتی باسی باوکی هێرۆ و خاڵە هەمزەمی زۆر تیابوو کتێبەکە دائیرەی ئەمنی بەغدا دەری کرد بوو هەمووی ( اعترافاتی ) کوردێك بوو کەلەژێریا نوسیبوی خادم العرش و الوطن ڕەفیق چالاك. خۆم ئەو کتێبەم خوێندەوە،ناوی کتێبەکەش (الموسوعة السرية)بوو ئێستەش هاومانە لەلندن دیارە لەمەرق و ترسا ئەخ ویێدەوە کە بزا چۆن چۆنی باسی باوکی هێرۆ و خالّم کراوە.

لەدوای دەرچونی ئەو کتێبە بەماوەیەکی کەم هاتن باوکی هێرۆیان گرت لەگەڵ جلیل وشیارو موعەلیمەیەکی جولەکەی ژن و زۆر کەسی تریش. باوکی هێرۆ برا یەکسەر بۆ بەغدا و ئێمە هەموو سەرمان لێ شێوا و شار شڵەژا و خەڵك ناڕەحەت بوون ، باوکی هێرۆ بەینێکی زۆر نەمان ئەزانی لەکوێیە و لەچ حەپسخانەیەکە دیارە جارێ برابون بۆ تحقیقات. تحقیقاتی جینائی دەزگایەکی زۆر ترسناك و بەد ناو بوو ئەوەی کەوتە بەردەستیان ئیتر مەگەر بەنیوە گیان و یا بێ گیان لەدەستیان ڕزگاری ببوایە باوکی هێرۆ لەوێ زۆر ئەشکەنجە و ئازار درابوو دوو دانیان شکاندبوو بە بۆکس باوکی هێرۆ دەم و دانی زۆر چاك و جوان بوو ددانی ساغ و سپی و جوانی هەبوو. مامە ڕەمزی فەتاحی مامی سەری دونیای لێهاتبوەیەك چونکە زۆر زۆر باوکی هێرۆی خۆشەویست ئیتر کە گیرا هەر زوو چووە بەغدا و هانابردن بۆ ئەم و ئەو کە هەر بزانێت لەکوێیە. بەداخەوە مامە ڕەمزی بەو حاڵ و ناڕەحەتیە کەوتبوو دەستێکی شکابوو زۆری ئەزیەتی گەیبو بەلاّم هیچ ئەزیەت و دەست شکان و نەخۆشێك نەئەگەیشتە ئەوەی نەیەزانی برازاکەی چی بەسەرهاتوە ئاخری زانرا و بلاّوبوەوە لەدوای دومانگ کە ڕۆژی محاکەمەی نیشانە کرا. مەحکەمەش عورفی بوو. هەموو لەسەر ئاگر چاوەڕێی محاکەمە بوین ( خادم العرش و الوطن )یش بانگ کرا بوو بۆ محکەمە بۆ شاهیدی دان لەسەر برایم ئەحمەد

ئیتر بەکەیفی خۆی درۆی بۆ ڕیز کردبوو باوکی هێرۆ دوایی بۆی باس ئەکردین و ئەیگوت جۆرە درۆ و قسەی بۆ ڕێکخستبوم هەروا سەرم سوڕمابوو کە ئایا کراوە کەس هەبێت ئەم هەموو بوختان و درۆیانە بزانێت. ئاخری باوکی هێرۆ دوو ساڵ حوکم درا. دوو ساڵیش لەژێر چاودێری پۆلیس بەڵام نەئەبوو لەسلێمانی بێت و لەشارێکی خوارو بێت ئەو دوو ساڵە.

دیسان ئەوەندەی تر پەشۆکاین و چاوبەفرمێسك بووین من و باوکی هێرۆ پەیوەندیمان لەگەڵ یەك زۆر گەرم و بەهێز بوو ئەو ماوەیەی پێکەوە بووین زۆر بەیەکەوە بەسترابین هێرۆ ئەو کاتە شەش مانگان بوو کە ئەو گیرا. من حاڵی دەرونیم زۆر شێوا ، میوانی زۆرمان ئەهاتە لا لەناسیاوی خەڵکی شار بگرە لەشارەکانی تریشەوە هەر ئەهاتن بۆ دڵدانەوەمان و دەربڕینی دڵتەنگیان لەبەرگرتن و حوکم دانی باوکی هێرۆ چونکە بەڕاستی زۆر خۆشەویست بوو لای هەمووکەس لەهەموو ڕوێکەوە. پیاوێکی یەکجار پاك و مرۆڤ دۆست و دڵ گەورە و پڕ بەزەیی بوو. خاك و میلەت پەرست بێجگەلەئەدەب و نوسین و بەرهەمە کەم وێنە بەنرخەکانی. هەروەها بلیمەت بو لەزیرکیدا من ئەوەندە لەدوری ئەو ناڕەحەت بوبوم چەند جارێك نەخۆش کەوتم هەمیشە چاوبەفرمێسك بووم بەتایبەتی کە کتێب و شتە تایبەتەکانیم ئەبینی لەژورەکەمان. وەکو گوتم دوو ژوورمان هەبوو لەخانوەکەمان کە ئێستە زاموایە لەژووری پشتەوەمان ئەوەتی باوکی هێرۆ حوکم درا لەسەر دیواری ئەو ژوورە هەموو ڕۆژێ خەتێکم ئەکێشا و لەبیرم نەئەچو کە ئەو خەتە بکێشم هەرچەندە سەرقاڵ بومایە یاخود ئەو ڕۆژانەی لەلای دایکم و خاڵم بومایە ماڵی دایکم ئەوکاتە لەماڵی نوری مەلا حەکیم بوو گواستیانەوە بۆ خانوێکی سەروتریان پێیان ئەگوت خانوی ( مامە عەبە ) ئەو خانوە بچوکتر بوو لەچاو خانوی کاك نوری مەلاحەکیم بۆیەش



چۆڵیان کرد چونکە ماڵی کاك نوری لەلادێی بوون هاوینان و زستانان ەگەڕانەوە ناوشار و ابزا ئەچوونە قەراغ هاوینان لەبەرئەوە بۆیان چۆڵ کردین. ایکم و خ الەکا و هەموو ماڵی ئێمە زۆر بەتەنگمەوە بوون و زۆری کات لەلایان ئەبووم و ڕێسانی خوشکم کەلەمەکتەبیش بوو مناڵ کاریش هەر بەدیارمەوە ئەبو و هەر خەریکی هێرۆ بوو هێرۆ بانگی ئەکرد باح یعنی صباح ئەوکاتە صباحی گۆرانی بێژ زۆر بەناوبانگ بوو ڕێسانیش گۆرانیەکانی بۆ هێرۆ ئەگوت و لاسایی ئەکردەوە ڕێسان دەنگی خۆش بوو. خاڵە هەمزەم هەر شاراوە بوو لەدەست حکومەت بەگەرمی بۆی ئەگەڕان کە بیگرن. ئەویش هەر خەریکی بەیان دەرکردن و کۆبونەوەو کارەکانی حیزبی بوو. هەندێ جار شەوان درەنگ ئەهات بەدزیەوە سەری ئەداین بەتایبەتی گەڕەکەکەمان و دراوسێکانمان زۆر ماڵی باش بوون و دڵیان لەگەڵمان بوو. ئەوکاتانە کەم کەس ئەیتوانی سیخوڕی بکەن چونکە هەموو میلەت دڵی پڕبوو بەزۆری ئەو سیخوڕانە ئەناسران و ڕسوا ئەکران ئەگەرچی هەندێکیان بەو حاڵەش کاری خراپاوی و بەدخویی خۆیان ئەکرد و خەبەریان هەر ئەگەیاندە حکومەت و ئەمنەکەی بەڵام ئەوکەسانە تاوەکو منالەوردکەش شوێنیان ئەکەوتن بەبەرد و گۆرانی وەکو گۆرانییێکیان داهێنابو شوێن پۆلیس ئەکەوتن و ئەیانگوت ( پۆلیسە و پۆپنە ڕیسە و دەرنەفیسەو موغناتیسە ) ئەگەرچی زۆرلەپۆلیسی کورد لەژێرەوە لەگەڵ حیزب و خەباتکەران بوون هەروەها چەندەها کاربەدەستی گەورەش و حاکم و ئەوجۆرە کەسانە یارمەتی خەباتکەرانیان ئەدا لەژێرەوە خەبەرو هەواڵیان بۆ خاڵە هەمزەم و باوکی هێرۆ و برادەرانیان ئەنارد ، ولەڕوداو فەرمانی گرتنی هەندێکیان ئاگاداریان ئەکردن. باوکی هێرۆ حوکم دراو گوێزرایەوە ( سجنی مرکزی ) بەغدا ئیتر کەوتە نامە ناردن بۆمان هەروەها ئێمەش کەوتینە ڕێ بەرەو بەغدا سەری مانگان بۆ

ئەوەی بچین بۆلای یەکی هەموو مانگێك ئەتوانرا خەڵك بچێت بەندەکانی خۆیان ببینن. لەبەرئەوە تێکڕا سەری مانگان ئەکەوتینە ڕێ لەگەڵ دایکم یا هەندێ جار خوشکەکانی باوکی هێرۆ بۆ بەغدا هێرۆ بەرەبەرە گەورەئەبو چەندەهاجار لەسەر قۆڵی دایکم بەگەرمای تەموز و مانگەکانی تری بەغدا خەوی لێ ئەکەوت کەلەبەر دەرگا ڕائەوەستاین چاوەڕێی دەرگاکردنەوە ئەبوین کە بمانکەنە ژوورەوە. ماڵی کاك قادر قەزاز لەبەغدا بوون لەگەڵ خوشکی بەڕێزی حەسیبە خان زۆرجار بگرە هەمووجارێك ئەوان ئەهاتن لەگەڵمان بەمەنجەلەیاپراغ و خواردنی خۆشەوە کەبۆ باوکی هێرۆیان ئەبرد. هەروەها سەنیە خانی ژنی دکتۆر هاشم دۆغرەمەچی کە جلیل ووشیار برای بو ئەوانیش ئەهاتن و بەمەنجەلەیاپراخەوە و چەندەها جۆر خواردنی ترەوە ئینجا کە چوینە ژورێ بۆ لای باوکی هێرۆ جلیل وشیارو ڕەحیم شەریف و کوڕێکی خەڵکی بەسرە پێکەوە بوون و لەگەڵ هەرسێکیان دائەنیشتین لەگەڵ ماڵەکانیان کە ئەهاتن بەلآم بەسراییەکە زۆر کەم ماڵەکەیان ئەهاتن بۆلای ئێمە تێکڕا لەماڵی علی حمدی دائەبەزین کە ئەچوین بۆ سەردانی باوکی هێرۆ. کاك علی حەمدی ئینسانێکی یەکجار دڵسۆز و هێمن و ئازابو خۆی و ژن و خەسو ژن خوشکی هەمیشە لەگەڕدا بوون بۆ نامە هێنان و نامە بردن و چالاکیەکانی پارتی هەروەها یەکەم کۆنگرەی پارتی لەبەغدا لەماڵی شەهید علی حەمدی گیرا کە خانوو ا لیکّی زۆر ئلد ابی و چوك و فەقیر انای هەبوو و ابزا لەمحلەالسنك شەهید علی حەمدی بۆ بەندیخانە نەئەهات لەگەڵمان چونکە نەئەبو ئاشکرا بێت کە پەیوەندی هەیە لەگەڵ باوکی هێرۆ و کوردایەتی لەبەرئەوەی بیتوانیایە بەسەلامەتی کارەکانی و چالاکیەکانی بەڕێوە ببردایە. شەهید علی حەمدی کارمەند بوو لەیەکێ لەدائیرەکانی حکومەت بەلآم هەمیشە بەرباخەڵ و گیرفانەکانی بایی دەجار هەڵواسینی نامەی تیابو ئەگەر



بگیرایە بەتایبەتی ئەوکاتانە چەند شیوعیەکیان ئیعدام کردبو وەکو فەهد و هاوڕیەکانی بۆیە حکومەت زۆر بە گەرمی بەدوای کەسانێکەوە بوون کە هەر بۆنی سیاسەت و خەباتکردنیان لێ بهاتایە. کچەکەی شەهید علی حەمدی نزیك دە ساڵ ئەبو ناوی ڕوناهی بوو لەگەڵ دو کوڕیش لەو منداڵ تر بوون. زۆرجار ڕوناهی لەبەر دەرگاکەیان دائەنیشت کە لەکۆڵانێکی یەکجار تەسکابوون و لەپڕ لەگەڵ هاوڕیە منداڵەکانی ئەبو بەشەڕیان و لەیەك هەڵدان لەبەرئەوەی ڕوناهی گاڵتەی بەوانی تر ئەکرد و ئەیگوت ئێوە عەرەبی پێ پەتین ترسنۆکن من کوردم ئازام کورد ئێوە ئەکەن بە ژێرەوە هەروەها ئەیقیڕاندو ئەگوت عمی البرزانی زۆر پیاوی باشە. ئەوانی تریش بۆی ئەهاتن. هەرچەندە ڕوناهیان ئەهێنایە ژورێ و لێی تورە ئەبوون کەچی فایدەی نەبو بۆ سبەینێ وای ئەکردەوە.

مانگی ڕەمەزانی پیرۆز بوو هاوینێکی زۆر گەرم بوو دیسان سەری مانگ بو هاتبوین بۆ بەغدا بۆ بینینی باوکی هێرۆ لەحەپسخانەی ( السجن المرکزی )دیسان هەر لەماڵی کاك علی حەمدی بووین. بۆ ڕۆژی دوایی کاتی گەڕانەوەی کاك علی حەمدی بۆ ماڵەوە سەیرمان کرد کاك علی زۆر پەشۆکا و ناڕەحەت و دڵگیرە هەرچەندە لەبەرچاوی ئێمە خۆی ڕوخۆش پیشان ئەدا بەلآم فایدەی نەبوو شپرزەییەکەی زۆر لەوە گەورەتر بوو بیتوانیایە بیشاردایەتەوە بۆیە کەوتینە مەراقەوە دایکم لێی پرسی کاك علی توخوا چیتە ؟ گوتی نەخۆشم تۆزێ سەرم گێژە. ناهیدەخانی ژنی و نوریەی ژن خوشکی کە کەیبانو دەست پوخت و تەکبیرکەری ماڵەکەبو کردیانە سەری و گوتیان دەی زو پێمان بڵێ چی قەوماوە. کاك علی هەرچەند لەژێرەوە ئیشارەتی ئەکردن کە بێ دەنگ بن بەلآم ئەوان تێ نەئەگەیشتن کەچی ئەڵێت. ئاخری چار نەبو نەما کاکە علی بەماتی و دڵ پێوە نەبونەوە گوتی : کە ئیمشەی کاکە هەمزە لەسلێمانی گیراوە لەڕێگا

گرتویانە كە ئەیویست بچێت بۆ ماڵی هاوڕێ و برادەری بۆ كۆبونەوەی حیزبی. هەروەها دەستی دایە ڕۆژنامەیەك دەری هێنا كە شاردبویەوە و هەر زۆر بەداماوی و شپرزەیی پەلامارم داو سەیرم كرد لەسەر لاپەڕەی یەكەم بە مانشێتی گەورە لەسەری سەرەوە نووسراوە (( قوات الأمن الباسلةفي السليمانيه تلقى القبض على المجرم همزه عەبدوڵلا ))

پێ ناوێت كەبزانرێت كە چیمان بەسەرهات. دایكم بەسەزمانە بەزمانی بەڕۆژو بەو نیوەڕۆ گەرمە وەكو شێت كاك علی ڕەحمەتی گەیاندیە ئێستگەی شەمەندەنەفەر بۆ ئەوەی خۆی بگەیەنەتە كەركوك و سلێمانی و بزانێت ئەوە چی قەوماوە. من لەبەغدا مامەوە چونكە بۆ سبەینێ ڕۆژی چاوپێكەوتنی باوكی هیرۆ بو بۆیە نەیانهێشت منیش بگەڕێمەوە لەگەڵ هێرۆ كە زۆر مناڵ بوو هەروەها باجی زەكیەشمان لەگەڵ بوو هەمیشە بەدیارمانەوە بوو.

خاڵە هەمزەم هەر زو ڕەوانەی موسڵ كرابوو لەوێشەوە بۆسەر سنوری توركیا كە بدرێتە دەست توركەكان. ئیتر لەوێ و هەر لەموسڵەوە هەندێ پۆلیسی كوردو ئاشنا و هەندێ خزم لەزاخۆ وایان ڕێكخستبو كە لەگەڵی بن و بەدیاریەوە بن گوایە پۆلیسی حكومەتن و ئەو دەست بەسەرە لەلایان ئەمە ئەم كارە هەموشی بەهۆی خزمێكی زۆر نزیكی دایكم بو پورزای بوو عەریف بوو لەپۆلیسی زاخۆ و ئەو كارەی كرد بوو ئەوەبوو كە خاڵە هەمزە پێش ئەوەی بگاتە دەست توركەكان لەچەمی خاپوری دابوو لەگەڵ چەند كەسێك بەتایبەتی كەمەلەی زۆر باشی ئەزانی. تێكڕا هەموو خەڵكی زاخۆ مەلەوانی چاكن ئیتر خاڵە هەمزەم ڕزگاری بوبو. حكومەت خاڵە هەمزەمیان بەو فێڵ و تەكبیرە ناردبوو بۆ توركیا گوایە لەئەصلا خەڵكی ئەوێیەو باوكی ئەفسەری عوسمانلی بوە و دایكی خەڵكی وانەو خەڵكی ئەوێیە ئەبێ بنێررێتەوە بۆ ئەوێ هەروەها جنسیەی عێراقیشان لێ سەندبوو.



لەڕاستیشا خۆیان زانیبویان كەچی ئەكەن و كە گەیشتنە ناو دەستی توركەكان چی لێ ئەكرا بەتایبەتی تورك و عێراق ئەوكاتانە هەر زۆر زۆر ڕێك بوون.

كە خاڵە هەمزەم گەیەنرابوە موسڵ ئەوسا ڕۆمانی دایك و كوڕ لەو ڕوداوانەوە پێك هاتوە و زۆری ژیانی خاڵە هەمزەم دێنێتە بەرچاو و فیداكاری و ئازایی و قارەمانیەتی دایكی شیرینم بۆیە دایك و كوڕم پێشكەش بە دایكم كردووە.دوو ساڵ تەواو بوو باوكی هێرۆ بەربوو. ڕۆژی گەڕانەوەی بۆ سلێمانی نەڕێگاو بان بەرئەكەوت نە ئوتومبیل بەجارێك شار تاوەكو لەدێهاتەكانیشەوە خەڵك ئەهاتن تاوەكو بچن بە پیریەوە هی واش هەبوون لەچەند ڕۆژ لەوەو پێش گەیشتبونە بەغداو لەوێ چاوەڕێیان ئەكرد بوبو بە هەرایەك حكومەت چاوی زەق بوبو حەپەسابو كەس نەئەترساو گوێشیان نەئەدانێ. هەرچۆنێك بێت من و خەڵكی ماڵەكە نەمان توانی بیبینین لەبەر خەڵك تاوەكو زۆر درەنگە شەو تاوەكو ئیتر شارو ڕۆلەنەبەزەكان هێمن بونەوە و هەركەسە چو بەلایێكا. دیارە من زۆر دڵم خۆش بوو لەچەند ڕۆژ لەوەوپێشەوە كە هێشتا بەر نەبوبو شپرزە بوبوم چونكە من و باوكی هێرۆ پەیوەندیمان زۆر پتر بوبو باوكی هێرۆ وەك مرۆڤێكی پێش كەوتووی پڕهەست و ئەدیب و شاعیر و قسە خۆش و ڕوخۆش و ڕەفتار جوان و قەدو قیافە خۆشەویستەنی و پاك و تەمیز زۆر كاری تێ كردبوم و لەبەر چاوم وەك ئەسپ سوارەكەی خەو وخەیاڵی لێهاتبوو. بەڵام كە هێرۆ گەورە بوبو خلەخل بە ماڵەكەدا ڕای ئەكرد بەجۆرێكی تر چو بەپیریەوە ئەویش هەر سەیری ئەكرد و ئەیزانی ئەوە باوكیەتی و ئەوە بلەیە كە هەموو سەری مانگێك ئەچوین بۆ بەغدا بۆ چاوپێكەوتنی بۆیە سەری سوڕمابو كەوا هاتوە و ئێستە لەماڵەكەدا دێت ئەڕوات. و لەژوری گەلەی دایكی دائەنیشێت و هەڵسێت بۆیە بە

تورەییەوە ڕوی تێکرد لەدوای یەك دوو ڕۆژ و گوتی : ( دەی دەی بلەکەچ کەچ بلۆلەوە ماڵی خۆت لەسجنی مەرکەزی ).

باوکی هێرۆ دو ساڵیش لەژێر چاودێری پۆلیس حوکم درابو بۆیە ئەبو بینێرینە شارێکی تر ئەو دوساڵەو لەسلێمانی نەبێت. دیسان ئاشنای دڵسۆزی ناودار لەبەغدا کەوتە هەڵپە هەڵپ تاوەکو ڕازی بوون کەلەکەرکوك بێت لەجیاتی شارەکانی خواروی عێراق.

کاکە حەمەی دەروێش کەریم کە پورزای باوکی هێرۆ بوو زۆر پیاو نەجیب و دڵسۆزمان بوو هەر زو کەوتە هەوڵدان و خانوێکی بۆ پەیدا کردین لەنزیك ئوتێل شهرزاد کە ئوتێلی ئەوبو. گەڕەکێکی تازەیان لەنزیك ئوتێل شهرزاد دروست کردبوو هەرچەندە ئەو ناوە زۆرچۆڵیش بوو بەڵام خانوەکە زۆر لەشەقامەوە دوور نەبوو ئەو ناوە هێشتا هەر خۆڵاوی بوو بۆیە لەخۆشی کەرکوکی دڵی کورد زۆرمان پێ خۆش بوو کە ناچین بۆ متنفك و دیوانیە.

ئەو گەڕەکە دوورو تازانە هەندێ دزی تیا ئەکرا بیرمە بە ڕۆژی نیوەڕۆ پەردەی ژووری میوانەکەیان دزی کە پەنجەرەکە تەلیشی پێوەبوو تەلەکەیان بڕی بوو پەردەکانیان ڕاکێشابوو بۆیە هەندێ ئەوگەڕەکە تازانە جێ مەترسی بوون.

لەبەرئەوە لەدوای پەردە دزینەکە کاکە حەمە هەوڵی خانوی تری بۆ داین خانوێکی خۆشی باشمان دەست کەوت بەرامبەر بە ماڵی یەعقوبیەکان و نزیك خەنەقا و ماڵی سەید ئەحمەدی بەڕێزو خۆشەویست لەسەر جادەکەی کەرکوك هەولێر. پشتی ماڵەکەشمان مەکینەی دروست کردنی سەهۆڵ هەر هی کابرای خاوەن خانو بوو کابرا دەوڵەمەندبوو تورکمانیش بوو. زۆر پیاوێکی باش و نەجیب و ئازا بوو چونکە زۆر کەس ئەترسان خانو بدەن بە ماڵی برایم ئەحمەد. لەو خانوەدا زۆر ڕوداوی



خۆش و ناخۆشمان دیی ئەویش بەدەست ماڵ پشکنین و هەڵکوتانە سەرەوە لەلایەن حکومەتەوە بەڵام کاربەدەستی زۆر ئازاو شەریف هەبوون لەکەرکوك چ کورد چ عەرەب و چ تورکمان کە زۆر لەبنەوە یارمەتیان ئەداین. بیرمە جارێکیان ئێوارەیەکی درەنگ بوو لەدەرگا درا کابرایەك لەبەردەرگابوو نوسراوێکی دابەدەستمان و گوتی زو بیدەن بە مامۆستا برایم ئەحمەد.

باوکی هێرۆ نامەکەی خوێندەوە هەندێ شپرزە بوو دایکمی بانگ کرد کە دایکمی زۆر خۆشەویست و ڕێزی لێ ئەگرت لەبەر ڕەفتارە کەم وێنەکانی لەدڵسۆزی وئازایەتیدا بۆیە زۆر ڕاسپاردەو کارە نهێنیەکانی بەدایکمی ئەگوت. ئیتر کە دایکمی بانگ کردو بردیە پەنایێك و پێی گوت ئێستە دێن ماڵەکەمان ئەپشکنن بەڵام تۆ ئەبێ بڕۆیت ماڵی مام جەلال بدۆزیتەوە. مام جەلال ئەوکاتە تەلەبەی ناوەندی ( متوسطة )بو بەو منالیەش ناوی هاتبوو ناوی خۆی و چەند کەسێکی هاوڕێی تیابو کە سبەینێ ئەچن بۆ مەکتەبەکەیان ئەیانگرن. دایکم بەپەلەچوە دەرێ لەماڵ رمگ هاتەوەو گوتی ماڵەکەم دۆزیەوە لەقەڵا و بەمام جەلا گوت مام جەلال گوتی بە مامۆستا بڵێ بچین بۆ مەکتەب باشترە چونکە ئەگەر نەچین ئەبێ ئیتر خۆمان بشارینەوە مەکتەبەکەمان لەکیس ئەچێت و لەم ڕۆژانە امتیحانی زۆرمان هەیە.

یتر نازا دوایی چیان کرد هەروەها هاتیشن ماڵەکەمان بەو ئێوارەیە گەڕان و حاکمەکەشیان لەگەڵدا بوو کە نامەکەی بەپەلەبۆ باوکی هێرۆ ناردبوکە ئەگەر شتێکی قەدەغەت لەبەردەستە لایبەو لەناوی بەرە وا هاتین. ئاوها کاربەدەست و پیاوی مەردو دڵسۆز هەبوون لەناو ئەو جۆرە حکومەتە بەد ناوانەدا. لەو خانوە هەڵۆی کوڕم لە ١٩٥٢/١٢/١ لەدایك بوو هەروەها لەو خانوەشدا توشی ڕووداوێك بووین ەرخوا نازا چۆن نەی

کوشتین ئەویش کە بەرەبەیان بە نوستویی مەکینەی سەهۆڵی پشت ماڵەکەمان تەقی غاز هەمووی بەسەر خانوەکەماندا داباری و بەپەلەپروزێ و بەچاوی خەواڵو بەجلی نوستنەوە هەموو ڕامان کردە سەرجادەو هەندێکمان بە بورایی و بێ هۆشی ڕفێنرانە سەرجادەکە من ئەوەی بیرم بێ ئەو بەیانیە زوە تاریك و ڕوونە لەخەو وەك شێت ڕاپەڕیم و پەلاماری هێرۆی کچم دا بە نوستویی هەڵۆش نەبوبو لەدایك نەم ئەتوانی باوەش بکەم بە هێرۆدا و هەرچەند هێرۆ منالّ بوو سێ ساڵان بوو بەلاّم خرپن بوو گەیشتینە سەر جادە لەوانەی لەهۆش چوبو باجی زەکیە بوو باجی زەکیە هەر ئەهاتەوە ژووریّ تاوەکو لەگەلّ دایکم خالّم ونەنەو ئەوانی کە لەماڵەکە ڕزگارکەن.

لەوخانوەدا بووین کە باوکی هێرۆ ماوەی ژێر چاودێری پۆلیسی تەواو بوو توانیمان بگەڕێینەوە سلێمانی لەسلێمانی چوینە خانوێکەوە لەئەسحابەسپی چونکە ئەو خانوەی کە ئێستە زاموایە خوشکەکانی باوکی هێرۆی تیابوون و خێزانەکەمان زۆر بوبو نەمان ئەتوانی بچینە ئەوێ.

خ انوەکەی چوینە ناوی دولی فرۆشە راخ اوەنەکانی ئەگەرچی ناویا بیرنەماوە زو زو ئەهاتن سەریان ئەداین و پێیان ئەگوتین : ئەیەڕۆ پیرۆزی ئێوە بێت ئێمە ماڵمان بۆچیە بۆ ئێوە نەبێت هەر ئەوەیە تۆزێ شوێنەکەمان سەغڵەتە. ئینجا کە خاوەن ماڵەکە ئەڕۆیشتن دوای خوا افیزی. باجی فاتمە خانێکمان لەلابو هەر خزمی باوکی هێرۆش بوو زۆر گاڵتە چی و قسە خۆش بوو کە دەرگاکەی لەدوای پێوە ئەدایەوە دەستی ئەدا بەیەکاو ئەیگوت بەخوا دایکم ئەوە بە فارسی گوتیان بەشکەم چۆڵی کەن بۆمان بەلاّم پیرۆزتان بێت خانوەکە زۆر خۆش بوو کارێزێکی تیابوو ماڵەکە زۆرتری ئەترسان لەحکومەت کەنەبادا براکەیان بانگ کات یان حەپس کات و بڵێت بۆچی خانوت داوە بە برایم ئەحمەد هەر ئەو تاقە

برایەشیان هەبوو دیارە خۆ هەموو هەموو کەس هەر قارەمان و ئازا نەبوون زۆر کەسیش هەبوون بەتایبەتی ئەوانەی حاجی و کاسب بوون ئەترسان لەخەباتکەرو کە خۆپیشاندان و ناڕەزایی بەرپائەبو لەناوشار ئەوان ئەچونە کونەوەو زۆر بۆڵەبۆڵیان ئەکرد کە بۆچی ئەم هەتیو مەتیوانە دانانیشن و ناێڵن کاسبیەکەمان بکەین ئەمانە بەجارێك دونیایان شێواندوە دیارە ئەو قسانەیان لای یەکتری ئەکرد تاوەکو لای کوڕو کچ و خێزانیشیان نەیان ئەتوانی وابڵێن چونکە لەوانەبو ئابڕویان ببردنایە هەروەها ئەو جۆرە حاجی و کاسبانە بە هەموو جۆرو توانایان خەریکی کوڕو منالّەکانیان ئەبوون کە خۆیان دوورخەنەوە لەخەباتکردن و بە گژا چوونی حکومەتدا بەلاّم لەصەدا ڕەنگە چوار بیانتوانیایە کوڕەکانیان و کچەکانیان لەسەر ئەو ڕێگایە لابدەن زۆرجار کچ و کوڕی ئەو جۆرە پولەکی و ترسنۆکانە لەژێرەوەو بەدزی ئەوانەوە خەباتیان ئەکرد و تێکەڵی هەموو چالاکیەك ئەبوون بێ ئەوەی باوکیان پێ بزانێت.

بۆ دوساڵێك ئەچو کە لەسلێمانی بوین گواستمانەوە بۆ صابونکەران خانوی کاك بەهجەت عونی دەرو دراوسێی زۆر زۆر چاك و کورد پەروەرمان هەبوو. باوکی هێرۆ وردە وردە دەستی کردبو بەبینینی دەعواکانی چونکە فەلاح ئەوەندە خۆشیان ئەویست هەرچەند ئەگیرا یا بۆ مانگ و دو مانگ خۆی ئەشاردەوە لەکاتێکا کە ئەیزانی ئەگیرێت فەلاح و خەڵکەکە دەعواکانیان هەڵەگرت تاوەکو ئەگەڕایەوە بۆیە لەخانوی کاك بەهجەت عونی ژورێکی هەندێ بچوکی دەرگای بۆ خستە سەر شەقامەکە و کردی بە ژووری محامات بەلاّم بەناو ژوری محامات بوو چونکە هەمیشە کاك نوری ئەحمەدی تەها بەڕێوەبو بە قوتوە قۆندەرەی دجلەوە ئەیهێنا و ئەیبرد هەمووشی پڕپڕ بولەکاغەز و نامەی قەدەغە و بەیان و ئەوجۆرە شتانە کاك نوری ئەحمەدی تەها دوکانی پێڵاوی دجلەی دانابوو ئەگەر

یەکێکیشی پێ بگەیشتایە لەڕێگای نزیك ماڵەکەمان کە پێیان ئەگوت خێرە کاك نوری ئەوە بۆ کوێ ئەچیت بەو هەموو قوتوە دجلانەوە ئەویش پێی ئەگوتن ئەمە پێڵاون تازە هاتوون گەلاوێژخان داوای کردووە تاوەکو وای لێهات هەندێ ئاشناو خزم و کەس لێیان ئەپرسیم ئەرێ گەلاوێژ خان تۆ ئەو هەموو قۆندەرانەت بۆچیە ؟

منیش جارێك تورە بووم و چومە سەر باوکی هێرۆ و گوتم : ئەوە چیە کاك نوری هەموو ڕۆژێك بە خەڵك ئەڵێت ئەمە ئەم پێڵاو قۆندەرانە بۆ گەلاوێژ خان ئەبەم باوکی هێرۆ پێ کەنی و گوتی باشە پێی ئەڵێم ئیتر وا نەڵێت. کاك نوری هات باوکی هێرۆ پێی گوت ئەویش پێ کەنی و گوتی باشە ئیتر واناڵێم و چارێکی تر ئەدۆزمەوە.

بەینێك لەخانوەکەی کاك بەهجەت عونی بۆ چەند مانگێك بێ تەگەرەو بەزمی حکومەت دانیشتین. باوکی هێرۆش سەری قاڵ بوو تێکڕا و زۆری بە نهێنی و لەژێرەوە بەکاری حیزبی و سیاسەتەوە و بەئاشکراش هەمیشەو دائیم فەلاحە مەعمیلەلادێکانی بەڕێوە بوون بۆ دەعوا و شکاتەکانیان لەدەرەبەگ و زۆردار کە غەدریان لێ ئەکردن و هەق و مافیان لێ داگیر ئەکردن. فەصل زستان بوو بەفرێکی زۆر باری بوو. باوکی هێرۆ لەگەڵ چەند هاوڕێ و ئاشنای ئەو ئێوارەیە چوبو بۆ تەعزیەی مێردی خوشکی ژنی مامە ڕەمزی فتاح ناوی عارف ئەفەندی بوو ئێمەش لەماڵەوە بووین. ماڵەکەمان زۆری کات قەڵەباڵغ بوو چەند کەسمان هەبوو لەلابوو کەوەکو کوڕو کچی ماڵ وابوون. باجی زەکیە ئەوە سەرو هەموویان بوو هەمین کچێکی شانزە حەڤدە ساڵەی خەڵکی ڕانیە بوو باجی عیسمەت ئەو چێشت کەر بوو زۆر ژنێکی لێهاتو و کەیبانوێکی دەست پوخت بوو چێشت و نانی بەناوبانگ بو پێش تر لەماڵی شێخ لەتیفی شێخ مەحمود بوو هەروەها کوڕێکیشمان لەلابو زۆر باوکی هێرۆی خۆشەویست هەروەك



دەروێش وابو ناوی مەحمود بوو پێمان ئەگوت خولەشێت خەڵکی سەرگەڵو بوو بێجگە لەخولەڕەشە کوێریشمان هەبوو ئەو لەزووەوە ، ڕەشە کوێر زۆر ڕوداوی پێکەنین و قسەی پێکەنینی هەبوو ئەویش هەر لەمناڵیەوە پورێکی باوکی هێرۆ بەخێوی کردبوو.

هەروەها ئەو ماوەیە براێکیشم لەزاخۆوە هاتبوەلامان ئەویش توشی تەگەرە بوبو لەگەڵ دەرەبەگی زاخۆ و لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی ڕایان کردبوو بۆ سلێمانی بۆلامان براکەم ناوی صباح بوو دیارە لەدایکم نەبو بەڵام زۆر خۆشەویست بوو لەلامان هەروەها خوشك و برای باوکی هێرۆشمان لەگەڵ بوو کە باوکی هێرۆگەڕا بوەوە لەتەعزیەکە شەو لەدرەگا ئەدات صباحی برام و ڕەئوفی برای باوکی هێرۆ ئەکەن بە شەڕە گاڵتە ئەو ئەڵێت من ئەچم ئەو ئەڵێت من ئەچم دەرگا ئەکەمەوە لەژوورەوە. لەبەر دەرگاش کە باوکی هێرۆ لەدەرگاکە ئەدات گورج ڕوو وەرە گێڕێت بۆ کۆڵانەکە لەوکاتە یەکێ بە دەمولوتی پێچراوەوە بۆی دێتە پێشەوە و تەقەی لێ ئەکات دوایی ڕائەکات. باوکی هێرۆ بریندار ئەبێت ئیتر ئەمانیش لەژوورەوە بە پێ کەنین و گاڵتەو شەڕە شەقەوە کە دێن و دەرگا ئەکەنەوە باوکی هێرۆ بەکەوتویی ئەبینن و دەست ئەکەن بە هاوار هاوار منیش ڕام رد بزا[illegible] چیە کە ئەو دیمەنەی باوکی هێرۆم دیت ئیتر ئێستە بەباشی بیرم نیە کە چیم کردبوو هەر ئەوەندەم لەبیرە کە هەڵەبەزیم و هەڵەپەڕیم و خۆم ئەدا بەئەرزا ڕێکەوتێکی سەیر ئەو ئێوارەیە میوانمان هەبوو خۆم گۆڕی بوو مێخەك بەنیشم لەملابوو بۆیە لەگەڵ هەڵبەزین و خۆدان بەئەرزا خرنگ و هوڕی مێخەك بەنەکەم ڕۆژە ڕێیەك ئەڕۆیشت وەکو مەسەلەکە گوتەنی دراوسێ داڕژان بەسەرمانا باوکی هێرۆ گەیەنرایە خەستەخانە شار شێواو شڵەژا بەماوەی نیو سەعات و سەعاتێك دیسان جادە و شەقام وەك ڕۆژی حەشرو تۆفانی لێ هات لەبەر جەماوەر و خەڵکی دڵسۆز و بەشەرەفی

شاری سلێمانی شاری هەڵمەت و قوربانی خۆشەویست باوکی هێرۆ عەمەلیات کرا ناوسکی هیچی بەرنەکەوتبوو گولەیان پێ نەدۆزرایەوە کەلەخوار کەلەکەیەوە چوبوە ناو سکیەوە بۆیە بەخەڵك گوترا کە سەلامەتە حکومەتیش لەبەر خەڵك و ترسی ئەو دەریا و لافاوی جەماوەرە توڕەیەی بەشەقامەکانەوە پۆلیس و ئوتومبێلی پۆلیسی دەرکرد و کەوتە گەڕان و پیاچوون و هاتن و چوونە خەستەخانە دوای ئەوەی باوکی هێرۆ بەهۆش هاتەوە و بەنج بەری دا چوون بۆ لای قسەیان لێ وەرگرت کە ئەمە کێ بوو شك ئەخاتە سەر کێ ، باوکی هێرۆ گوتی شك ئەخەمە سەر ( حەمە ئاغا )ئەگەرچی حکومەتیش لەخوای ئەویست ئەگەر برایم ئەحمەد ئەو شەوە و بەو گولانە لەناو بچوایە بەڵام نە حکومەت و نە حەمە ئاغا بەختیان نەبو برایم ئەحمەد هیچی لێ نەهات بەڵام حکومەت لەترسی خەڵك چوون حەمە ئاغایان گرت و خستیانە حەپسخانەوە چونکە ئەگەر نەیان گرتایە دوای ئەوەی جەماوەر زانیان لەوانەبو بچونایەتە سەری و خراپیان بەسەر بهێنایە و هەروەك هەندێ کەس گوتیان کە ئەم گرتنە بەتەکبیری هەردوولا بوو حکومەت و حەمە ئاغا هەرچۆنێك حەمەئاغاش چەند ڕۆژێك حەپس بوو نان و چێشت و سفرەو سینی بۆ ڕەوانەی حەپسخانەکرا بۆیە خەڵکیش هەندێ ئارام بونەوە هەرچەندە حەمە ئاغا کاتی خۆی لەگەڵ مامە ڕەمزی مامی باوکی هێرۆ زۆر خەباتی کردبوو لەکاتی شەڕی بەردەرکی سەراو ناوبانگی بڵاو بوو بەڵام نازا□□ بۆچی لەو ئاخرانە وەکو دەرەبەگێك غەردی لەفەلاح ئەکرد باوکی هێرۆش لەسەر فەلاحی ئەکردەوە.

دوای دوو ڕۆژ چەند کەسێکیان بردە لای باوکی هێرۆ لەخەستەخانە و ڕیزکران باوکی هێرۆ لەسەر کورسی چەرخی بەناویان تێ پەڕی و سەیری کردن و هەر گورج دەستی درێژکرد بۆ کابرایەك و گوتی : ئەمەبوو تەقەی لێکردم. هەر ڕاست خۆی بو و بۆ سبەینێ گیرابوو هێنرا بۆلای باوکی



هێرۆ لەگەڵ چەند کەسێکی ترو هەر زوو ناسیبویەوە زەلامەکە چوبولەئوتێلێکی ئەوقاف خۆی شاردبوەوە چەند هاوڕێیەکی لەگەل بوبو ئەو شەوە یەکێ لەهاوڕێیەکانی گیرابوو بەڕێکەوت ئەویش توش بوبو لەگەڵ شەقاوەیەکی چەقۆکێشی ناوی فەرەج بوو.

کابرای گوناه بار کە باوکی هێرۆ ناسیەوە گیراو هەر زو ( اعتراف )ی کرد کە حەمە ئاغا ناردبوی برایم ئەحمەد بکوژێت و پارەش پێشەکی دابویێ و دوایش هی کەی ئەدایێ.

حەمە ئاغا بۆیە ناردبووی برایم ئەحمەد بکوژێت چونکە لەسەر فەلاحی ئەکردەوە و دەعوایێکی لەبەر دەست بو هی فەلاحەکانی ئاوبارەو بەکرەجۆ بوو کە لەگەڵ حەمە ئاغا بوو دەعواکەی لەبڕانەوە بو و بردبویەوە و فەلاحەکان سەرکەوتبوون ئیتر ئەویش ناردبووی کە برایم ئەحمەد لەناو بەرێت تاوەکو ئیتر لەسەر فەلاح و جوتیار نەکاتەوە ئەم ڕووداو و بریندارییەی باوکی هێرۆ بو بەمەسەل ئەگەر دوو کەس لەسەر کارێك ببوایە بە دەمەقاڵێیان خاوەن حەقەکە بەوی تری ئەگوت : ئوە خوایە هەقەکەم وەکو هەقەکەی برایم ئەحمەد لێبکەی وەکو ئەو هەقەکەم لەفلانە کەس بسێنی. چونکە ئەوەی بەسەر ئەو شەقاوەیە هات هەر بەسەر هیچ گوناه کارێك نەهاتووە. هەر دوای مانگێك حکومەت ویستبوی بیگوێزێتەوە بۆ حەپسخانەی هەڵەبجە و ئەو ناوە یا ڕاستتر بۆئەوەی بەرەڵای کەن و بڵێن ڕای کرد لەڕێگا هەندێ قاچاغچی تەقە لەئوتومبیلی پۆلیس ئەکەن و یەکسەر بەر ئەو شەقاوەیە ئەکەوێت و هەر پارچەی مێشکی لەو ڕێگایە بەبەردێکەوە ئەنوسێت. حەمە ئاغاش هەر دوای چەند مانگێك کوڕێکی زۆر باشی و چاك بوو لەهەموو کوڕەکانی تری باشترو و خۆشەویستر بو لەلای خەڵکیش بەباشی باسی ئەکرا ، لەسەربان ئەبێت دەمانچەو تفەنگ و گی ولی بە دەستەوە ئەبێت وابزا□□ وتیان چەوری ئەکردن و پاکی ش

ئەکردنەوە ئەوەیلن بەبشی نازا[illegible] بەلاًم دەمانچەکە لەدەستی دەرئەچێت یەك سەر بەر سەری ئەکەوێت و دەست بەجێ بۆ خۆی ئەمرێت. ئەگەرچی کوڕەکە گوناح بو و گوناحی ئەونەبوو بەلاًم خوا حەقی برایم ئەحمەدی واکردەوە. بۆیە خەڵك و خاوەن هەق و شکات ڕوویان ئەکردە ئاسمان و ئەیانگوت : ئوە خوایە هەقەکەم بەهەقی برایم ئەحمەد بکەی.

باوکی هێرۆ بەرەو چاك بوون ئەچو برادەرە دڵسۆزەکانی دەوریان دابوو کاکە عومەر دەبابەی دلێرو خەباتکەری قارەمان هەر بەدیار باوکی هێرۆ وە بوو شەوانیش لەخەستەخانەکە ئەنوست باوکی هێرۆ ئەوەندەی نەمابو بێتە دەرێ لەخەستەخانە میوانی هاتبوو دانیشتبو لەگەڵیان کەلەپڕ ئەڵێت ئەمە چیە شتێکی زۆر ڕەق لەلای ڕانمە زۆر ئەزیەتی دام کە دەستی بۆ برد و دکتۆر هاتن سەیر ئەکەن گولەکەیە چوە لەوێ گیری خواردووە هەر ڕاست لەژێر پێستی ڕانیەوە بوو هەر بەچاو تروکانێك هێنایانە دەرێ گولەکە نەتەقی بوو. باوکی هێرۆ گەڕایەوە ماڵی برادەران کەوتنە خۆیان لەپێش هەموو شتێکا چوون دوو پەنجەرەی ژووری نوستنیان هەڵچنی کەلەسەر کۆلاًن بوو ئێستەش ئەو پەنجەرانە واماون لەخانوەکەی کاك بەهجەت عونی لەصابونکەران هەموو برادەران دەمانچەیان هەڵگرت لەگەڵ باوکی هێرۆش ئیتر وریابونەوە و ئاگایان لەهاتوچۆ و جولاًنەوەیان بوون ئەم هەموو کاتەو کاتی ئەو ڕوداوانەش خاڵە هەمزەم هەر شاراوەو قاچاغ بو لەحکومەت و لەژێر زەمینان و لەدێهات و ئەو شوێنانە ژیانی بەسەر ئەبرد و خەریکی چالاکی بوو.

چەند مانگێك تێ پەڕی کردبوو کە حکومەت قەرارێکی دەرکرد کە ئەندامانی پەرلەمان هەڵەبژێرن کوردەکانیش ئەتوانن و بۆیان هەیە نوێنەرانی خۆیان دەست نیشان کەن و هەڵیان بژێرن ، گوایە حکومەت ئیتر نیازی باشە و حەز ئەکات دڵی هەموو کوردێك ڕاگرێت لەهەرچ لایەن و



حیزبێکیش بن. ئەوکاتە باوکی هێرۆ بە سکرتێری پارتی دیموکراتی کوردستان هەڵبژێرابوو بۆیە پارتی ئەوی تەرشیح کرد هەروەها خوالێخۆش بوو معروف بەرزنجیش حیزبی شیوعی تەرشیحی کرد ئیتر خەڵك کەوتنە خۆیان و دڵیان خۆش بوو دەستیان کرد بە دیعایە نوسین لەسەر دارو بەرد و دیوار تاوەکو پردەکەی قلیاسانیش کە ئەوکاتە ١٩٥٤ زۆر دەشت و چۆڵ بوو خەڵك لەسلێمانیەوە ئەچوون بۆ ئەوێ و سەرچنار بۆ سەیران بە ئوتومبیل هەروەك بچن بۆ شارێکی تر ، ئێستەش لەپردەکۆنەکەی قلیاسان هەندێ لەنوسینەکە ماوە کە ئەڵێت ( إنتخبوا إبراهیم أحمد )لەگەڵ ئەو نوسین و دڵخۆشیەی خەڵك هەر دوای دوسێ ڕۆژ برایم ئەحمەد گیرا و بەکەلەپچەوە ڕەوانەی حەپسخانەی موسڵ کرا هەروەها کاك معروف بەرزنجیش گیراو ڕەوانەی شوێنێکی ترکرا ئەمە بەخێرێ نوێنەری میلەتن و میلەت هەڵیان ئەبژێرێ کەچی خرانە حەپسخانەوە. ڕۆژی هەڵبژاردن هات کەلەمزگەوتەکانی سلێمانی و لەشارۆچکەکانی و دێهات شوێنی دەنگ دان ئامادەکرابو لەژێر چاودێری پۆلیس و حکومەت خۆی ، من زۆر دڵتەنگ و ناڕەحەت و چاو بەفرمێسك بووم لەبەر باوکی هێرۆ بۆیە ئەو بەیانیە لەدایکم پاڕامەوەو گوتم توخوا دایەگیان ڕێم بە کە بچم منیش سەیری ئەو دەنگ دانە بکەم بزا[illegible] چۆنە لەم مزگەوتەی نزیکمان ( تێبینی تاوەکو بوبومە دایکی چوار پێنج مناڵیش هێشتا بەبێ پرسی دایکم نەئەچومە هیچ کوێ هەروەها بۆ چوونە گەڕان و شایی و شتی واش پرسم پێ ئەکرد کەچی لەبەرکەم ) من وابووم و بڕوام بە دایکم بوو. ئەوکاتە تەنیا هێرۆ و هەڵۆم هەبوو بۆیە کە دایکم ڕازی بو بڕۆم ئەویش چونکە زۆرم لێ کرد وەکو شتێك وەزعی دەرونیمی ئەزانی بۆیە هێشتی بڕۆم لەگەڵ دوسێ ژنی خزممان چوینە نزیك یەك دو مزگەوت خەڵکێکی زۆر و بێ ژمار لەشەقام و ناو مزگەوتەکانا بوون گوێم

لێ ئەبوو ئەوانەی ئەچونە ناو مزگەوتەکە لەو کەسانەیان ئەپرسی کە دەنگیان دابو و ئەهاتنە دەرەوە ئەیان پرسی ها چۆنن دەنگ بۆکێ ئەدەن ئەوانیش بەخۆشی و سەرکەوتوانە وەرامیان ئەدانەوە و ئەیانگوت ئینجا لەبرایم ئەحمەد زیاتر هەیە. هەمووی هەر برایم ئەحمەدە.

نوێنەری حکومەتیش کاک عەلی کەمالی خوالێخۆشبو بوو. ئاخری ئێوارە داهات لای هەموو خەڵکی شار ئاشکرا بو کە برایم ئەحمەد لەهەموو لایەکەوە لەشارو لادێ و شارۆچکەکانی سەربە سلێمانی هەر ئەو دەرچوو چ دەرچونێکیش بە( تەزکیە ) ئێوارە جادەو شەقام هێمن بونەوە و خەڵك گەڕانەوە ماڵەکانیان بۆ ڕۆژی دوایی هەموو بەر ڕادیۆکانیان دانیشتن چونکە ئەبو لەگەڵ دەنگ و باسی ئێوارە نتیجەی هەڵبژاردنەکەش بڵاوبکرێتەوە ڕادیۆ دەستی پێ کرد و باسی هەڵبژاردنی یەکە یەکە شارەکانی عێراقی کردو ناوی دەرچوەکانی ئەگوت دوایی گەیشتە سەر شارەکانی کوردستان گویندەی ڕادیۆ لەسەر قسەکانی ڕۆیشت و گوتی لەسلێمانی نوێنەری حکومەت عەلی کەمال بەتەزکیە و لەصەدا صەد بردیەوە کاک عەلی کەمال پیاوێکی باش بوو زۆر یارمەتی کوردی ئەدا لەژێرەوە بەڵام نوێنەری حکومەت بوو. هەر ئەوەندە گویندەی ڕادیۆ ئەو قسەیەی لەدەم هاتە دەرەروە خەڵك بەجارێ وروژان و ڕاپەڕین و یەکسەر بۆ کۆڵان هەرکەسە بە دارێکەوە لەکۆڵانەکانەوە خەڵك و جەماوەر وەك لافاو ڕژانە سەر شەقامەکان و بۆ بەردەرکی سەرا بە خۆپیشاندان و بە بڕوخێ بڕوخێ و ئیتر ئەوەی لەدەمیان ئەهاتە دەرەوە تاوەکو درەنگە شەو ئەوە حاڵی گەنج و پیرو ژن و پیاوی سلێمانی خۆشەویست و پاڵەوان و قارەمان بوو بۆ بەیانی خۆیان ڕێکخستەوە و دیسان ڕژانەوە سەر شەقامەکان و بەرەو بەردەرکی سەرا. مامە ڕەمزی فەتاحی مامی باوکی هێرۆ بەیانی زو هات بۆلامان و ڕووی تێ کردم وگوتی نەچیتە دەرەوە هەر بۆ ئەوە هاتوم



کە پێت بڵێم نەچیتە ناو خۆپیشاندان منیش قسەم نەکرد تاوەکو مامە ڕەمزی گەڕایەوە زۆر نائارام و پەشۆکابو لەبەر زروف و وەزعەکە بۆیە هەر ئەو ڕۆیشتە دەرێ لەماڵەکە دوای ماوەیەکی کورت لەدەرگامان درا چوین بزانین کێیە لاو و پیرو ژن بوون هەر ئەڕۆیشتن هەموو تێڵاو شتێکیان پێ بوو هەندێکیان لەدەرگایان دا گوتیان دارتان هەیە. ئێمە کە دەرگا ئەکرایەوە دالانێك بو لەو دالانە دارمان کەڵەکە کردبوو بۆ بەکارهێنانی نان و چێشت و زستان ، هێشتا نەمان گوتبو دار هەیە یا نیە پاڵیان بەدەرگاوە ناو پەلاماری دارەکانیان دا ، داریش زۆری نارێك و ئەستوربو بەڵام باشەکانیان هەڵبژاردو کەوتنە ڕێ لەگەڵ بەقوربان و خواتان لەسەر بێ خوا ئاگای لێتان بێ بێ ئێمە.

لەبەرئەوە خۆمم پێ نەگیراو دیسان لەدایکم پاڕامەوە و گوتم بشمکوژن هەر ئەڕۆم ، ئەگەرچی نامەوێت قسەی مامە ڕەمزی بشکێنم بەڵام هەر ئەڕۆم تا دایکم گوتی چۆن و چی و ئاخر چۆن ئەبێت من لەشەقامی صابونکەران بووم لەگەڵ یەك دو ژنی خزم و ئاشنا عەبام لەخۆم بەچاکی پێچابو لەترسی مامە ڕەمزی نەوەکو توشی بومایە چونکە زۆرم ڕێز لێ ئەگرت و حەزم نەئەکرد قسەی بشکێنم و نەشئەکرا کەنەڕۆمە ناو ئەو هەموو خەڵکە خۆشەویست و دڵسۆز و قارەمانە.

ئێستە کە ئەم باسە ئەنوسم دیمەنەکەم لەبەرچاوە لەدوای ئەو هەموو سالەکە گەیشتینێ چیم دیت ؟ تەمەن و عومرم گەیشتوە بەم عومرە نەلەفلمی سینەمائی و نەلەهیچ ڕوداو تۆفانێك شتی وکو ئەو ڕۆژەم نەدیوە. دیارە زۆر کەسی خەڵکی شار ئەو ڕۆژەیان چاك لەبیرە ، دیارە ئەوانە لەناو ئەو ڕوداوانە بوون بە پێی تەمەنیان.

بەردەرکی سەرا وەك دەریایێکی شەپۆل بە ئاسماندا چووی تۆفانی لێهاتبو پیاوی حکومەت و جلی خاکی و جلی ڕەنگی بۆری جەماوەر و

عەبای ڕەشی ژنانی بەشەرەف و قارەمان هەمووە تێکەڵ یەك بوبون جار لافاو و شەپۆلەکان ئەیانشکاندەوە بۆ بەرەو سەرادا کە حکومەت ڕایەکردە دواوە کاتێ جەماوەری پاڵەوانن هێرشیان ئەکردە سەریان و پەلاماریان ئەدان بەدارەوە ئەوەندەی پێ نەچوو کە دەریا و شەپۆلەتوڕەکان بەلای فلکە و شەقامی ئەسحابەسپی دا هەڵگەڕایەوە کاتێ حکومەت ئەگەڕانەوە سەر جەماوەر بەتێلا و قۆناغە تفەنگەوە لەپڕ یەکێ لەبرادەرانی باوکی یرۆ منی دیی نازا چۆن منی ناسیەوە چونکە لەبەر مامە ۆەمزی چاك خۆم پێچابوەوە تەنیا سوچی دەمو چاوم بەدەرەوە بو هاتە لامەوە و گوتی گ ئەوە بۆ هاتوی بڕۆرەوە ماڵێ. وتم ۆ حەز ئەکەم مشی لیرە بەپەلەگوتی نەنە بڕۆرەوە ماڵێ ئێستە پۆلیسێك دارێك ئەکێشێت بەسەرتا بەزمەکە قوڵترو خراپتر ئەبێت. ناچار ملی ڕێگام گرت و گەڕامەوە ماڵێ بەرەو صابونکەران سەرکەوتم کە گەیشتمە ناو کۆڵانەکەمان کەیەکەم خانوو ماڵی میرزا عەبدوڵلا بووکە فاتمە خانی ژنی خزمی باوکی هێرۆ بوو دوای ئەو خانوە هەر لەڕیزەکەیان دوسێ ماڵی تر بوون ئەوانیش یەکێکیان ناوی حاجی عەبدوڵلا بوو کە هەر ڕێك بەرامبەر ماڵەکەمان بوو تەنیشتمان ماڵی عەزیزی میرزا صالح بوو ژنەکەی سەبری خان بوو دایکی سوڵاف و خێزانێکی زۆربوون لەتەنیشیان دوو خانوی عونی ئەفەندی بوو کە کۆڵانەکەم بڕی و نزیك ماڵەکەمان بووم وشك بووم و سڕ بووم چونکە ئەوەندە لەشکر و پۆلیسی سوارە بە وڵاخەوە دورەماڵیان دابوین کە لەژمار نەئەهاتن.

لەخوار ماڵەکەمانەوە خانوی تازەیان دروست ئەکرد لەبەرئەوە بەردێکی زۆریـان لـەوناوە کەڵەکـە کردبـو لەخواریشـەوەە مەکینـەی ئەلـەکتریك بـوو هەروەها لەولاتریشەوە ماڵی حەمە سەعید خەیات بوو و ماڵی پـورە فـاتمی پوری باوکی هێرۆ بوو کە زۆر پـورێکی خۆشەویستمان بو لەولاتریشـەوە



مـاڵی بـاوکی هونەرمەنـدی دەنـگ خۆشـی و هەڵکـەوتو شـەماڵ صـائب بـوو ئیتر کە چاوم بەو هەموو پۆلیس و عەسکەرە کەوت شڵەژام و نەمزانی چی بکـەم چـونکە ئـەو بەردانـەی لـەوناوە کەڵەکـە کرابـوون بـۆ خـانوو دروسـت کـردن هـەر بـەردەی دو سـێ پـۆلیس و ئـەمنی بەسـەروەبو. چـارم نـەما بـە پەشـۆکاوی و بەپەلەلەدەرگاکەمـدا و چـومە ژورێ. دایکـم هـات بەگـژما و گـوتی : بـەس نـەبو هیچیـان پـێ نـەگوتی و هێشـتیان بێیتـە ژورێ تـۆزێ لـەوەوپێش پـورە حـەبێ کـە ئـەویش ( پـوری بـاوکی هێـرۆ بـوو ) هـات لەدەرگاکەشـی دا نـەیان هێشـت بێتـە ژورێ و بوبەشـەڕ پـورە حـەبێ تـوڕە بوبو جنێوی پێ دان ئەڵێن دو سێ قۆناغە تفەنگ یـان کێشاوە بـە شـان و ملیا بەسەزمانە و ئێستە نازانین چی لێهات. هەرچۆنێك بو هـەموو خزابونـە ژورەوە دایکم خەریکی مناڵەکان بوو پورە فاتم و بـاجی زەکیـەو ئـەوانی تـر هەموو هەر بۆلەبۆڵیان بـوو خـەریکی جنێـودان و دوعـا لێ کردنـی حکومەتـە بەدناوەکەی ئەوکاتە بـوون. بـەلام تەگـەرەوە موشـکیلەی هـەرە گەورەکـەمان خولەشێتەکەمان بو ئەو هەر بەجارێك شێت بوبو چونکە زۆر توڕەبوبـو لـەو هێـرش و هێـزەی دەورەیـان دابـوین و کـە نەشـیا ئەهێشـت بچینـە دەرێ و هـەروەها دەمـی خۆشـی نەئـەگرت ئـەمان زانـی خـۆی ئێسـتە بەقەڵبەیـەك ئەدات بۆیە سەرباقی دەردان دائم خەریکی ئەو بووین و ئەچوین بەگژیا کە دانیشێت و هەندێ تەحەمولی هەبێت ئاخری بەناچاری ڕاهاتین و وەکو دیل و حەپس لـەکونی ژورەوە دانیشـتین نـە کەسـیان ئەهێشـت بێتـە لامـان و نـە ئەبو ئێمە بچینە دەرەوە بەهـەرجۆرێك بـوبێ ئـەو شـەوەشمان بەوحالـەبردە سەر بێ ئەوەی هەر ئاگامان لـەڕووداوی سـەر شـەقام و گـرتن و بڕینـی ئـەو خەڵکـە خۆشەویسـتە بێـت ڕۆژ بـوەوە خـەریکی بەرچـایی کـردن و نـان خواردن بوین کە وەکـو شتێك خۆمـان بـەو کارانـەوە ئەخلافانـد ئـەگینا کـێ دڵـی و ئیشـتیهای هـەبو نـان بخـوات. لەهەمووشـی ناخۆشـتر خالەمحەمـدم

نەخۆش کەوتبوو چەند ڕۆژ لەوەوپێش هەمومان شپرزەی ئەویش بووین.
خالەمحمد لەگرتن و هەڵهاتنی خاڵە هەمزەم و لەنەفی و ئەم بەرو ئەوبەر و دەست لەکار کێشانی و کە خۆی دەرچوی کولیەی عەسکەری بوو زۆر زیرەك و لێهاتوبو و گەنج بو. و تا ئێستەش ئەوە نەبو کە دانیشێت بێ ئیش و بێ کار بۆیە ئەو زروفە نالەبارە زۆر کاری تێ کردبو زو زو نەخۆش ئەکەوت بە تایبەتی کە باوکی هێرۆ توشی گرتن و حەپس و تەگەرە ببوایە ئیتر ئەوە هەر بەجارێك نارەحەت ئەبو نەخۆش ئەکەوت بۆیە لەو ماوەیە زۆر نەخۆش بوو. ئەو بەیانیە دوای بەرچایی و لای چێشت هەنگاو سەعات ١١ و ئەو دەورە لەپڕ گوێمان لەگرمە و تەقەو پیا کێشانی دەرگاو پەنجەرەبو بێ ئەوەی بتوانین بزانین چیە. حەمامی ماڵەکە لەتەنیشت ژوری نوستنەکەمان لەسەر کۆڵان بو پەنجەرەیەکی زۆر بەرزی بچوکی هەبوو منیش بەئەسپایی چووم کورسیەکم بردە حەمامەکەو چومە سەری و چاوم نا بەو پەنجەرە بەرزە بچوکەوە بەلاّم چیم دیت ؟؟ دیتم هەرچی ژنی دراوسێمانە بەجلی کوردی خۆیانەوە ڕژاونەتە کۆڵان بەتایبەتی ماڵی حاجی عەبدوڵلاّ ی بەرامبەرمان و ژنی زۆری تر بەبەرد لەپۆلیسەکان ئەدەن شۆ بەردیان پیائەکێن و ئەلێن نەوا ئەو جنێوانەی بە برایم ئەحمەدی ئەدەن بۆ نوری سەعید و عەبدوڵلاّ بێت.

نوری سەعید سەرۆك وەزیری عێراق بوو هەموو شتێکی حکومەت هەر ئەو بوو. عەبدوڵلاّ یش خاڵی مەلیك فەیصەلی بچوك بوو وصی مەلیك بوو لەگەڵ نوری سەعید هەرچی بەدکاری دونیا هەبوو هەر ئەوان ئەیانکرد فەیصەلی هەتیوی منالّی قوڕبەسەر هەر ئاگای لەهیچ نەبوو هەروەك دیکۆر وابوو. بۆیە ئەوژنانە وایان ئەکرد و وایان ئەگوت. تەمز کە پۆلیس و سوپا پەنجەرەوە دەرگاکەمانیان دابوە بەر دەست ڕێژ و پارچە تەنەکەکەی سەر ژووری محاماتی باوکی هێرۆیان هەڵکەندبو کەلەسەری نوسرابو ( المحامی



ابراهیم احمد ) ئەو پارچە تەنەکەیەیان دابوە بەر گولەو شەق لەگەڵ جنێوی زۆر پیس و بێ ئابڕوانی بە دایك و ژن و خوشکی برایم ئەحمەد ئیتر ئەو ژنە قارەمان و کورد پەروەرانەیان بۆ دەرپەڕیونە دەرێ وبەبەرد و جنێو تێیان بەربوبون هەرچەند ژنەکان زۆریان دارو قۆناغە تفەنگیان بەرکەوتبو ئازاریان زۆر پێ گەیشتبو. ئینجا من لێرە ڕستیەك ڕوون ئەکەمەوە کە دراوسێکانمان بێجگە لەماڵی حاجی عەبدوڵلاّ ئەوانەی تر هەموو فەقیر و سادەکانی دەوروپشتی ماڵەکەمان بوون کە شەڕەکەیان ئەکرد لەگەڵ پۆلیسەکان وایان ئەکرد منیش هەروا بەحەپەساوی و ترسەوە سەیرم ئەکرد و نەمزانی چیبکەم کە پۆلیسێك بەسواری ولاّخەوە بەوێدا تێ پەڕی کەچی گەڕایەو و هاتە لای پەنجەرەکەوە کە من سەیرم ئەکرد لەوێوەوە و بە ئەسپایی و بەپەلەگوتی : بڕۆرەوە ژورێ زو ئێستە بت بینن گولەیەکت پێوە ئەنێن خێراکە زو ئیتر نەیەیتەوە ئێرە. پۆلیسەکە لەپۆلیسە کوردە باشەکان بوو چونکە زۆر پۆلیسی کورد لەژێرەوە لەگەڵ حیزب بوون بەلاّم دەسەلاّتیان نەبوو نەیان ئەوێرا. چوار ڕۆژ بەو حالەماینەوە بە جۆرێك ئیتر خەریك بوو نانمان نەمێنێت دوایی هەندێ دراوسێ بەدزیەوە لەسەربانەوە شتیان بۆ هێنابن.

بۆ ڕۆژی چوارەم خولەشێت فرسەتی دیت و خۆی دزیەوە لێمان و چوو دەرکی حەوشەکەی کردەوە هەندێ زبلّ و توێکلەمیوەی پێ بوو زبڵیش ئەوسا ئەخرایە ناو بەرمیلی گەورەوە هەر مالەبەرمیلێکی لەبەردەرگا بوو یەکێ لەپۆلیسەکان خەڵکی سەرگەڵو بوو خولەی ئەناسی بۆیە پێی گوت یا شێخ ئەوە چی ئەکەیت خولەش ڕاوەستا توێکڵ و زبڵەکەی ڕشتە ناو بەرمیلەکەوە و بەپێکەنینەوە گوتی ئەوە هاتوم خواردنی نوری سەعیدو عەبدوڵلاّ م هێناوە بۆیان خولەهێشتا قسەکەی لەدەما بوو کە پۆلیس ڕژانە سەری و بە قۆناغە تفەنگ و بەشەق وەك تۆپ هەڵیان دایە دەست یەك

پۆلیسە سەرگەڵوییەکە خۆی فڕێدایە سەردەست و قاچیان و بەهاوارو بەگریانەوە خولەی لەژێر دەست دەرهێنان و گوتی بۆ خاتری خوا بۆ وای لێ ئەکەن ئەمە شێتۆکەیەو لەخۆیەوە قسە ئەکات. بەڵام خولەلەخۆیەوە قسەی نەئەکرد و شێتیش نەبوو زۆر ئازابو و دڵی پڕ بوو ئیتر هات وای پێ گوتن.

خولەهاتەوە ژووری بە نیوە مردوویی بەدەم و لێوی شکاو و پڕ خوێنەوە بە گەڵ و گیپاڵی تێك شکاوەوە هەموو تێی ئالآین و بۆی گریاین بەو حاڵەش چووین بەگژیا کە بۆ وای کرد و بەقسەی نەکردین و خۆی نەگرت هێرۆ و هەڵۆ کە زۆر مناڵ بوون و خولەیان زۆر خۆشەویست دەستیان کرد بەگریان و ترسان ئیتر وەزعێکی زۆر نالەبارو شێواو و دڵتەنگکەرمان بوو. لەپڕ ڕاپەریم و دەستم کرد بەگریان و ڕام کرد بۆ تەلەفۆنەکەو بەبەدالەم گوت موتەصەریفم بدەرێ بەدالەش هەر خۆمانە بوو وەختەبو دڵی دەربێت لەداخانا بۆیە هەر زو موتەصریفی بۆ پەیدا کردم موتەصریف محافزی ئێستەیە. بەعەربی قسەم لەگەڵ کردو گوتم من خ یژ انی فلا□□ کەسم ئەمە چوار ڕۆژە پۆلیس و ئەمن و هێزێ کە دەوری ماڵیان داوین خاڵم نەخۆشە نایەڵن دکتۆر بێت بۆ لای نەکەسمان ئەتوانین چ ینە دەی بنەکس ئەتو لی بیت وۆلا م لن مناڵەکا□□ تۆقین و ئەترسن و کوڕی ماڵەکەمانیان وابەسەر هێنا ئیتر هەموویم بۆ گێڕایەوە موتەصریف الیعقوبی بو تورکمان بوو خەڵکی کەرکوك بوو. موتەصریف زۆر زۆر نارەحەت بو دڵی دامەوە و گوتی من ئاگام لەم کارە نیە هەر ئێستە خەریك ە□□ منیش زۆر سوپاسم کردێ.

دوای تەلەفونەکەم بە نزیك سەعاتێك یەك پۆلیس و ئەمن لەبەر دەرگاکەمان نەمان بگرە هەر لەکۆڵان و گەڕەکەکەش نەمان. موتەصریف زۆر پیاو دەرچوو قسەکانی ڕاست بوون بەڵام بەداخەوە لەدوای دو هەفتە



گواستیانەوە بۆ شوێنێکی تر دیارە لەبەر پیاوەتی ئەو کردەوە چاکەی بوو بۆیە لەسلێمانی لایان برد ئێمەش کەوتینە خۆمان جارێ دایکم وای ەبڵ زانی کە من و مناڵەکا□□ لەوێ نەمێنین بڕۆین بۆ بەغدا بەینێ .
لەوەوپێش ڕێسانی خوشکم درابو بەشو بە دکتۆر صدیق ئەتروش و ماڵیان لەبەغدا بوو بۆیە بەپەلەباجی زەکیە و مناڵەکان بە ئوتومبێلێکی خۆمانەی دڵسۆز سەر بەخۆمان کەوتینە ڕێ بەرەو بەغدا.

دایکیشم ماڵەکەی کۆکردەوە لەگەڵ خەڵکەکانی لامان بوون و کەل و پەلی ماڵی گواستەوە ماڵی فاتمە خانی عزەت بەگی وەسمان پاشا دایکی ئومێد هەروەها خاڵم و نەنەشی لەوێ دانا و خۆی گەیاندە کەرکوك کە خانوێکمان بۆ بگرێت و بمان گوێزێتەوە کەرکوك دایکم وای پێ باشتر بو وەك لەسلێمانی بین ئەیویست لەکەرکوك وەکو شتێك لەبەرچاو نەبین بەڵام خۆ حکومەت هەر هەمان حکومەت بو بۆیە دایکم گەیشتبوە ماڵی کاك تایری پیاو مەرد کاك تایر برای کاك عومەر دەبابە بوو زۆر بەغیرەت و ئینسان بوو زۆر ئەرك و ئەزیەتی هەموولایێکی بەسەرەوە بو لەگەڵ خێزانێکی زۆر و قەڵەباڵغ و زۆر پڕ لەبەرئەوە هەر زو دایکم لەگەڵ فاتمە خانی خوشکی کاك عومەر و خەڵکی تریش گەڕابوون و هەر زو خانوێکی باشیان بۆ پەیداکردبوو چوبون پاکیان کردبوەوە و ناردبوشی بەدوامانا کە بێینەوە لەبەغدا چونکە خانومان پەیداکرد و وا ئەچێت کەل و پەلەکان ئەگوێزێتەوە لەسلێمانی.

ئێوارە دایکم و فاتمەخان و ئەوکەسانەی لەگەڵیان دێنەوە ماڵێ کاك تایر بە سۆندەو گەسگ و سەتڵ و کەل و پەلی ماڵ پاکردنەوە و دائەنیشن خەریکی شیوکردن ئەبن کەلەدەرگا ئەدەن ئەچن ئەیکەنەوە سەیر ئەکەن پیاوێك بە ترس و لەرزەوە ئەلێت بۆ خاتری خوا کلیلی ماڵەکەمم بدەنەوە ناوێرم خانو نادەم بە ماڵی برایم ئەحمەد حەپسم ئەکەن کاك تایر ئەچێت

و دایکم و هەموویان کوڕە بابە حەپسی چی ئەوە کێ وای گوتوە ماڵی برایم ئەحمەدی چی ئەوە بۆ ماڵی زابت متقاعد محمد عەبدوڵلاَ یە دایکم دەفتەرو شتەکانی خالەمحمدمی پیشان ئەدات بەلاَم کابرا ڕازی نابێت و ئەڵێت نەنە بەخوا ئەترسم. ئیمڕۆ جاڕیان داوە لەبازاڕ کە کێ خانوو بدات بە خەباتکەر بەتایبەتی ماڵی برایم ئەحمەد گورج حەپس ئەکرێ و سزا ئەدرێت کابرا کلیلی بردو ڕۆشت.

بۆ بەیانی کەوتینە پرس و پرسیار دەرکەوت کە کەرکوك موتەصرفێکی ( محافز ) هەبوو کوردیش بوو خەڵکی سلێمانی بوو ناوی ڕەشید نەجیب بو ئەوە ئەو نەجیبە خەبەری بۆ هاتبو دیارە لەلای دەزگاکانی خۆیانەوە کە ماڵی برایم ئەحمەد هاتوون بۆ کەرکوك چوبو ئەو نەجیب زادەیە ئەو ئەمرەی دەرکردبوو ناردبوی جاڕیان دابو لەناوبازاڕەکانی کەرکوك. بەلاَم دایکم و کاک تایرو ئەوان هەر دەست بەردار نەبوون و هەر گەڕان بۆ خانوو ئەم جارە ئەو خانوەی پاکیان کردبوەوە هی تورکمانێك بوو بۆیە ئەویش دوای دو ڕۆژ بەپەلەو ترسەوە گوتبوی ( بەبەم کلیلەگەتر ) بۆ خاتری خوا. ئاخری دایکم چارێکی تری دۆزیەوە ئەویش چو بۆلای محمد بەگ کەبەهۆی جەنابی سەید ئەحمەدی خانەقاوە خانوی دابوینێ لەشاترلو کاتێ کەلەخواروی عێراق و نەفی گەڕابوینەوە ئەگینا وامان بەسەر نەئەهات ئەوکاتە سەید ئەحمەد وەفاتی کردبوو ، دایکم مەسەلەکەی بۆ گێڕابوەوە محمد بەگ تورکمان بو بەدایکمی گوتبو ئەگەرچی زۆریش ئەترسم بەلاَم بەخوا هەر ئەبێ بێ خانوتان نەکەم بۆیە خانوێکی داینێ کەلەتەنیشت ئەو خانوەوەبو کە کاتی خۆی لەناوی دابوین محمد بەگی پیاو خانوی داینێ دایکیشم گەڕایەوە سلێمانی کەل و پەلەکان و خاڵم و ئەوان بێنێت. باشە کەل و پەل چۆن ئەتوانێت بەناوئەو هەموو پۆلیس و سەیتەرەی حکومەتدا تێ پەڕێنێت چ خاوەن لۆرێك ئەیتوانی ئەو شتانە



بارکات ئەوەش بو بەتەگەرەیەکی تر. ئاخری دایکم جوابی بۆ شێخ لەتیف شێخ مەحمودی نەمرنارد چونکە زۆر تێکەڵ بوین لەگەڵیان شێخ لەتیفی خوا لێخۆشبو گوتی خەمت نەبێت من لۆریم هەیە ئەچێت بۆ کەرکوك هەموو ڕۆژێك گەچم بۆ ئەهێنێت بۆ بیناکەم بۆیە بەو لۆری گەچە شتەکان ئەنێرین. شتو مەك بارکران و گەیشتنە کەرکوك لەشاترلو لەبەر دەرگای خانو داگیران کەل و پەل هەموو گەچاوی و سپی بوبون.

بەلاَم داخم ناچێت مەکتەبە بەنرخەکەی باوکی هێرۆ لەماڵی عیزەت بەگ بەجێ مابو چونکە نەیان وێرابو لەو زروفە بیگوێزنەوە لای فاتمەخان بەجێ مابوو ئەو ئاگای لێ بوو بەلاَم خزمێکیان لەجافەکان کە ناوی ئەفراسیاو بەگ بو بۆ خۆی چوبوە ناو کتێبەکان و بە هەوەسی دڵی خۆی کتێبی بردبوو لەهەموو ئەو کتێبانەش کە زیاتر بەداخەوە بوین بۆی کەشکۆڵی شاعیری گەورەو بە ناوبانگ فایق بێ کەس بوو کە هەمووی بەخەتی دەستی خۆی نوسیبوی یاداشتی ئەو ڕۆژەی لەسەر نوسیبو وەکو نوسیبوی ، لەهەندێ لاپەڕ ە نوسیبوی کەئیمڕۆ شێرکۆ لەدایك بوو لەهەندێکی مناڵەکانی تری ئەو کەشکۆڵەبەبەهایە شەفیقەخانی خێزانی فایق بێ کەسی نەمری خۆشەویست هێنابوی بۆ باوکی هێرۆ چونکە باوکی هێرۆ زۆری خۆشەویست هەروەها ماڵ و مناڵیشی شەفیقە خان هەروەك خوشکی ڕاستەقینەی باوکی هێرۆ وابوو خۆشەویستی هەموومان بو لەگەڵ مناڵەکانی باوکی هێرۆ ئەیویست لەفرسەتێکا بۆی لەچاپ بدات کەچی ئەو بەگ زادەیە ئەو کەشکۆڵەشی دزی بوو. تا ئەو کاتەی ئێمە خەیرك بوین دائەمەزراین لەکەرکوك باوکی هێرۆ بەربوبو بەلاَم هەر گورج فەرمانی گرتنی بۆ دەرچوەوە کە گوایە چوە بۆ موئتەمەری ئاشتی خوازان ( انصار السلام ) و هەڵبژێراوە بە ئەندامێکی بەرزی لەبەرچاو و کۆتری ئاشتی ئاڵتونیشی دراوەتێ.

ئینجا باباسی ئەو کۆتری ئاشتیانە بکەم ماوەیەك دوای ئەوەی باوکی هێرۆ بریندارکرا ئەم کۆنفرانسەی ئاشتی خوازان بەرپابوو باوکی هێرۆ و هەندێك هاوڕییەکانیشی ڕۆیشتبون لەگەڵی کە گەڕانەوە ئیتر بوبە جەژنی قوربان ئەویش لەگەڵ کاك عومەر دەبابەی دڵسۆزو پیاو کردیان بە بیانوی جەژن کە بڕۆن بۆ بادینان بەتایبەتی زاخۆ کە ماڵی باوکی من و هەر نیوەی زاخۆ هەموو خزمی منن و گەڕەك و ناوچەی تایبەتیان هەبوو کە پێیان ئەگوت گەڕەکی ( قوچەبەگی ) ئیتر بەو بیانوەوە کەوتینە ڕێ لەڕاستیشا باوکی هێرۆ و برادەرانی ئیش و کۆبونەوەی حیزبی خۆیان هەبوو چەند ڕۆژێك لەزاخۆمانەوە و ڕۆیشتن بۆ ئامێدی و دهۆك و ئەوناوە بەلآم من مامەوە لەزاخۆ لای باوکم و خزمەکانمان لەگەڵ باجی زەکیە و منداڵەکا بەڕێکەوت یەکێ لەو خزمانەمان منالًیان بو منیش جەژن بوو بازاڕو دوکان نەبوو زوش ئەگەڕاینەوە چووم یەکێ لەو کۆتری ئاشتیە ئاڵتونانەم دانێ و گوتم ئەمە بۆ منالًەکەتان کۆترێکی بچوکی جوان بوو قایم ئەکرا بەیەخەوە. ئیتر ئێمە گەڕاینەوە و هەر بیرمان نەمابوو بەتایبەتی کە ئەو بەزمانەمان بەسەرهات. ئەوەبو دوایی حکومەت زانیبویان و فەرمانی گرتنی بۆ ئەو کەسانە دەرکردبو کە چوبون بۆ کۆنفرانسی ئاشتی خوازان و تاوەکو چوبون لەزاخۆ ماڵی باوکیشم گەڕابون باوکیشمیان گرتبو بۆ نەگبەتی کە چوبون ماڵەکەیان پشکنیبوو کە خێزان و ماڵی زۆر بوون ئەو کۆترەشیان دۆزیبوەوە بۆیە تا بەینێکی زۆر باوکم و چەند خزممان گیرابوون لەبەر کۆتری ئاشتی و کە برایم ئەحمەد چوبو بۆ ماڵیان ( ئۆدا خاتون ) ئیتر ئەوەبو کە باوکی هێرۆ لەسەر هەڵبژاردن گرتیان دوایی بەرەڵایان کردبو دەست بەجێ هاتن بیگرنەوە لەبەر کۆنفرانسی ئاشتی خوازان بۆیە لەگەڵ کاك عومەر دەبابە خۆیان شاردەوە و خۆیان وون کرد ئەوسا زۆرجار کە فەرمانی گرتن بۆ باوکی هێرۆ دەرئەچو زۆرتر ئەیان گەیاندە بەغدا و لەوێ



باشتر ئەشارایەوە هەروەها زۆرجار خاڵە هەمزەشم لەبەغدا باشتر ئەیتوانی خۆی وون کات بەتایبەتی ئەو براکوردە فەیلیانەمان هەبوو کە زۆر دڵسۆز و بێ وێنە بوون زۆریشیان حاڵیان زۆر باش بوو تێکڕا بازاڕی شۆرجە زۆری هی ئەوان بوو بەلآم ئەوەندە پیاو بوون بەسەر و ماڵەوە ئامادەبوون هەموو کارێکی خەتەرناك قبوڵ کەن بۆئەوەی بتوانن خەباتکەران بپارێزن. و کارەکانیان ڕایی و جێ بە جێ کەن.

هەرچۆنێك بو ئێمە دامەزراین لەکەرکوك و چوینە خانوەکەی محمد بەگی مەردو پیاو لەشاترلو. لەگەڵ خانوەکەی خۆشی کە تیابوون خانوە گەورەکەمان بەین بو کە کاتێ لەنەفی خواروی عێراق گەڕاینەوە بە هۆی سەید ئەحمەدی خانەقای نەمرەوە ئەو خانوەمان بۆ گیرابوو. ئینجا باباسی ئەوە بکەم کە بۆچی ئەم جارە وامان بەسەرهات و خانومان دەست نەکەوت کەس نەیەوێرا خانومان بداتێ بەکرێ ئەویش چونکە جەنابی سەید ئەحمەدی خانەقای نەمر نەمابوو وەفاتی کردبوو ئەگینا ئەو بمایە هەرگیز وامان بەسەر نەئەهات. هەر ڕاست ئەوبەر خانوەکەمان مزگەوتێکی گەورەو پاك و خۆش بوو هەروەها جۆگە ئاوێکیش بە درێژی ئەو شەقامە تێ ئەپەڕی و لەبەری مزگەوتەکە بوو. مزگەوتەکە دو دەرگای هەبوو ئەویکەیان لەسەر شەقامێکی تر بوو. چەند ڕۆژێك بو هەندێ بوژاینەوە کە بەیانێکیان خولەدەرکی حەوشەی کردەوە کە بچێت کولێرە بکڕێت بۆ بەرچایی کەچی قیڕاندی و بانگی کرد و گوتی وەرە ( ئۆدا ) بەدایکمی ئەگوت ئۆدا. وەرە سەیری بەر دەرگاکەمان کە چەند قەڵەباڵغ بوە و وا خەریکی ( قولڵغ ) دروست کردنن ( قولڵغ بە ژووری حەرەس و پاسەوان ئەڵێن ).

دایکم چوە بەردەرگاکەمان و هەموومان ڕامانکرد چوین بزانین چیە کەچی یەکێ لەو پیاوانەی لەوێ بوون پێکەنی و گوتی ئەوە ئەم شوێنەمان

بۆ چاودێری ماڵەکەتان دروست کرد ئەی حەز ناکەن ئەم هەموو زەلامە پێیان ەوانتان بن؟ خوا لە شوێنی وەرامی دایەوەو گوتی ئەوانە سوپاستان ناکەین پاسەوانیشمان ناوێت زەلامەکان هەندێکیان کوردی کاکەی سمێڵ بابرە بوون و هەموویان ئەمنی حکومەت بوون و ئەوە ڕەشید نەجیبی موتەصریف ( محافز ) و ئەمن ئەوکارەیان کرد بۆئەوەی کە برایم ئەحمەد گەڕایەوە ماڵێ بیگرن. قوڵغەکە تەنیشت دەرکی مزگەوتەکە دروستیان کرد لەسەر جۆگە ئاوەکە هەر ڕاست بەرامبەر ماڵەکەمان شەقامەکەی بەینی مزگەوت و ماڵەکەمان تەسك بو بەلاّم عەرەبانەی پیا تێ ئەپەڕی لەگەڵ ئوتومبیلی قەمەرە. ئیتر شەو و ڕۆژ چوار پاسەوان لەو قوڵغی دابوون و زو زو ئەگۆڕان بۆ کاتی نان خواردن.

خەڵکی گەڕەك ترسان و کەزانیان ئەمە لەبەر ماڵی ئێمەیە ئیتر ئەوەنە لێمان ترسان نەیان ئەوێرا هەر بەوێشدا تێ پەڕن ئیتر تەواو وەك دیل و حەپسمان لێ هات چەند جارێك محمد بەگ و تاقە کوڕەکەشیان بانگ کرد بۆ پرس و تحقیقات ئیتر یەك کەس و یەك بەشەر و خزم و ناسیاو نەلەسلێمانی و کەرکوك و نەلەهیچ کوێوە نەیانەوێرا هەر ناویشمان بەرن نەك بێن بۆلامان ئیتر زۆر دڵتەنگ و ناڕەحەت بووین هەرچەندە ئەمان توانی بڕۆین بۆ بازاڕو دەرەوە بەلاّم کەس بە هیچ جۆرێك نەیەوێرا بێت بەلا مانەوە زۆرجار دلتەنگ ئەبووم کە گوێم لەزەنگی دەرگای دراوسێکا ئەبو یان خزمەکانیان ئەهاتن بۆ لایان بەتایبەتی ڕۆژی جومعان ئەبو بە دەنگە دەنگیان. ئەم گوت ئۆە خوایە تۆ بڵێی ڕۆژێك لەڕۆژان ئێمەش یەکێ لەزەنگی دەرگاکەمان بدات ؟ لەو هەموو خزم و کەس و ئاشنایەمان ئەهاتن بۆلامان و گوێیان نەئەدایە هیچ و ئەوانەش نەمان. یەکەم کەس کە هەر بەین بەین ئەهات بۆلامان و گوێی نەئەدایە هیچ شازادەی خۆشەویست مریەم خانی سەید ئەحمەدی خانەقا بوو.



دوهەم کەس ناهیدە خانی ژنی کاك ئەحمەد ڕەفیقی پیاو مەرد کە ئەوکاتە مدیری شەریکەی نەوتی کەرکوك بوو گوێی نەئەدایە و هەر چەند ڕۆژجارێك ناهیدە خان ( دایکی بەختیار ) سواری ئوتومبیلەکەی ئەبو و ئەهات لەبەر دەرگاکەمان ڕائەوەستا و ئەهاتە ژووری بۆلامان بەدەست و دیاریەوە هەرچەندە پێمان ئەگوت کچێ دایکی بەختیار گیان ئەها ژمارەی ئوتومبێلەکەتیان نوسی و ئێستە خەبەرتان لێ ئەدەن بە توڕەییەوە ئەیگوت چاویان دەربێ بەخوا هەر دێم ئەگەر چی بوە باوکی بەختیار قەیناکە نایەت بەلاّم زۆر دڵی لاتانە و منیش هەروەها بۆیە هەر دێم هەرچیەك ئەقەومێت بابێت.

سێهەم کەس کە ئەهات بۆلامان کاك تایری برای کاك عومەر دەبابەی دڵسۆزمان بوو کاك تایر دائیرەکەی هەندێ نزیك گەڕەکی شاترلو بو ، کاك تایر موهەندیس مساح بوو بۆیە هەموو نیوەڕۆیەك کەبەر ئەبوون و دائیرە تەواو ئەبوو ڕۆژناڕۆژێك یەکسەر ئەهات بۆلامان و لەدەرگای ئەدا ئیتر بەویشمان ئەگوت : توخوا کاك تایر گیان ئێستە تۆش ئەگرن ئەیگوت منەتیان نەبێت ئینجا لەچی بترسم هیچ ماوە نەیکەن ئەم واوا لێکراوانە ئەکەوتە جنێودان پێیان و قەت نەئەترسا.

چوارەم کەس کاکە حەمەی دەروێش کەریمی خزمی باوکی هێرۆ بوو کە ئوتێل شهرزادی هەبوو لەکەرکوك ئەو زۆر ئاگای لێمان بوو هەرچەندە خۆی نەئەهات بەلاّم هەندێ جار فەیمەخانی ڕەحمەتی ژنی ئەهات هەروەها جاربەجار شاگردێکی قەڵەوی پیاوچاکی هەبوو ناویم لەبیر نەماوە ئەینار بۆلامان.

هەروەها پێنجەم کەس کاك عەزیز عەبدوڵلاّ محامی بوو کە دایکی خزمی نزیکی باوکی هێرۆیە و باوکی هێرۆ لەگەڵ خۆی کاری محاماتی پێ ئەکرد ئەو تازە دەرچوبو بۆیە کە باوکی هێرۆ گیرا دوایش خۆی

شاردەوە دەعواكان ئەو بەسەریانەوە بوو لەسلێمانی بۆیە یەك دوجار كاك عـەزیز هاتـە لامـان بەفـەردە بـرنج و هەنـدێ پـارەوە. هەرچـەندە چـەند جارێكیش گرتیان بەڵام هەر ئەهات لەسلێمانیەوە لەدەرگاكەوە شتەكانی ئەدایە دەستمان و تۆزێ دائەنیشت و ئەگەڕایەوە پوری باوكی هێرۆش پورە فاتم كە بەبێ ئەندازە باوكی هێرۆ و ئێمەی خۆشەویست هەرچەندە زۆر ترسنۆكیش بوو لەپۆلیس زۆر ئەترسا بەڵام قەت بەرەڵای نەئەكردین ماڵ و مێردو هەموویانی بەرەڵا ئەكرد و ئەهات بەدیارمانەوە دائەنیشت.
پـورێكی تریشـی هـەبوو نـاوی پـورە حـەبێ بـوو ئـەوەی پۆلیسـەكان دارو قۆناغە تفەنگیان پیاكێشابوو زۆریان ئەزیەت دابوو ئەویش یەكجار هات بۆ كـەركوك بۆلامـان هـەروەها پورێكیشـم خوشـكی بـاوكم ئـەو هـەر زۆرجـار بەدیارمانەوە ئەما ئەویش ماڵەكەی لەگەڵ دایكم گواستەوە لەسلێمانیەوە بۆ كەركوك ئیتر وەكو مەسەلەكە ئەڵێت ئاو بێنەو دەست بشۆ تەواو یەك كەس لەزەنگی ئەو دەرگایەمانی نەئەدا نەیان ئەوێرا بێن بەلامانەوە.
سەرەڕای چاودێری ئەو پاسەوانە زلحۆرتە سمێڵ باپرانەش كەچی هەر دوسێ ڕۆژجارێك ئوتومبیلی ئەمن و پۆلیش دائەڕژانە كۆڵانەكە و ئەهاتن ماڵەكەمانیان ئەپشكنی دیسان ئەكەوتنە ئەم ژوورو ئەو ژور وسەرو خوارو سـەرو ژوور ئـیتر لەگەڕەكەكـە وەك گولمـان لێهـاتبو كـەس نەیـەوێرا بەبەردەرگاكەشمانا تێ پەڕێت. ڕۆژێكیان دیسان دایان لەدەرگا ووروژمی پۆلیس و ئەمن كردیان بەماڵا كابرایەكی جل گران بەهاو ڕێك و پێكیان لەگـەڵ بـوو هـەموو دەوریـان دابـوو لێـی ئەسـڵەمینەوەو ئەترسـان و هـەر سـەیدی سـەیدیان بـۆ ئـەكرد خولەشـێتیش سـەیرێكی كـردن و هەنـدێ حەپەسا ئەوەندە ئەهاتن بۆ مـاڵ پشـكنین هـەموویان شارەزای خولـەبوبون كـە گوایـە شـێتۆكەیە تـاوەكو ئەوانـەی نـاو قـوڵغی دەرگاكـەش لەگـەڵ خولـەڕاهاتبوون زۆرجار كە قسەو تـوانجی تـێ ئـەگرتن لێیـان نەئـەگرت و



پێی پێ ئەكەنین. بۆیە ئەو ڕۆژە خولەسەری سوڕما لەو كابرایەو چوە پێشەوە لەو پۆلیسەی لەحەوشە ڕاوەستابوون و بەدەمە لاڵەپەتەكەیەوە گوتی : ئەم فس فس پاڵەوانە كێیە وا هەر هەڵەبەزێت و ڕائەكات بۆ ئەم ژوورو ئەو ژوور لەناو ئەوانە موفەوەزێكی لێ بوو كوردبوو خەڵكی كۆیە بوو باوكی كاتی خۆی مودیری پۆلیسی سلێمانی بوو ئاشنای ماڵی كاك عومـەر دەبابـە بـوون ئـەو كـوڕە لـەژێرەوە دڵـی لامـان بـوو نەیـەوێرا هـیچ دەربڕێت بۆیە كە خولەشێتی ئێمە وای گوت كابرا ڕاپەڕی و بەترسەوە گوتی : بۆ خاتری خوا بێ دەنگ بە ئەمە مودیری ئەمنی بەغدایە ئیمڕۆ هاتوە ناوی ( نائیلە) و زۆر ئیشارەتی كرد و پاڕایەوە لێی كە بێ دەنگ بێت. دایكم لەگەڵیان بوو كە ئەچونە ژوورەكان و شتەكانی پیشان ئەدان ( نائیل ) و جەماعەت چونە ژووری نوستنی من و باوكی هێرۆ خولەش چوو لەگەڵ دایكم لەگەڵیان كابرای مودیری ئەمن خۆی دانەواندەوە كەسەیری ژێر كورسی نوستنەكەمان بكات خولەبە پێكەنینەوە بە عەرەبی گوتی :
ی‌ەینی جـ یگ‌اکه زۆر نزمه و ابزا [illegible] زه‌لامـ پیانلچی ٚ من وا بزا [illegible] ئەگەر كاكە ب
برایم لێرە بوایە بە هیچ جۆرێك لەو بنە خۆی نەئەشاردەوە لێتان و ئەهاتە لاتان. دیسان ڕوحمان چوو دایكم كەوتە بۆلەبۆڵی بێ دەنگ و ئیشارەت كە دەمت داخە بەڵام خولەقسەی خۆی كرد و وای پێ گوتن چونكە ئەوان كە ئەهاتن بۆ باوكی هێرۆ ئەهاتن و بۆ ئەو ئەگەڕان و زۆر سەیری جانتاو كاغەز و شتیان نەئەكرد ئەیانگوت بۆ ئەو هاتوین لەكوێیە ؟
( نـائیلی ) مـودیر ئـەمنی عـامی بەغـدا كەلەهـەموو ژوورەكـان بـوەوە هەروەها ژووری خالەمحمدیشم گەڕا. جاران كردەوەیەكی زۆر سەیر هەبوو جلی ئەفسەر و نەجمە و نیشانەی ئەفسەری شتێكی زۆر بەڕێز و گەورە بوو لەلای حكومەت. هەمووجارێك كە ئەهاتن بۆ ماڵ پشكنین كە جانتاو كەل و پەلی خالەمحمدمیان ئەكردەوە و جلەعەسكەری و كاغەز و كەل و

پەلەکانیان ئەبینی گورج بەببورە ببورە دایان ئەناو دەستیان بۆ نەئەبرد و گــورج ئەچــونە دەریْ لەژورەکــەی. دایکیشــم بۆیــە جــل و کــەل و پــەلی عەسـکەری لـەویْ دائـەنا تـاوەکو بەشـکەم لەبـەر خـاتری ئـەو ئەزیـەتمان نەدەن.

جاران ئەفسەری سوپای عێراقی بۆ هـەر کوێیـەك بچوایە کـەس حـەدی نەبو ئوتومبێلەکەی ڕاگرێت زۆرجار بـاوکی هێرۆ بـەو چەشـنە ئەگەیشـتە بەغدا و شوێنانی تر کە برادەری ئەفسەری سوپا ئەیانبرد. جارێکیان خاڵـە هەمزەم لەسلێمانیەوە گەیەنرایە بەغدا هـەر بەو چەشـنە بیْ ئـەوەی کـەس بیوێرایە لەسەیتەرە و ڕێگاکان ڕایگرن هەر بۆ چاو تروکانێکیش. بێینـەوە سـەر باسـی (نائیـل ) کـە نائیـل لێبـوەوە و گەڕایـەوە دالانەکـە لەگـەڵ هەمڕاهـەکانی کـە زۆر زۆر بـوون ڕوی کـردە دایکـم و گـوتی ئـەبیْ ژنەکـەی برایم ئەحمەد بێت دانیشێت ئیفادەی وەرئەگرین ئەوکاتـە عـومرم بیسـت و پێنج ساڵ بـوو سـیْ منـاڵم هـەبوو یـەکێکیش بـەڕێوە بـوو سـاڵی ١٩٥٥ بـوو ئیتر چووین دانیشتین لەژووری میوان لەگەڵ دایکم و ئەوانی تـر کـە معـاون و هەندیْ لەوانەی لەگەڵیان ئەوانی کەش لەهـەیوان و حەوشـە بـوون معـاون دەفتەری کردەوە ( نائیل ) پرسیاری لیْ ئـەکردم و معـاون ئەینوسـی منـیش دیارە عەرەبیەکەم زۆر باش بوو نائیل سەری سوڕما و گوتی قەیناکە کـورد عـەرەبی ئـەزانن بـەلام بـەم شـێوەیەی تـۆ کـەم کـەس هەیـە هـەر ئـەڵێی کچـە عـەرەبی. دەم و چـاوم دابـو بەیـەکا و بەدەسـتم بوایـە تەپڵەکەکـەم ئەکێشـا بەسەریا گوتم نەخێر کچە عەرەب نیم کچە کوردم بەڵام عەرەبی ئەزانم ب پرسی و گوتی برایم ئەحمەد چوە بۆ کویْ جێگاکـەی نـازانی کـە چـوە بـۆ کویْ قابیلەپێی نەگوتبی کە چوە بۆ کویْ ؟

گوتم با ئـەزانم ئـەو بەیانیـە دەعـوای هـەبوو چـوو بـۆ سلێمانی و ڕانیـە گـوتی : نـازانی دەعـوای کـیْ بـوو. گوتم من چ و زانم هـەقم چـیە بەسـەر دەعواکانیەوە.

گوتی باشە جلی برد لەگەڵ خۆی یا گوتی ئەگەڕێتەوە.

گوتم نەو جلی برد چونکە دو شـەوێکی پـیْ ئەچوو. من بۆیـە وام گـوت ویستم سەریان لێبشێوێنم تـا ڕوبکەنـە سلێمانی و ڕانیـە و لـەویْ خـەریکی بەدوا گەڕانی بن چونکە ئەمزانی کە باوکی هێرۆ چوە بۆ بەغدا.

دوایی سەیرێکی دایکمی کردو گوتی بۆچی نەسیحەتێکی برایم ئەحمد ناکـەن بـۆ سـەر لـەخۆی ئەشـێوێنیْ مـاڵ لـەخۆی تێـك ئـەدات ئـەم ژن و منالەجوانانەی هەیە بۆ دانانیشێت بە هێمنی و بیْ تەگەرە دڵی ئێوە و ماڵ و منـاڵی هـەموو ڕۆژێـك دائـەخورپێنیْ بـەم هـاتنی پـۆلیس و تـەفتیش و بەزمـە. دایکم توڕەبوبو منیش لـەو خـراپتر دایکم جـوابی دایـەوە و گـوتی بـرایم ئەحمـەد هیچـی نـەکردووە تـاوەکو وازبێنێـت و سەریشـی هـیچ لیْ نەشێواوە و زۆریش دڵنیاو دڵ خۆشە و سەری بەرزە و هەروا ئەمێنێت.

کەچی سـەیری کـردم و گـوتی : باشـە ئـەی حـەیف نیـە دڵـی ئـەم ژنـەی ناڕەحەت ئەکات و تەگەرەی بۆ دروست ئەکات ؟

من هاتمە قسە بەدەم هەناسە بڕکیْ و توڕەییەوە گوتم : نـە حـەیف نیـە دڵیشم ناڕەحەت ناکات هەموو کردەوەیەکی ئـەوم پـیْ خۆشـە و هـەزاری وەکو منیش ناگەنە نینۆکێکی ئەو کابرا چاری نەما و هیچی بۆ نەمایەوە و زۆر لەسەر خۆ و بەئەدەبانەوە گوتی : باشە وەرە ئـەم ئیفادەیـەت ئیمزاکـە. منیش ئیمزام کرد ئیتر هەستان ڕۆیشتنەوە ئینسـان بـۆ هـەق بڵێت جاران هەرچـەندە حکومـەت و دەزگاکـانی ئـەمن خـراپ و بـەدناو و دڕنـدە بـوون لەگـەڵ خەباتکـەران و ئەوانـەی ئـەگیران بـەڵام لەگـەڵ ژن و مـاڵ و منـاڵ لەسەرخۆو بەتەحەمول بوون. لەکاتی ماڵ پشکنین و هاتنـە سـەرمان ڕۆژ و

شەو و ناوەخت زۆرجار قسەمان پیٚ ئەگوتن و لێیان تورە ئەبووین دایکم زۆرجار پێی ئەگوتن خۆ ڕامان نەئەکرد باببوایە بەڕۆژ منالّتان تۆقاند زۆر عوزریان ئەهێنایەوە و دەستیان ئەکرد بە اختی اختی ببورن ئەمە فەرمانی حکومەتە و قسەی وایان ئەگوت. هەرە بەدی و خراپەیان زەلاّتەو حەلاو بوو لەچاو ڕژێم و دەزگا دڕندەو گورگە هارەکانی بیٚ وێنەی صەدامی خوێن ڕێژ.

( نائیل )ناوێکی زۆر بەسام بوو هەر کە ئەیانگوت نائیل هاتووە بۆ سلێمانی یا شوێنێکی تر خەلّك زۆر شپرزە ئەبون و ئەترسان و خەباتکەران ئەکەوتنە خۆیان چونکە مانای هاتنی ( نائیل ) یەعنی شتی گەورە ئەقەوما.

هەرچۆنێك بوو بەو حالەو لەو زروفەدا ماینەوە هاوین بوبە پایز پایز زستانی بە دواوە هات. دونیا ساردو سڕبو باوباران دەستیان پیٚ کرد ئێمەش هەر عەینی خۆمان لەکونی ژوورەوە پاسەوانەکانی بەردەرگا وەکو ناسیاویان لیٚ هات خولەزۆرجار کە بارانی بەگوڕ ئەباری پیالەچایەکەی ئەگرت بەدەستەوەو دەرکی حەوشەی ئەکردەوەو سەیری ئەکردن و پێی ئەگوتن : یاخوا هەر ئەوە حالّتان بێت بزانە من لەبەر ئاگردان دانیشتوم سەیرکەن چۆن چای گەرم و خۆش ئەخۆمەوە. ئێوە هەر لەویٚ ڕاوەستن بە پێوە و چەقەی دانتان بێت شەو و ڕۆژ لەسەرمانا ڕەق بن.

هەندێکیان پیٚ ئەکەنین و بە خولەیان ئەگوت : دە چاێکیش بدە بەئێمە خۆ گوناح نیە. خولەفڕی لەچایەکەی ئەداو ئەیگوت : نەیخۆن تالەبەخوا خوا بمکا بە کیسەلّ و بمکا بە مەیمون ئەگەر ئەو چایەتان نەدەمیٚ ناتان دەمیٚ بمرن بۆ چاێك ناتاندەمیٚ.

موبارەکتان بێت یاخوا ئەم حالەلەبەیانیەوە تاوەکو ئێوارە هەروا بەپێوەبن و دەست بخەنە ژێر هەنگلّتان لەسەرمانا. خولەئیتر بە پیٚ



کەنینەوە دەرگاکەی دائەخستەوە و ئەهاتە ژووریٚ ئێمەش هەموومان ئەچوین بەگژیا من دایکم نەنە پوریٚ باجی زەکیە هەمووما تێی بەرئەبووین کە بۆچی وائەکات بۆ ئەو چایەیان پیشان ئەدات ئەو قسانە ئەکات بەلاّم فایدەی نەبوو خولەقەت وازی لەقسەی نەئەهێنا.

هێرۆ و هەلّۆ ئەوانیش هەروەك زیندانی وابوون ئەگەرچی هێرۆی کچم هاوڕێی ئەو ئەبو بچن بۆ مەکتەب بەلاّم مەکتەبی چی و لەکویٚ هەروەها هەلّۆش کەلەو منالّ تربوو هەر بۆخۆیان لەمالّ بوون و لەگەلّ یەکتری و خولەشێتیش یاریان ئەکرد جاربەجار خولەیا باجی زەکیە ئەیبردنە هەندیٚ دوکانی نزیکمان هەبوو شتیان بۆ ئەکڕین بەلاّم شاناز گاگۆلّکێی ئەکرد من لەسەر منالّ بوون بووم بەهەتاو سستەرو مامانیش نەیان ئەوێرا بێن بۆلامان. رەئیس صحەی کەرکوك کەناوی دکتۆر عوسمان بوو هاوڕێی باوکی هێرۆ و برادەران بوو بۆیە کە خەبەرمان بۆ نارد کە حالّم وایە چوو بەدزیەوە سەرۆکی هەموو سستەرەکانی بۆ ناردم ناوی غەزالەبوو گاوریش بوو زۆر کچی چاك و باش بوو هەمیشە بەڕێوەبو بۆ سەردان و فەحص و ئەوکارانە هەمووجارێك خولەئەچوو بەدوایا بە عەرەبانە ئەیهێنا و ئەیبردەوە و زۆر بەتەنگیەوە بوو لەمالّیشەوە خولەهەربەوەدا ئەگەیشت سینی پڕکات لەخواردن و میوە و کولیچە بۆ غەزال ئەگەرچی غەزالەزۆر گەنج نەبوو زۆر لەخولەگەورەتر بوو پیرە کچ بوو بەلاّم خولەزۆر ئاگاداری ئەکرد و بەپەرۆش بو بۆی بۆیە هەموو ئەهلی مالّەکە پێیان ئەگوت خولەئەوە حەزت لەغەزالەکردووە ئەویش ئەچوو بەگژیاناو ئەیگوت : قوڕبەسەرە تا دێت و ئەڕواتەوە ئەتۆقێت لەم سەگ بابانەی بەردەرگا ئەی نابیٚ وای بۆ بکەم کەدلّی خۆش کەم.

هەتاو لەدایك بوو زۆر بەبیٚ دەنگی و بەتەنیایی مالّەکەمان ساردو سڕ نەباوکی لەویٚ بوو نەکەسێك ئەهات بۆلامان هەرچەندە دلّمان بە هاتنی

هەتاوخۆش بوو من منالەکا زۆر زۆر خۆشەویست بەتایبەتی کە ساوا ئەبوون زۆر پەیوەندیەکی بڕوا نەکەردەنیم هەبوو لەگەڵیان تێکڕا لەهەموو تەمەنیگیاناخۆشەویستی لەدەدەرچووم هەبوو بەرامبەر بە منالەکا بگرە تاوەکو ئێستەش. هەر منالێکم نەخۆش کەوتبێ نەخۆش کەوتوم سەرو مڕ لەگەڵیان بەو نەخۆشیەش هەر بەدیاریانەوە ئەبووم جاری وا هەبوو نانیشم نەئەخوارد تاوەکو منالەکەم چاك نەبوایەوە زۆرجار دایکم بەگریانەوە قاپەچێشتی ئەگرت بەدەستیەوە و بۆی ئەهێنام و ئەیگوت لەبەر خاتری من و دڵی من ئەبێ شتێك بخۆیت ئاخر کە تۆ بۆ منالەکەت وا نارحەتی تۆش منداڵی منی منیش بۆ تۆ وا نارحەتم ئە و خەفەت ئەخۆم. دایکم دایکێتی بێ وێنە بوو هەموو منالەکا لەسەر شان و لەباوەشە بەسۆزەکەی ئەودا بەخێوکران و گەورەبوون ئەویش زۆری خۆشەویستن روحی بەسەر موییێکی سەریانەوە بوو. لەو زروف و حاڵ وەزعە نالەبارەی ئێمەی تیابووین پارەو دەرامەتیشمان ئەوەندە نەبوو ئاخر ئەو حکومەتە بەدناوە نەیان ئەهێشت باوکی هێرۆ هەر هەناسەیەك بکێشێت هەر دەعوایەك ببینێت تاوەکو پارەیەکی هەبێت باوکی هێرۆ وەکو محامێکی زیرەك ئەوەندە مەشهور بوو جارێك لەقاهیرەوە یەکێ دەعوای بۆ هێنابوو دائیم و تێکڕا هەر بەدوایەوە بوون چەند مانگێك بەدەرەوە ئەبوو دوو ئەوەندەی تریش زیندانی ئەبوو یا خۆی ئەشاردەوە ئیتر لەکوێ کاسبی و محاماتی بکردایە. حیزبیش هیچی نەبوو لەیارمەتی ئەندامانی زیاتر وەزعی دەرامەتی زۆر شڕ بوو. لەبەرئەوە حاڵمان باش نەبو دایکم تاوەکو ئەو کاتە هەرخۆی جلی بۆ منالەکا دروست ئەکرد و ئەدرو دایکم زۆر هونەرمەندێکی دەست و پەنجە زێڕین بوو هەروەها خالەمحمدیشم تقاعدی هەبوو بەو گەنجی و لێهاتویەیەوە حکومەت تقاعدی کردبوو خاڵە هەمزەشم ئەوە هەر هیچ هەر لەدێهات و ژێر زەمینان



شاراوەبو بۆیە حاڵمان زۆر نالەبار و دڵتەنگکەر بوو. هەروەها دایکم معاشی تقاعدی باوکی هەبوو چونکە باوکی ئەفسەری سوپای عوسمانلی بوو بۆیە تقاعدی ئەوی وەرئەگرت ئیتر بە هەرحاڵ بوایە چارەسەری خۆمان ئەکرد.

هەتاو وەکو ئەڵێن زۆر سەری بەخێر بوو هێشتا نەبوبو بە چل ڕۆژ کەلەدایك بوبو فەرمان دەرچوو کە برایم ئەحمەد بابێتەوە سەر ئیش و کاری هەروەها کاکە عومەر دەبابەش کە پێکەوە خۆیان لەبەرچاو وون کردبوو ، کاکە عومەری نەمر نەی هێشت باوکی هێرۆ خۆی دەربخات و گوتی جارێ با من بچم نەوەکو فێڵ بێت کاکە عومەر هاتە دەرێ و گەیشتە ماڵەوە ماڵی کاك تایری برای کە هەر لەوێ ئەژیا لەوبەر بوو لەئاخری حسێن بوو دڵمان خۆش بوو چووین بۆ بەخێرهاتنی کاکە عومەر ئەویش دانیشت بەبێ باوکی هێرۆی بۆکردین و گوتی بلا بزانین ئەمە چیە نەوەکو فێڵ بێت کە ڕاست بوو هیچ نەقەوما دوایی کاکە برایم ئەبێ بێتە دەرەوە ئەحمەد ئاغا کەرکوکلی زادە هەبوو کە زۆر دەوڵەمەند بوو دائم و هەمیشە تەگەرەو دەعوای هەبو باوەڕی بەکەس نەئەکرد لەباوکی هێرۆ زیاتر کەباوکی هێرۆ ئەگیرا ئەحمەد ئاغا سەری دونیای لێئەهاتەوە یەك ، ئەحمەد ئاغا چاو نەترس و هەندێك دڕبوو هەر لەنوری سەعیدەوە کە سەرۆك وەزری ئەوکاتەی عێراق بوو لەگەڵ هەموو دەست و دائیرەی حکومەت ئاشنای بون بۆیە کە باوکی هێرۆ ئەگیرا ئەچوە سەریان و هەراسانی ئەکردن و ئەم بەربونە کت و پڕەی ئەو جارە دەستی ئەحمەد ئاغای تیابوو وەکو باوکی هێرۆ بۆی گێڕابومەوە. هەرچۆنێك بوو باوکی هێرۆش هاتەوە دەرێ دیارە هەموو بوژاینەوە و دڵمان خۆش بوو پێ و قەدومی هەتاو زۆر خێر بوو. باوکی هێرۆ کچەکانی زۆر خۆش ئەویست کە کچم ئەبوو ئەگەر لەلامان بوایە زەماوەندی بۆ ئەکردن. هەندێ جار ئەم

گوت ها دیسان ئێستە خەڵك ئەڵێن گەلاوێژ دیسان کچی بوو باوکی هێرۆ تورە ئەبوو ئەیگوت بابۆ خۆیان بڵێن فەرقی کچ و کوڕ چیە کچی وا هەیە حەوت کوڕ ئەهێنێت ئینجا کچەکانی ماچ ئەکرد بە تایبەتی هێرۆی خۆشەویستی و ئەیگوت بەخوا ئەم کچەم بەشەش کوڕ ناگۆڕمەوە. ئەگەرچی باوکی هێرۆ کوڕەکانیشی زۆر زۆر خۆشەویست بەڵام زۆر لایەنگری ژن بوو لەسەر ژنی زۆر ئەکردەوە و ئەیگوت ئەمە گوایە کچیان بەدڵ نیە و هەر ئەبێ بۆ کوڕ زەماوەندو حەفلەبکەن کە کوڕیان ئەبێت ەبەرئەوە من ۆ کچەکا کەلەدایك ئەبن زەماوەندو حەفلەئەکەم.

چەند مانگێك بەسەر گەڕانەوەی باوکی هێرۆ تێ پەڕی کرد وردە وردە خەریکی دەعواکانی بوو کە لادێ و فەلاحەکان هەمووجارێك دەعواکانیان هەڵەگرت و ڕائەوستان تاوەکو ئەگەڕایەوە هەروەها بەگەرمیش لەژێرەوە خەریکی چالاکیە حیزبیەکەی بوو. لەدوای بەینێك ویستمان ئەو خانووە بگۆڕین بۆیە گواستمانەوە بۆ خانویەك لەوبەر ئیمام قاسم نزیك چایخانەی عاشور کە زۆر ئەوکاتە چایخانەیەکی بەناوبانگ بوو لەم خانوە تازەیەمان دراوسێ ماڵی کاك حاجی مەحمود بوین دیوارێکمان لەبەین بوو دەستە چەپیشمان ماڵی ست فاتمە بو ئەوانیش ماڵێکی کوردی زۆر نەجیب و بەحورمەت خۆشەویستەنی بون ماڵەکەمان بەرامبەر فلکەکە بوو زۆر لەپێش و سەر پەڕو بەرچاو بوو ئەوبەریشمان دوو ماڵەتورکمان بوون یەکێکیان ماڵی ست عدویە ئەوانیش بوون بەئاشنامان و زۆرمان خۆش ویستن خانوەکەمان هی پیاوێکی کورد بوو پێیان ئەگوت علی جگەرە گوایە بەگەنجی سندوقە دارێکی پێ بووە و جگەرەی فرۆشتوە دوایی دەوڵەمەند بوەو چەند خانوێکی هەبوو علی جگەرە هەتا بڵێیت پیاوێکی نەجیب و باش بوو لەگەڵ ژنەکەی ئەهاتن بۆلامان دوسێ کچی بەشویان هەبوو تاقە کوڕێکی دە دوانزە ساڵیان هەبوو ناوی ( منتصر )بو علی



جگەرەو ژنەکەی لەباپیرو نەنکی مناڵەکە ئەچوون بەڵام کوڕی ئەوان بوو. خولەشێتەکەمان بوژابوەوە و دڵی خۆش بوو دائم لەقسەو گاڵتەو سوعبەت دابو لەگەڵ دەرو دراوسێ لەخۆشی کاکە برایمیش ئەوە هەرباسی ناکرێت کە چەند دڵی خۆش بوو.

شەوان تا درەنگ خولەلەناوەڕاستی فلکەکەی بەر دەرگاکەمان دا ئەنیشت تاوەکو باوکی هێرۆ ئەگەڕایەوە ماڵێ. کە پێمان ئەگوت بۆ لەوێ و لەسەر ئەو بەردانە دائەنیشی و ئەیگوت ئێوە ئاگاتان لەچیە ئەمن و خوێڕیەکان بەشەو دێن دەورو خولی ماڵەکە ئەدەن و ئەیانەوێت بێنە ناو فلکەکەوە دانیشن فلکەکە زۆر خڕو بچکۆلەبوو لەوە ئەچو کە جاران جێ پۆلیسی ڕێگاوبان بوبێ ( شرطي مرور ) خولەئەیگوت ئینجا کە ئەوانە من ەبینن ناڵێن بەڵام زۆر تورەن ئەبن وحەزناکەن من لەوێ ئەترسم ئەو . سەگ بابانە شتێك لەکاکم بکەن کە بەشەو ئەگەڕێتەوە دوسێ جار شەڕیشیان بەخولەفرۆشتبوو ئەویش گوتبوی پاسەوانی ماڵی خۆمان ئەکەم ئێوە هەقتان چیە بەشکەم ئێوە دز بن ئەی بۆچی هەموو شەو ڕۆژ بێرەدا دێن و ئەڕۆن. زۆرجار لەگەڵ باوکی هێرۆ ئەڕۆیشتم بۆ سلێمانی بۆ ئیش و کاری خۆی کە ئەگەیشتینە مەخفەر و سەیتەرەی تاسلوجە ئوتومبیلەکەیان ڕائەگرتین ئەوانەی ڕایان ئەگرتین یەکێکیان دەستی ئەنایە پەنا دەمی و بەبەرزی هاواری ئەکردە ئەوەی بەر مەخفەرەکە و ئەیقیڕاند و ئەیگوت : برایم ئەحمەدە برایم ئەحمەد. ئەوانیش پێیان ئەگوت جارێ با ڕاوەستێت ئینجا ڕایان ئەگرتین تاوەکو وەرامیان ئەدانەوە دیارە لەژووری ئەکەوتنە جیهازکردن و لاسلکی و تەلەفۆت کەوا برایم ئەحمەد هاتووە ئەچێت بۆ سلێمانی دوایی یەکێك ئەهاتە دەرێ ئەویش ئەیقیڕاند بۆ ئەوانەی لەلامان ڕاوەستابوون دەستی هەڵەبڕی بە ئیشارەت و ئەیگوت : قەیناکا با تێپەڕێ جاری واش هەبو ئەیگوت : نابێ نابێ ئیمڕۆ ناکرێ

ئەبێ بگەڕێتەوە ئەو شوێنەی لێی هاتووە ناچار ئەبو بگەڕێینەوە کەرکوك. هەم دیسان وایان ئەکرد و ڕایان ئەگرتین.

لـەو خـانوە تازەیـەمان یـاخود خـانوی علـی جگـەرە زۆر ڕوداوی ناخۆشمان دیت لەو خانوەدا بوین کە ( عدوان ثلاثي )کرایە سەر مصر بۆیە دیسان باوکی هێرۆ و برادەرانی بەتایبەتی کاك عومەر دەبابە و مجید کاکەی حاجی مەحمود کە ئەو شیوعی بوو گیران و ڕەوانەی زینـدانی کەرکوك کران هەموو ڕۆژێك لەماڵی یەکێکیانەوە نانیان بۆ ئەچوو هەروەها نوێن و قەروێڵەشمان بۆ ناردن. ماوەیەکی باش ئەوانە زیندانی بوون کە شتێکی وا ڕووی ئەدا دەست بەجێ خەباتکەرانیان ئەگرت باوکی هێرۆ هەر یەکەم کەس ئەبو لەبەرئەوەی ئەترسان چالاکی و خۆ پیشاندان و پشت گیری خۆیان دەربڕن بۆ ئەوتاوانە. لەو خانوەدابوین کە دکتۆر عبدالرحمن قاسملو هاتە ماڵمان بە قاچاغی و بەدزیەوە برادەران ئەیان پاراست لەکاتێکا کە خۆمان لەژێر چاودێری حکومەت دا بوین ئینجا ترسەکەمان ئەبوو بە دوترس کە نەوەکو بێن ماڵەکەمان بگەڕێن و ببینن و ئەویش بگرن چونکە ئەو برادەرە ئێرانیانە بە دزیەوە ئەهاتن سنوریان ئەبڕی و ئەهاتنە دیوی ئێمە و برادەرانی ئێمە زۆر ئاگاداریان ئەکردن. دکتۆر عبدالرحمن قاسملو ئەیویست دەربازی کەن کە بڕواتە دەرەوە تاوەکو پێش ڕۆیشتنی چووم بۆ بازاڕ دیاریم کڕی بۆ ژنەکەی کە بۆی ببات لەگەڵ خۆی دکتۆر عبدالرحمن قاسملو قسەی خۆش بوو زۆر لەگەڵ خولەبەزمیان ئەبو پێکەوە.

لـەو خـانوەدابوین کـە شـێخ مـەحمودی مـەزن وەفـاتی کـرد و تەرمـە پیرۆزەکەیان هێنایەوە بە کەرکوکدا تێ پەڕی بۆ سلێمانی باوکی هێرۆش لەگەڵیان ڕۆیشت. ( ڕۆمانی ژانی گەل )ئەو ڕۆژە لەو ڕوداوەوە پێك هات چونکە من ژان ئەیگرتم و باوکی هێرۆ ناچار بەجێی هێشتم و ڕۆیشت ئیتر



کە گەیشتبوە سلێمانی بوبو بەهەرا و خۆپیشاندان و بڕوخێ حکومەت. حکومەت تەقەی لەخۆپیشاندەران کردبوو زۆریشی خەڵك شەهید و بریندار کردبوو گیرابوون لەو شەهیدانە ئەختەری هاوسەری هونەرمەندی کورد پەروەر ڕەشۆڵ بوو چەند ڕۆژێك سلێمانی شێوابو و خەڵك هەموو دڵتەنگ و ناڕەحەت بوبون کە باوکی هێرۆ دوای چەند ڕۆژێك گەڕایەوە لەکەرکوك منیش مناڵم بوبو. لیلۆزی کچم بوو. باوکی هێرۆ کە گەڕایەوە لەسلێمانی پێی گوتم: گەلەڕۆمانێکم لەم ڕوداوانەم پێك هێناوە لەمێشکما ، ئیتر بەکورتی بۆی باس کردم و گوتی : من لەگەڵ تەرمی شێخ مەحمودی نەمرچووم تۆ لێرە ژان ئەیگرتی کە چوین بو بەهەراو تەقەو کوشتن و گرتن ، من بگیرامایە ئیتر نەم زانیایە چیت بەسەرهات. زۆرم پێ خۆش بو گوتم دەی دەستی پێ بکە دەستت خۆش بێ و دیسان مەڵێ ئیمڕۆ نە سبەینێ نە شەو نە بەیانی. باوکی هێرۆ هەندێ تەمەڵ بو لەنوسیندا و هەر ئیمڕۆ و سبەینێی پێ ئەکرد تاوەکو بۆ نامە نوسینیش وابو. کە خەریکی نوسینی شتێك ئەبوو زو زو ئەچومە سەرێ کەسەیرم ئەکرد خەریکی کارێکی ترە ئیتر ئەبو بەقڕەمان هەندێ جار گوێی لەتەپەی پێم ئەبو کەوا هاتم بۆلای هەر زو نوسینەکەی ئەگرت بەدەستیەوە گوایە وا ئەینوسێت.بەڵام ژانی گەل هەر زو دەستی پێ کرد ماوەیەکی زۆریشی پێ چوو تاوەکو تەواو بو ئەویش چونکە زۆر سەری قاڵ بوو ڕوداوی وا ڕوی ئەدا کە ناچار ( ترکیز ) خەیاڵ پەرش و بڵاو ئەکردەوە.

هـەروەها لـەو بەینـە هـەژاری شاعیریش کە نەخۆشـی سیلی هـەبوو زۆر نەخۆش بو ئەویش لای ئێمە بو لەکەرکوك زۆر نەخۆش بوو پەکی کەوتبوو برادەرانمان لەسنورەوە پەڕاندبویان و گەیاندبویانە کەرکوك کاك عومەر دەبابەی نەمر خەریکی بوو هەوڵیان ئەدا لەڕێگای موسڵەوە بێنێرنە دەرەوە بۆ سەر دکتۆر. خوشکێکی باوکی هێرۆش هەر نەخۆش بوو دەمێك

بوون خەریکی گرتنی شوێن بوون بۆی لەلبنان لەمصح بخنس کە هی ئەوجۆرە نەخۆشیانە بوو هەروەها زۆریشیان هەولٚ بۆ دابو لەوەزارەتی صحەی بەغدا. ئاخری ئیشەکەی بۆ جێ بەجێ بوو ئامادەکرا کەبڕوات بەڵام باوکی هێرۆ ئەو ئیجازەو حیجز و شوێنەی دابە هەژار گوتی با جارێ ئەو ڕزگاری بێت و لەبەرچاوی گەلێ کەسمان کە کاك عومەری نەمر هەژاری دا بەکۆڵیا کە بیبات بیخاتە ئوتومبێلەکەوە هەژار خوێنی هەڵ هێنا بەسەر شانی کاکە عومەردا دوایش بەهەزار ترس و لەرزو شاردن گەیاندیان و پەڕاندیانەوە لەسنور بۆ سوریەو لبنان. خوشکی باوکی هێرۆش بەسەزمانە سەر لەنوێ تیا هەڵچونەوە بۆ ناردنی بۆ لبنان. کەچی کە هەژار چاك بوەوەو خۆی گرتەوە و سیل و خوێن هەڵهێنانەکەی نەما کە گەڕایەوە لەدوای بەینێکی ئەم بەرو ئەوبەر کەوتە شیعر نوسین و مقال نوسین و قسە پێ گوتنی ئەوکەسانەی پاراستیان و خوێنی بەسەر شانیانەوە هەڵ ئەهێنا کەوتە جنێودان بە باوکی هێرۆ و برادەرانی ئەوەش وەفا و پیاوەتی ئەو هەژارە شاعیرە بەڕاستی ئەوەی من ئەم بینی و لەبیرمە و لەبەرچاوم بوو لەماڵمان بۆیان ئەکرا برادەرانی ئێمە سەرەڕای زروفی ترسناك و خەتەرناکی خۆیان هەر خەریکی کوردی ئێرانی بوون کاتێ لەکوشتن و بڕینی شاهی ئێران هەڵئەهاتنە دیوی ئێمە کەچی زۆریان زۆر سپلەو بێ وەفا دەرچوولەگەڵ برادەرانی ئێمە.

سێ ساڵ زیاتر لەو خانوەدا ماین پێش هەموو کارێکی تر باوکی هێرۆ ویستی پارچەیەك ئەرز پەیاکات بەشکەم خانوێکی لەسەر دروست کەین و هەندێ ئەو ماڵ و مناڵەی بەدڵنیایی بەجێ بهێڵێت کاتێ ئەگیرێ و زیندانی ئەبێت بۆیە لەسەرو ماڵی ست عدویە کەڕێك پشتیان و لەسەر خاسە بو بەرامبەر بە چایخانەی عاشور باوکی هێرۆ پارچە ئەرزێکی کڕی. بۆیە دڵمان خۆش بوو کەلەم شەڕەشەقی خانو گواستنەوەو خانو نەدانەو ترسی



خاوەنەکانیان لەئێمە ڕزگارمان بێت. ئەرز تەخت کراو ژوورو حەمام و ئەو شوێنانە خەریتەی بۆ کێشرا بەرد خرا ئیتر خەریك بو دەستی پێ بکەین کە بەیانیەك نەوزادی کاکەی حاجی مەحمود لەسەر دیوارەکەی بەینمان سەری شۆڕکرد بەسەر حەوشەکەماندا بەپەلەو شپرزەییەوە قیڕاندی و گوتی : خێراکەن ڕادیۆی بەغدا بکەنەوە شتێکی زۆر گەورە قەوماوە کەلەپڕ گوتی : ئێرە ئێستگەی جمهوری عێراقە بەیانی یەکەم.

میلەتی بەڕێز لەدوای پەنا بردنەبەر خوای گەورە و پشت گیری و پشت بەستنی ڕۆڵەی گەل و هێزی چەکداری سوپا دەستمان کرد بەڕزگارکردنی وولاتە خۆشەویستەکەمان لەدەست ئەو تاقمە بەد خو بەد ناوە کە ئیستعمار دای مەزراندبون بۆ ئەوەی میلەت لەناوبەرن بە پێی مەصلەحەت و قازانجی شخصی خۆیان ئیش و کارەکانیان ڕاپەڕێنن. هێزی چەکداری سوپا لەئێوەیەو بۆ ئێوەیە ئەو ڕۆژەش ڕۆژی ١٩٥٨/٧/١٤ چواردەی تەموز بوو ئیترنازا□□ هەست و بیرو بۆچونی خۆمان وەسف کەم چونکە هەموو حەپەسابووین و خۆشی و ترس و فرمێسك و شادی و پێکەنین هەمووی تێکەڵ بوون. هەر بەیان تەواو بوو دەرو دراوسێ کردیان بە دەنگە دەنگ و خەڵك ڕژانە سەر شەقام لەگەڵ ئەوەشا قەدەغەی چوونە دەرەوەیان داناو ئیعلانی منع التجولیان کرد. بەڵام فایدەی نەبوو هەر زەلام و ژن هەڵپەڕین و هەڵهەڵەکێشان بو بەڕاستی ئەو ڕۆژە ڕۆژێك بو ڕوداوێك هەروەك خەو وابوو. هەر لەماڵی ئێمەوە تاوەکو ئەو خەڵکەی لەسەر شەقام بەیەکتریان ئەگوت ئا توخوا ئاوێکی سارد بکە بەسەرما یا زلەیەکم لێدە با خەبەرم بێتەوە چونکە ئەترسم ئەمە خەوبێت. ئەوانەی سەر بەو ڕژێمە بەد ناوە و ناحەزی میلەت و گەلەبوون زیڕەیان کرد و کون نەما خۆیانی تیا بشارنەوە ، دەرگای زیندانەکان شکێنرا و خرانە سەر پشت زیندانی سیاسی کەبە هەزاران بوون هەموو بەربوون شاراوەو قاچاغیش هاتنە دەرەوە کە لەزۆر

کەس زیاتر دەربەدەرو شاراوەو ژیانی پڕمەترسی و نالەبار خاڵە هەمزەم بوو خاڵە هەمزەم هاتە دەرەوە و گەیشتە لامان بۆ کەرکوك ئیتر لەخۆشیانا نەمان ئەزانی چی بکەین کەس نان و ئاویشی لەبیر نەمابو بیخوات.

خاڵە هەمزەم هەروەها کاك نوری ئەحمەد تەهاش کە هەر لەزیندانا بوو حوکمی ئیعدامی لەسەر بوو بۆ ماوەیەکی زۆر زیندانی بوو خاڵە هەمزەم و ئەوانیش ڕۆیشتنی ئاسایی وەکو خەڵکیان لەبیر چوبوەوە خاڵە هەمزەم کەلەدەرەوە ئەڕۆیشت و ئە چوو بەڕێوە یا بەقایمی وەك ڕاکردن ئەڕۆیشت یاخود زۆر بە ئەسپایی کاك ئەحمەد تەهاش هەروەك خاڵە هەمزەی لێهاتبو ئەویش بەو جۆرە ئەڕۆیشت بەڕێوە.

باوکی هێرۆ کە ئەوسا سکرتێری پارتی دیموکراتی کوردستان بو کەناوی پارتی دیموکراتی کورد بوو ئەو ناوی کرد بە پارتی دیموکراتی کوردستان باوکی هێرۆ و برادەرانی بەناوی حیزب و میلەتەوە هەر زو بروسکەی پیرۆزبایی بۆ سەرکردەی شۆڕشی ١٤ی تەموزیان نارد کە ( مجلس قیادە الثورة )بو لەجیاتی رەئیس جمهور بە مۆقەت و قائدی عام قوات المسلحە عەبدولکەریم قاسم بوو. بڕیاریان دا کەلەهەموو شارەکانی کوردستانەوە وەفد بنێرن بۆبەغدا بۆ پیرۆزبایی ، وەفدی کوردی گەیشتە بەغدا پێش ئەوانیش باوکی هێرۆو برادەرانی چوون بۆ پیرۆزبایی کردنی هەموو پشتگیری و هەموو توانای جەماوەری حیزب و میلەت بۆ پاراستی ئەو شۆڕشە پیرۆزە.

باوکی هێرۆ ئیتر لەبەغدا مایەوە لەگەڵ برادەرانی دوایی ئەبو ئێمەش بگوێزینەوە بەغدا ئیجازەی حیزبەکان درا کەبە ئاشکرا ئیش بکەن دیارە کە ئیجازەی پارتیش درا کە ئیتر ئاشکرا بێت باوکی هێرۆ و برادەرانی هەوڵی بارەگایان دا کە بیگرن. من هەر زوو لەگەڵ منالەهەرە بچوکەکەم هێڤی کچم بو لەگەڵ هێرۆ و هەلۆ و باجی زەکیە هاتین بۆ بەغدا بۆماڵی



ڕێسانی خوشکم و کاك صدیق ئەتروشی هاوسەری کاك صدیق زۆر ئینسانێکی پیاو مەردو پاك و دڵسۆزمان بوو زۆر زۆرمان خۆشەویست بێجگە لەوەی دکتۆرای هەبوو لەعلوم دەرچووی ئەمەریکا بوو مامۆستای جامیعە کولیەی علوم بوو دوایش کرا بەعەمید. لەماڵی ڕێسانی خوشکم دابەزین ماڵیان لەصلیخ بو دو مناڵیشی هەبو هەڤاڵ و میان.

زۆرجار لەگەڵ کاك صدیق ئەچوین سەیری خانومان ئەکرد کە بیگرین بۆمان دایکم و خاڵم و مناڵەکانی ترم و ئەو خەڵکانەی لامان بوون لەکەرکوك مابونەوە خۆیان ئەپێچایەوەو چاوەڕێی خانوو گرتن بوون. بۆیە زۆر مەراقم بوو بەپەرۆش بووم بۆ خانوو گرتن باوکی هێرۆمان هەر نە ئەبینی ئەوەندە سەری قاڵ بوو هێشتا هەر ئەگەڕان بۆ بارەگا پەیداکردن بۆیە لەئوتێل تروکادیرو بوون لەبەغدا ، ئوتێل تروکادیرو هی کابرایەکی گاوری بوو زۆر هاوڕێی کۆنی خاڵە هەمزەم بو ناوی عەبد بو براکەشی ناوی یوسف مەتی بو ئەویش محامی بوو دائیم و هەمیشە گیراو و زیندانی بوو هاوڕێ و برادەرانی زۆر دڵسۆزی خاڵە هەمزەم بوو زۆر ناسیاومان بوون و لەمناڵیەوە کە هێشتا زۆر مناڵ بووم و بەحاڵ بیرم دێت کە خاڵە هەمزەم تەلەبەبو لەحقوق  من ئەو یوسف مەتیەم ئەبینی لەگەڵی کە هات بۆلامان ئەگەر بەڕێکەوت ئەویش و خاڵیشم زیندانی نەبونایە.

ماڵی شەفیقەخانی دایکی شاعیری خۆشەویست شێرکۆ بێ کەس ئەوانیش ئەوکاتە لەبەغدا بوون و شەفیقە خان لەدوای ئەوەی خوالێخۆش بوو کاك فایەق بێ کەس ئەمری خوای کرد شوی کرد بە کاك عومەر هەڵمەت کە زۆر کوڕێکی دڵسۆزبو بۆیان کاك عومەر هەڵمەت کە گویندە بوو لەئێستگەی بەغدا بەشی کوردی زۆر ئینسانێکی باش و لێهاتوبو. بۆیە کە زانیبویان هاتوم دەعوەتیان کردین ماڵیان لەوەزیریە بوو ئەو ڕۆژە لەوێ بردمانە سەر نان و چێشتە خۆشەکانی شەفیقە خانمان خوارد

باسیش هەر باسی شۆڕش و خۆشی و شادی هەموان بو و گەڕان و پەیداکردنی خانوو بۆ ئێمە ، ئاخری هەستاین بڕۆین بەپیاسە لەکۆڵانە کەیانەوە هاتینە سەر شەقامە گەورەکەی وەزیریە. وەزیریە زۆر شەقام و ناوچەیەکی خۆش و بەناوبانگ بو ، هەر لەکۆڵانەکەیان دەرچوین هاتینە سەر شەقامەکە و ژێر ئەو درەختە خۆشانەی ( کالبتوسی )بۆن خۆش لەویٚ توشی خانوێکی گەورەی هەندێ کۆن بوین دەستم درێژ کردە ئەو خانوە و گوتم ئۆ خوایە گیان خۆزگە کەلاوەیەکی وەکو ئەم خانوەشمان دەست کەوتایە هەر باش بوو وام گوت ئیتر لەگەڵ خوشکم و ئەو جەماعەتەی لەگەڵم بوون پیٚ کەنین و ڕۆیشتینە وە ماڵی خوشکم ئیتر هەر بیرشم نەما ، خەڵکیش و برادەرانیش هەر ڕایان ئەسپارد کە خانوومان بۆ پەیداکەن.

دوسیٚ ڕۆژی بەسەردا چو باوکی هێرۆ تەلەفونی بۆ کردم کە هەر زو زو تەلەفونمان ئەکرد بۆ یەکتری و گوتی : خۆت حازرکە سبەینیٚ برادەرێك دێت بە شوێنتانا بۆ سەیرکردنی خانوێك بەشکەم بەدڵت بێت ، سبەینیٚ ئێوارە برادەرهات سواری ئوتومبێلەکەی کردین و کەوتینەڕیٚ سەیر ئەکەم دوای تۆزێك ڕووی کردە وەزیریە. گوتم بۆچی خانوەکە لەکوێیە ؟ گوتی : لەوەزیریەیە. گەیشتینە وەزیریە سەیرئەکەم ئوتومبێل هەر ڕاست ڕۆیشت و ڕێك لەبەر ئەو خانوەدا ڕاوەستا کە من گوتم ئو خوا کەلاوەێکی وەك ئەوەشمان بۆ بنێری هەر سوپاست ئەکەم سەرم سوڕما هەروەها هەموو ئەوانەی لەگەڵیشم و سەیری یەکتریمان کرد. گوتم ئەمە خانوەکەیە بەڵام ئەو ڕۆژە خەڵکی تیابو بەردەرگاکەیان ئەشت ، کابرای برادەرمان گوتی : ئەمە شێخێکی بارزانی تیابوو کە حکومەت وەك دەست بەسەری کردبو لێرەو خستبویە ئەم خانوەوە لەگەڵ ماڵ ومناڵی ئێستە ئەوانیش بەرەڵابوون و ڕۆیشتنەوە. هەرچەندە خانوەکە لەتۆکمە گەورەکان بوو بەڵام



کۆن بو هەرچۆنێك بو گرتمان خەڵکیشمان نارد پاکیان کردەوە دایکم و خاڵم و نەنەو مناڵەکانی ترم ژنێکیش لەکەرکوك هاتە لامان دو کوڕیشی هەبوو حەوت هەشت ساڵ بوون مێردەکەی مردبو ناوی بەگم بو ئەوانیش دایکم هێنابونی لەگەڵ خولەشێتی خۆشمان و کوڕێکی هەرزەکاریش ناوی ئەحمەد هەورامی بو ئەویش هەر لەمناڵیەوە بەخێومان کردبو.

دامەزراین هەر ڕاست بەرامبەر ماڵەکەمان کە شەقامەکەمان بەین بو مەکتەبی ( المأمونیە النموزجیە ) بو لەبەرئەوە مناڵەکانمان ناردبو بۆ ئەویٚ هێرۆ و هەڵۆ. و شاناز و هەتاو کە زۆر مناڵ بوون ئەو مەکتەبە ئەوەندە نزیك بوو زۆرجار زەنگەکە لێی ئەدا هەندیٚ لەمناڵکانمان ئەوسا ڕایان ئەکرد ئەڕۆیشتن هەرچەندە ئەو مەکتەبە زۆر باش بوو دڵمان پیٚ خۆش بو چونکە مەکتەبی تایبەتی بو زۆر چاك بو بەڵام دوای بەینێك تۆزیٚ ئەرکیشیان هەبوو وەکو میوانێك بهاتایە بۆ ئەو مەکتەبە ئەهاتن و ئەیانگوت توخوا سەماوەرو پیاڵەی جوانمان بدەنیٚ میوانی گەورەمان بۆ دێت ، یا لەپڕ دەستمان لەئیشا بو سەرمان قاڵ کەچی پیرە مێردی فەراشیان ئەهات ئەیگوت هەندیٚ قاپی میوەی گەورە یا بەڕە یا فەرشێکی بچوك ئیتر لەم کارانە زۆریان هەبوو ئێمەش بە خۆشیەوە ئەماندانیٚ و بۆمان پەیائەکرد وەکو خزممان لیٚ هاتبو لەگەڵیان.

سەرمان قاڵ بوو لەبەغدا لەهەموو ڕویێکەوە میوانی زۆرمان ئەهات چ ژن چ پیاو تێکڕاو هەندیٚ برادەران ئەهاتن لەلای ئێمە کۆبونەوەیان ئەکرد بەتایبەتی کە ژووری دیوەخانێکی زۆر گەورە و فەرح و خۆشمان هەبوو خانوەکە هی ( منیر القاض ) کەکاتی خۆی مامۆستای باوکی هێرۆ بو لەحقوق ، دوایش بوبو بە وەزیر لەحکومەتی مەلەکی دا بۆیە منیر القاض زو زو سەری ئەدائین لەگەڵ باوکی هێرۆ ئەکەوتنە قسەو باسی حاڵ و ئەحواڵی وەزع. خەڵك بە کوردو عەرەبیەوە لەو پەڕی خۆشی و هەڵپەڕکیٚ و

شادی و هەموو ڕۆژێك خۆ پیشان دان بوو بەجۆرێك كە ئیتر زۆری خەڵك بەتەواوی بێزار بوبون و هاواریان لێ هەستا بو كە كوڕە باوكم لەڕێی خوادا بەسە ئیتر لێمان بگەڕێن كاسبی خۆمان بكەین. بەتایبەتی حیزبەكان بەربەرەكانی زۆریان بو كە كامیان زیاتر خۆیان بەرنە پێشەوە لەلای سەركردەی شۆڕشەكە حیزبی شیوعی ماوەی نەدابوە كەس هەر بەجارێك دونیایان خواردبو بەتایبەتی رەئیس مەحكەمەی شۆڕش ( فاضل مهداوی )كە خزمی زەعیم عەبدولكەریم قاسمیش بو ئەیانگوت كە شیوعیە و هەروەها (وصفی طاهر )یش كە ( مرافق )ی زەعیم عەبدولكەریم بو ئەویش سەر بە شیوعیەكان بو بەڵام باوكی هێرۆ و برادەرانی ڕێزێكی تایبەتیان هەبو لای عەبدولكەریم قاسم.

لەگەڵ ئەو هەموو هەڵپەركێ و هەموو ڕۆژێك خۆپیشاندانی شیوعیەكان لەخۆشی شۆڕش هەموو كەسێكیش بەشدار ئەبوون تیایە. ترسێكی زۆریش هەبوو لەدڵی هەموو كەسێكا ئەویش ترسی كودەتای ناحەزانی شۆڕشەكە بۆیە هەر چەند ماوەیەك لەلایەكەوە تەقە و هەرا بەرپا ئەبو بەڵام هەر زو دەم كوت ئەكران و لەژێر پێی میلەت ئەشێلران.

پارتی بارەگای پەیداكرد بوو لەباب المعظم نزیك شارع المتنبیو كەوتبوە چالاكی ئاشكرا. زەعیم عەبدولكەریم ڕۆژنامەیەكیشی دابە باوكی هێرۆ ڕۆژنامەی خەبات ، ئیتر خەبات كەوتە گەڕ و سەروتار نوسینە گران بەها و دەست و پەنجە زێڕینەكانی باوكی هێرۆ كەوتنە نوسین و كار هەروەها برادەرانی كەش شتیان تیا ئەنوسی بەتایبەتی مام جەلال ، خەبات بوبە ڕۆژنامەیەكی زۆر بەرز و بەناوبانگ. وەكو لەپێشەوە گوتم زروفی ماڵی ئێمە و حیزب زۆر شڕبو كرێی سێ مانگی بارەگا كەڵەكە بوبو لەسەر برادەران و نەبو بیدەن هەروەها برادەرانی ئێمە ئەیانویست بكەونە چالاكی و گەڕانەوەی خوالێخۆشبوو مەلا مصطفی بارزانی.



مەلا مصطفی ڕەحمەتی ڕەسمێكی بۆ باوكی هێرۆ ناردبو بەجلی ئەفەندیەوە دەستێكی لەگیرفانی بەر باخەڵی دابوو ئەو ڕەسمە زۆر ڕەسمێكی جوان و خۆشەویستەنی بوو بۆیە ویستیان ئەو ڕەسمە گەورەكەن و بلا وكەنەوە و ابزا□□ وەكو پۆستەر و شتی وا بەڵام پارە نەبوو بۆیە باوكی هێرۆ هات پێی گوتم ئەگەر ئاڵتونەكانمیان بدەمێ بیخەنە مەصرەف ( الرهون )ەوە كرێمان هاتۆتە سەر و بۆئەوكارانەی تر منیش گوتم وەی بەسەر چاو هەر ئەوان و هەر ئاڵتون حەز ئەكەی هەر بیبەن بیفرۆشن موبارەكتان بێت باوكی هێرۆ گوتی : نەو سوپاست ئەكەین تەنیا ئەیخەینە مصرەف الرهونەوە دوایی بۆت دەردێنین ئاڵتون درا بەدەست برادەرێكی زۆر خۆشەویستمان و بردی خستیە بانكەوە و پارەی پێ وەرگرت و كارەكانیان پێ جێ بەجێ كرد ئەوسا حبیب محمد كریم مأمور بو لەبانكی مصرف الرهون هەروەها گویندەش بو لەڕادیۆی بەغدا شەش مانگێ و ابزا□□ بەسەردا تێ پەڕی كرد كاتی دەرهێنانی ئاڵتونەكان هات بەڵام برادەرە خۆشەویستەكەمان كە بەناوییەوە خرابوە مصرف الرهونەوە لەگەڵ وەفد چوبوە دەرەوەی عێراق ، ئەوسا زو زو وەفد ئەنێرانە دەرەوە بۆئەوەی باسی باشی و چاكەی شۆڕش بكەن لەبەرئەوە هەر وەفد بەڕێوە بوو بۆ وڵاتان.

ئاڵتون كاتی هات و خەریك بو مصرەف الرهونەكە ئاڵتونەكە بفرۆشن كاك حبیب چەندجارێك تەلەفونی بۆ باوكی هێرۆ كرد كەچی بكەن چونكە ئاڵتونەكان حەیف بوون و هەمووی دەستكردی ئاڵتونگەری جولەكەی سلێمانی بەناوبانگ بو كە پێیان ئەگوت رفائیل و ئەگەر بانك بیفرۆشتایە زۆر بەهەرزانی ئەدا بۆیە كاك حبیب توانی فێڵێك بكات و و دیزە بەدەرخۆنەكەی بكات وەكو مەسەلەكە گوتەنی كاغەز و بەڵگەكانی لەبەرچاو ون كات بۆ چەند ماوەیەك تاوەكو برادەر گەیشتەوە بەغدا ئیتر

چو ئاڵتونه‌کانی ده‌رهێنایه‌وه. ئه‌و براده‌ره خۆشه‌ویسته‌شمان مام جه‌لال بوو. هه‌ر زو خوالێخۆشبوو مه‌لا مصطفی بارزانی بروسکه‌ی پیرۆزبایی بۆ سه‌رکرده‌کانی شۆڕش ناردبوو گوتبوشی که‌وا حه‌ز ئه‌که‌م بێمه‌وه ئه‌وسا خوالێخۆشبوو مه‌لا مصطفی له‌ئیتحادی سۆڤێتی بو له‌گه‌ڵ هه‌ندێ له‌هه‌مڕاهه‌کانی باوکی هێرۆ و براده‌رانیش که‌وتنه هه‌ڵپه‌هه‌ڵپ و چالاکی به‌هۆی کاك کریم قه‌رنیه‌وه که‌زۆر براده‌رێکی مه‌رد و پیاو بوو هه‌روه‌ها له‌سوپا و ناو شۆڕشدابو بۆیه هه‌ندێ ئیشی بۆ براده‌رانی ڕائه‌په‌ڕاند بۆیه که‌وتنه دوای پاسپۆرت بۆ مه‌لا مصطفی ی ڕه‌حمه‌تی و یه‌کێکی تر هه‌روه‌ها بلیتی ته‌یاره بۆ چه‌ند که‌سێك بکڕن که باوکی هێرۆ و کاك نوری ئه‌حمه‌د تـه‌ها و شێخ عوبێدی کوڕی خوالێخۆشبوو مه‌لا مصطفی و براده‌رێکی تریش ناوی اسعد خۆشه‌وی بوو دیسان دامان بۆ پاره بۆ بلیت یه‌ك دوانێکیان به‌حاڵ پاره‌ی بلیتی په‌یداکرد بوو دوانی که‌ش نه‌بو. باوکی هێرۆ هیچ خۆی تێك نه‌دا و به‌په‌له‌جوابی نارد بۆ کاکه‌ی حاجی مه‌حمود و کاکه حه‌مه‌ی خزمی له‌که‌رکوك که زۆر به‌په‌له‌ئه‌رزه‌که‌ی بۆ بفرۆشن و پاره‌که‌ی بۆ بنێرن ئه‌رز فرۆشرا و پاره درایه ده‌ست علی جگه‌ره هه‌ر دوای دوو ڕۆژ بۆی هێناین و زۆریشی خه‌فه‌ت بۆ خواردین چونکه ئه‌رزه‌که زۆر باش بوو خزمێکی علی جگه‌ره کڕیبوی ، باوکی هێرۆش که‌وته جێ به‌جێ کردنی کاری بلیت و سه‌فه‌ره‌که‌یان هه‌روه‌ها دیسان کرێ باره‌گا هاتبو ئه‌ویشی داو سواری ته‌یاره بوون و چوو له‌گه‌ڵ ئه‌وانی تر بۆلای مه‌لا مصطفی بارزانی نه‌مر بۆ ئیتحادی سۆڤێتی که بیهێنێته‌وه بۆ وولات.

له‌ڕێگا شه‌وه چوبون سه‌ری مصرو سه‌رۆك جمال عبدالناصریان دابو و گه‌ڕابونه‌وه. به‌خۆشی و شادی و ڕێزو حورمه‌تێکی زۆره‌وه خه‌ڵك چوون به‌پیریانه‌وه. که کاتی خۆی خوالێخۆشبوو مه‌لا مصطفی بروسکه‌ی پیرۆزبایی ناردبوو گوتبوی ئه‌مه‌وێت بێمه‌وه هه‌ندێکیان له‌و سه‌رکردانه گوتبویان جوابی بروسکه‌که‌ی بده‌نه‌وه و بڵێن. بڕۆ بڕۆ بڕۆ هه‌ندێکیان شۆڤێنی بوون و ڕقیان له‌کورد بو له‌ژێره‌وه به‌ڵام زه‌عیم عبدالرکیم قاسم وانه‌بوو. مه‌لا مصطفی گه‌یشته جێ و خرایه خانوی نوری سه‌عیده‌وه به‌ماڵ و مناڵه‌وه تاوه‌کو خاڵه هه‌مزه‌شم له‌وێ له‌گه‌ڵی بوو لێی جیابونه‌وه‌و له‌وێ ژووری هه‌بوو ، ئیتر وه‌فد که‌وتنه هاتن له‌کوردستانه‌وه بۆ به‌خێرهاتنی خوالێخۆشبوو مه‌لا مصطفی و براده‌ران سه‌ریان قاڵ بوو که‌وتنه خۆیان چونکه شیوعیه‌کان که‌وتبونه ئاژاوه گێڕان و دیعایه‌ی خراپ بڵاوکردن و دژایه‌تی پارتی و خه‌ڵك ڕاکێشان بۆلای خۆیان به‌تایبه‌تی له‌کوردستان ، شیوعیه کورده‌کان ئه‌گینا عه‌ره‌باکان زۆر باش بوون له‌گه‌ڵ براده‌رانمان به‌ڵام کورده‌کان هه‌روه‌ك ئه‌چون گوریسیان ئه‌گرت به‌ده‌سته‌وه‌و خه‌ڵکی فه‌قیریان بانگ ئه‌کرد که وه‌رن چه‌ند ئه‌رزتان ئه‌وێت یه‌کی بۆ خانوێك بتان ده‌ینێ هی ئه‌م اقطاعیة_خراپانه. به‌تایبه‌تی له‌که‌رکوك وایان ئه‌کرد. و خه‌ڵکیان ئه‌خه‌ڵه‌تاند تاوه‌کو له‌جیاتی پارتی شوێن ئه‌وان که‌ون.

وه‌فدی ئافره‌تانی کوردستان هاتن بۆ به‌خێرهاتنی مه‌لا مصطفی ی خوالێخۆشبو و ناسیاوه‌کانمان له‌ماڵی ئێمه دابه‌زین هی که‌ش له‌ماڵی ناسیاو خزمه‌کانیان ، هه‌موو خۆیان کۆکرده‌وه و که‌وتنه‌رێ بۆ ماڵی مه‌لا مصطفی ی نه‌مر منیش چوم له‌گه‌ڵیان ، من قه‌ت ئه‌ندام نه‌بووم له‌هیچ شوێنێك نه‌له‌حیزب نه‌له‌ئافره‌تان به‌ڵام ئه‌چووم له‌گه‌ڵیان بۆ هه‌ندێ شوێن وه‌کو چووین یه‌ك دووجار بۆلای زه‌عیم عه‌بدولکه‌ریم قاسم که زۆر ئینسانێکی باش و ڕه‌وشت و خو به‌رزبو چونکه ڕه‌وشت و خوی به‌رزی پیاو هه‌ر زو ده‌رئه‌که‌وێت و ژن هه‌ستی پێ ئه‌کات. لای زه‌عیم عه‌بدولکه‌ریم قاسم چه‌ند که‌سێکی تری لێ بوو که هه‌ندێکیان کورد بوون ناویان ناڵێم ئه‌وان دیاربوو چاو باشقاڵ بوون و هه‌رچاویان ئه‌ربڕیه ئه‌و هه‌موو ژن و

کچە جوانە کوردە بەجلی کوردیەوە بەڵام زەعیم عەبدولکەریم هەر ئەتگوت کچ و خوشکی خۆشەویستی هاتون بۆلای زۆر مهرەبان بوو لەگەڵمان بۆیە زۆرمان خۆشەویست هەروەها هەموو خەڵك و جەماوەر ئەوەندەیان خۆشەویست ئوتومبیلەکەیان هەڵەگرت ئەگەر بە شوێنێکدا تێ پەڕیایە.

جارێکیان خەریك بو هەڵۆی کوڕم کە شەش ساڵ بو وون بێت لەبەر عەبدولکەریم قاسم. من و باوکی هێرۆ و هەڵۆ و دوکچی پورزام چوبوین بۆ بازاڕ لەسەرو شارع الرشید بووین کەلەپڕ گوتیان زەعیم هات و خەڵك هەموو تێك ئاڵان و ڕژانە سەر شەقامەکە لەو هەراو قەڵەباڵغیە ئێمە لەئوتومبیلەکە دابەزین و ئوتومبیل ڕۆیشت چونکە ڕێگای نەبو ڕاوەستێت باوکی هێرۆ وەی زانی هەڵۆ دەستی لەدەستی مندایە منیش وەم زانی هەڵۆ لای ئەوە کە عەبدولکەریم تێ پەڕی و هەندێ شلۆغی شەقام هێمن بوەوە یەکترمان دیت لەگەڵ باوکی هێرۆ گوتم کوا هەڵۆ گوتی ئەی لای تۆ نیە ؟ ئەڵێم یاخوا کەس وای بەسەر نەیەت تاوەکو دوژمنیشم منالی وون نەبێت هەربە تەواوی شێت بووم و کەوتمە ناو خەڵك و شەقام بەگریان و چەپۆك لەخۆدان و پەلامار دانی ئەم و ئەو و پرسین ، بەجۆرێك خەڵك زۆر ارڧەت بوون ۆم د لێان ئەد امەوە هەر ذازا باوکی هێرۆ هەرچی لێهات دوایی سواری تاکسی بووم بەخۆ کوشتنەوە بۆ ماڵەوە تەلەفونیشمان بۆ دایکم کرد بۆ ماڵەوە دایکیشم لەمن خراپتری بەسەر هاتبوو.

هەڵۆش تۆ بڕۆ و شوێن ژنی عەبابەسەر بکەوە و وابزانە دایکتە و کە ئاوڕئەداتەوە من نیم ئەچو شوێنی ژنێکی تر ئەکەوت. دوایی کابرایێکی پیاو و مهرەبان کە ئەبینێت ئەم منالەشڵەژاوە و هەر سەیری ئەم ژن و ئەو ژنە ئەکات بۆیە لێی ئەپرسێت ئەڵێت باوکە ئەوە تۆ بۆ کوێ ئەچیت هەڵۆ ڕائەوەد تێ و ئەلێ ذازا بۆکوێ ئەچم چونکە دایکم و باوکم لێم وون بوون. پیاوەش دەستی ئەگرێت و ئەیباتە ئۆفیسەکەی کە خاوەن

ڕۆژنامەی الحریە بوو و ئەو ڕۆژنامەیە زۆر شۆڤێنی بوو زۆرجار قسەی ناحەزی بە هەموو کەس ئەگوت و باوکی هێرۆ و برادەرانی ڕقیان لێی بوو.

هەرچۆنێك بێت کابرا هەڵۆی لەسەر کورسی دائەنیشێنێت و ئەڵێت کوڕی باش تەلەفونتان هەیە هەڵۆش ژمارەی تەلەفونی پێ ئەڵێت بەڕێکەوتیش دو ڕۆژ لەوەو پێش تەلەفونمان بۆ هاتبو و تەلەفونمان نەبوو هەڵۆ ژمارەکەی لەبەر کردبو بەو منالیەو بە پەلەبەو دو ڕۆژە کە تەلەفون هاتبوو ئەویش تەلەفونی بۆماڵەوە کرد بوو. من کە گەیشتمە ماڵەوە بەو حالەدایکم هات بەپیرمەوە و گوتی هەڵۆ دۆزرایەوە لەبازاڕەوە باوکی هێرۆ تەلەفون بۆ مام جەلال ئەکات،مام جەلالیش هەروەك هەمیشەی خۆی کە چەند پیاو و دڵسۆز و مەرد و کەم وێنەیە و هەمیشە وابووە و لەهەموو زروفێکدا مام جەلال هەر ناوی خۆی بەخۆیەوە بووە. ئەوەی ئەو ڕۆژە مام جەلال کردی بۆ ئێمە لەکردەوە لەبیر نەچوەکانبوو. پێش ئەوەی هەڵۆ بدۆزرێتەوە هەر خەریك بو بەغدا بشێوێنێ و تێکی بدات و سەرو ژێری کات بۆ نەگبەتیش دونیا ئێوارە بوو خەریك بو تاریك ئەبوو.

لەسایەی خواوە هەڵۆ لەگەڵ مام جەلال گەڕانەوە ماڵێ ئیتر منیش وەك پاسەوانی جریدە الحریەم لێهات کێ ئەیتوانی قسەی پێ بڵێت بە خوا وەستم ئەنایە بینیان. یاوەکە ذلوی قلد م بو تە لەفو بۆ پیاوەکە کد پ چەند جارێك کە زۆر نوسەرێکی ناسراوبوو بۆیە بەجارێك بوبە مەلائیکەت لای من لەبەر هەڵۆی کوڕم.

تێکڕا عەرەبی عێراقی زۆر زۆر مەرد و پیاو بوون بەرامبەر بە ڕوداوی وا بەتایبەتی بە ژن و منال خۆیانیان لەسەر ئەدا بە کوشت. بە پێچەوانەی وولاتە دراوسێکانی عێراق بەتایبەتی ئێران بە درێژایی کات هەر منالەوون

بووە قەتیش نادۆزرێنەوە و هەر ژنە و کچە و فرێنراوە. دوایی بە کوژراوی دۆزراونەتەوە. بەڵام عێراقی زۆر مەردن بەرامبەر بەو ڕووداوانە.

لێرەدا ئەمەوێت هەندێ باسی ئەوچونە وەفدانە بکەم کە هەر وەفدبوو بـەڕێوەبوون بـۆ دەرەوەی عێـراق بـۆ ئـەوروپا و وولاتـە عەرەبییـەکان. وەفدەکانیش لەهـەموو خـەڵکێکی تیائـەبوو. تێکڕاش باوکی هێـرۆ یا مام جەلال شیان لەگەڵ بوو جارێکیان کە باوکی هێرۆ چوبو مەلایێکی وەزارەتی ئەوقافی بەغدای زۆر گەورەشیان لەگەڵ بوو هەروەها وەفدی ژنی عێراقیش کە پێکهاتبون لەسێ ژن. باوکی هێرۆ ئەیگوت مەلاکە بەجبەو عەبا و سەرو کلاو کەشیەوە زۆر قسـە خـۆش و گاڵتەچی بـوو هـەموو وەفدەکـە ئـەمردن لەبەر پێکەنین بە قسـە خۆشـەکانی کـاتێ وەفدەکـەیان لـەوولات ئـەگێڕاو و شتیشـیان پێشـان ئـەدان و ئـەو لـەژێرەوە بەئەسـپایی قسـەکانی ئـەکرد و فرمێسکی پێکەنین لەچاوی هەموویانی دەرەپەڕاند. باوکی هێرۆ ئەیگوت پـێش هـەموو شـتێك باسـی ژنـەکانی ئـەکرد کەلـەناو وەفدەکـەیان بـوون ، ژنەکان هەندێ ناشرین بوون بەتایبەتی سەرۆك وەفدی ژنەکان مـەلاش هـەر باسـی ئـەکرد و ئـەیگوت هـاوار بـەخوا حـەیامان چـوو ئێسـتە خـەڵکی ئـەم وولاتە ئەڵێن ئەمە ژنی عێراق هەموو واناشرینن ئەوە کەسی کەیان دەست نەکەوت هەنێ جوان بیان هێنایە لەگەڵ خۆیان.

جارێکی تـریش بـاوکی هێـرۆ گەڕایـەوە لەسـەفەری وەفد و وەفد کـاری دوای گەیشـتنی بـۆ ماڵـەوە هـەموو دڵمـان خـۆش بـوو پێـی و منـاڵان تێـی ئـاڵان. دوای بـەینێك دانیشـتین و قسـەکردن هەسـتام چـوومە سـەرێ بـۆ ژوورەکـەمان جانتاکـانی بـاوکی هێـرۆ برابونـە ئـەوێ منـیش چـووم بـەلای ـانتاکانەوە و کردمنەوە کە بزا ڕەسم و شتی پچێیە ئیتر کەوتمە ناویان گۆڤار و ڕۆژنامەو ڕەسم و ئەو شتانەی تیابو سەیرم کردن هەروەها هەندێ کاغەزیشی هەروا بڵاوبوون کۆم کردنەوە ویستم بیانخەمە زەرفەوە تاوەکو



گـوم نـەبێ لـەناو کاغـەزەکانا نوسـراوێکی وەکـو شـیعرم بەرچـاو کـەوت کەبەختی باوکی هێرۆ منیش گرتم بەدەستمەوە و کەوتمە خوێندنی هەر بەیـەکم دێـڕ و دوهـەم دێـر تورەبـووم و بـەجارێك هەڵچـووم و هەسـتام هەبەلەد ولاچ وومەخ ولی کە بزا باوکی هێـرۆ چـوبۆ کـوێ و لـەکام ژوورە. کە دۆزیمەوە هەروەك لافاو و دەست ڕێژ قیڕاندم بەسەریا و دەستم ڕاوەشاند بەکاغەزەکانەوە گوتم ئەمە چیت نوسیوە ؟

باوکی هێرۆ کە ئـەیزانی باسـی چـی ئەکـەم یـەك قاقای لێدا و پێکـەنی بەدڵ و گوتی : ئەمە شیعرە لەکەنار دەریا نوسیومە وولاتەکەی کە چووین بردیانین بۆ گەڕان ئەو چەند ڕۆژە شوێنی خۆشی وولاتەکەیان پیشان داین دوایش ئێمەیان بردە قەراغ دەریا کە سەیری دیمەنی دەریا و ئەو خەڵکانـە بکـەین کـە لـەوێ بـە درێـژایی کـەنار دەریاکـە خۆیـان هەڵخستبوو خـەریکی مەلەبوون. منیش لەسەر هەمان تورە و قیڕە و چوون بەگژدا گوتم : بۆچی تۆ نێـرای بۆ شیعر بەسـەر کچ و ژنـە مەلەوانکـەران هەڵـدەی و بنوسـی یـا نێرابوی بۆ کارێکی تر؟ باوکی هێرۆ دیسان دایەوە قاقای پێکەنین و گوتی : بۆچی تۆ هەموو شیعرەکەت خوێنـدەوە ؟ ئـاخر دە هـەمووی بخوێنـەوە و تـەواوی کـە ئینجـا وەرە بەگـژما. دەسـتم دیسـان بەکاغـەزەوە ڕاوەشـاند و لەسـەر هـەمان قـڕە گـوتم : بـەڵێ هـەموویم خوێنـدەوە. پارچـە دێڕەکـان بـەم جۆرە نوسرابوو.

بالاً بەرزو شۆخ وەك حۆری پەری چـــاو

شین وەك دەریای بێ بن

مەمك خڕ سوتیان دڕ ڕومـەت پـەڕەی

گوڵ

بەڵام هەموو ئەمانە و صـەد

ئەوەندەی تر

دیارە شیعرەکە سێ چوار دێری تریشی لەسەر بو که بیرم نەماوە و بەم دوو دێڕەی ئاخری کۆتایی پێ هێنابوو کە ئەڵێت ئەمانەو صەد ئەوەندەی تـر.... داخـم ناچـێت لەبـەر زروفـی ناڵـەبارمان و هەمیشـە نائـارامی و دەربەدەری و ڕاکردن و ماڵ گواستنەوە لەم لا بۆ ئەولا و ئەم شار بۆ ئەو شار زۆرمان زیان لێکەوت لـەڕووی هـەڵگرتنی زۆر نامـەی گرنگ و ڕەسم و ئەوشـتانە بێجگەلەلەناوچونی ناومـاڵ و شـتی زۆر یادگـاری بەبـەها بـەڵام هـەموو ناومـاڵ و شـتی زۆر و قـاڵی دونیـا لای مـن ئـەو پارچـە شـیعرەی نەئـەهێنا یـاخود کاسـێت و شـریت و ریکـۆردەری زۆر بەبـەها و یادگـاری وەکو دەنگی نەنکی دایکم کە دانیشتبو لیلۆزی کچمی ئەنواند و گۆرانی لاواندنـەوەی تـورکی بـۆ ئـەگوت شـریتەکە زیقـە زیقـی جۆلانەکەشـی تیـا ئەبیسـترا. نـەنکی دایکـم چـونکە خـەڵکی وان واردیـش بـو یـەعنی دایکـی نەنکم نەنە حەلیمە زۆر کوردی بەباشی نەئەزانی کاتێ دڵی خۆش ئـەبو بـە تورکی خۆشی دڵی خۆی دەرئەبڕی یا ناڕەحەت و نـەخۆش ئـەبو بـەتورکی ئەیلاوانـدەوە بڕواناکـەم کەسـێك بیتوانیایـە لەبـەر سـۆزی ئـەو دەنـگ و لاواندنەوەیـە خـۆی بگرتایـە و دەسـتی نەکردایـە بـەگریان. لـەو شـریتە بەنرخە فەوتاوەکان شریتی دەعوەتێکی تیابو لەماڵی ئێمە کە شێخ حسین بـەرزنجی گـۆڕانی تیـا ئـەڵێت کـە دەنگی زۆر زۆر خـۆش بـوو هـەروەها هـەر لەهەمان دەعوەتدا کە لەکەرکوك بوین کاکە حەمەی سەید ئەحمەدی خانەقا قۆریاتی کەرکوکی ئەگوت کە ئەویش زۆر زۆر خۆشی ئەگوت.

لەدوای بەینێك کەمتر لەساڵێك کودەتایێکی زۆر گەورە لەموسڵ ڕووی دا ( کودەتای شواف ) کودەتـای شـوافی بەشـان و بـازو و هیمـەت و هەڵمـەتی کورد کوژێنرابوەوە و لەناو چوو هەروەها بەینێکی باشیش سـەرکردەکانی



شۆڕشـی تـەموز بەربـونـە سـەرو پۆتـەلاکی یـەکتری زۆریـان دژی زەعـیم عەبدولکەریم قاسم بوون شۆڤێنی و چەند بابەت بوون.

بـەڵام هـەر عەبدولکـەریم قاسـم سـەرئەکەوت بەسـەریانا چـونکە میلـەتی لەگەڵ بـوو تـاوەکو برینداریشـیان کـرد کـاتێ کـە ئوتومبێلەکـەیان دایـە بـەر گولـە. ئـەویش دوایـی دەرکـەوت کـە حیزبـی بـەعس وایـان کردبـوو تەقەکەرەکان صدامیان لەناوابوو بەبریندارابونی زەعیم عەبدولکـەریم قاسـم بەجارێك دونیا شێوا و میلەت هەموو ڕژانە سـەر شـەقام ڕێگاوبـان بـەگریان و خۆکوشـتنەوە تـاوەکو بـەیان دەرچـوو ڕەسمـی دەرچـوو و پیشـانیان دا لەناو تەلەفزیۆن بەپاڵ کەوتویی قسەی ئەکرد و میلەتی دڵنیا کرد جارێکی تر بەجۆرێکی تر شار و شەقام و جادەی عێـراق و هـەروەها کوردسـتانیش بوبەهەرا و هەڵپەڕین و هەڵهەڵەو خۆشی.

تـاوەکو بـاوکی هێـرۆش چـەند دێـڕ شـیعرێکی بـۆ نوسـی لـەدوا دێـڕدا نوسی ( بەڵام کەریمی تەنیا کەس نازانێ مرد یا ژیا ) ئەڵێت بۆیـە کـریم وا لـەناو دڵـی میلـەت دایـە چـونکە میلـەتی لەگەڵـەو خۆشـی ئـەوێت هـەروەها ئەویش میلەتی خۆش ئەوێت بەڵام ئەگەر کـەریم بەتـەنیا مایـەوە و دەسـتی لەمیلەت بەردا ئەوسا کەس نازانێت مرد یا ژیا.

هەر دوای دەرچونی لـەناو تەلـەفزیۆن گـۆڕانێکی زۆر خۆشیان بـۆ گـوت ئـەویشلد مد [illegible] عالا لا مەسلەوو ) بەمج ۆرە رۆدو اذای پڕ لەخۆشی و . ناخۆشی و ترس دوو ساڵمان بردەسەر.

پـارتی حـاڵی هەندێ باشـتر بـوو گواسـتیانەوە بـۆ ناوچـەی بتـاوین لـەوێ بارەگایـەکی خۆشـی گـەورەیان گـرت بارەگاکـە دو دەرگـای هـەبوو هـەروەها ژێـر زەمینێکـی گـەورەی خۆشیشـی هـەبوو پـارتی چـاپخانەی خـۆی بـو و لەوێ کەوتە خەبات دەرکردن دیـارە چـاپخانەیەکی زۆر سـادە و قورسـەکان بو کە حەرف حەرف بۆی ڕیزئەکرا و هەموو شەو خـەریك ئـەبوون و بـەیانی

خەبات دەرئەچو و ئەکەوتە دەست خوێنەرانی جاری واهەبوو ئەگەر ئێوارە باوکی هێرۆ لەماڵ بوایە و ئەبو سەر وتار بنوسێت بۆیە لەبەتاوینەوە ئوتومبیل ئەنێرایە وەزیریە ماڵی ئێمە بۆ بردنی سەروتار بۆ چاپخانەی خەبات لەبارەگا. هەندێ جار باوکی هێرۆ دیسان ئەکەوتە سستی و لەسەر خۆ نوسینی و ئەوانیش لەوێ چاوەڕێیان ئەکرد بۆیە هەندێ جار ئەگەر سەروتارەکە زۆر گرنگ بوایە و بۆ مناسەبەتێك بوایە برادەران تەلەفونیان بۆ ئەکردم و ئەیانگوت براژن ئیتر ئەوە لەسەر تۆ و هەر تۆ پێی ئەوێرێ منیش ئەم گوت وا لەسەرێ خەریکە دوای بەینێك گوێم لەدەنگی تەقەی چەکوچ و داکوتان ئەبو لەسەرێ و لەسەرخۆ ئەچومە سەرێ ئەچومە ژوورەکەمان کەلەوێ دائەنیشت شتی ئەنوسی ژوورێکی زۆر گەورەو خۆشی لەسەر باخ و شەقامەکە بوو سەیرم ئەکرد خەریکی داکوتانی کتێبخانەکەیەتی ئەم گوت ئەوە چیە ؟ ئەی کوا سەوتار برایم زازوی قوڕبەسەر دووسەعاتە بە ئوتومبێلەوە لەبەر دەرگایە وا ئێوارەیە ئێستە کاتی دارتاشیە ؟ سەیری ئەکردم و بەخۆشی و زردەخەنەوە ئەیگوت بۆچی تۆ وا ئەزانی چی ئەکەم ؟ من بزمار دائەکوتم بەلاّم لەمێشکما سەروتارەکە ئەنوسم و حازری ئەکەم و ئێستە بەپاکی و ئامادەیی ئەیخەمە سەر کاغەز. خەبات وای لێهات ئیتر بەر کەس نەئەکەوت و هەر زو لەبازاڕا نەئەما چونکە هەمووی پڕبوو لەڕاستی و ئاوات و ئارەزو هەست و بیری میلەت.

باوکی هێرۆ حەزی لەدارتاشی بوو هەر فرسەتێکی بدیایە ئەکەوتە چەکوچ و بزمار هەمووجارێك ئەیگوت ئەگەر مامم نەبوایە ( مامە ڕەمزی فەتاح ) ئێستە وەستای دارتاشی بووم چونکە باوکم حەزی ئەکرد کە ببم بەدارتاش بەلاّم مامم هەرزو منی نارده مەکتەب. مامە ڕەمزی زۆر پیاوێکی ئاقڵ تێگەیشتو و خوێندەوار بوو کاتی خۆی لەئەستەنبوڵ خوێندبوی و



زۆر پێشکەوتن خوازو لێهاتو بو. من زۆرم خۆشەویست و زۆر ڕێزم لێ ئەگرت ئەویش زۆر ئێمەی خۆشەویست خۆشەویستی لەگەڵ باوکی هێرۆ بێ وێنەبوو زۆرجار ئەیگوت هەردوو کوڕەکەم بەقوربانی مویێکی سەری برایم بن هەندێ جار پێمان ئەگوت مامە گیان بۆ وا ئەڵێیت لەبەرچاوی ئامۆژن گوناحە پێی ناخۆشە وابەکوڕەکانی ئەڵێیت بەلاّم مامە ڕەمزی هەر وای ئەگوت و گوێی لەکەس نەبو بەرامبەر بە خۆشەویستی باوکی هێرۆی برازای. لەو ماوەیەی کاك نوری شاوەیسی خوالێخۆشبو و دایکی ڕۆژ ەملڵ و منالّوە گویزرانەوە بۆ بەغدا لەموسڵ لەوەکاك نوری لەوی وابزا□□ مودیر عامی ئەشغاڵ بوو هاتن و بوون بەدراوسێمان لەپشت ماڵەکەمان و هەر لەباخی خانوەکەمان کە تیابوین هی منیر القاض نیوەی لەباخەکەی بریبو و کردبوی بە موشتەمەلێکی گەورە زۆرمان پێ خۆش بوو کەهاتن و ئێمە ئەو خانوەمان بۆ پەیداکردن ئیتر منالّەکانمان تێکەڵ بەیەك بوون ووردەکانی ئەوانیش چونە مأمونیە. زۆر تێکەڵ بووین کاك نوری شاوەیس پیاوێکی زۆر فیداکارو دڵسۆزو بەغیرەت بوو. لەگەڵ ئەوەشا کە وەزیفەی حکومەتی هەبوو بەلاّم هەر خەریکی چالاکی حیزبی بوو تێکڕا لەبارەگا بووشتی چەوتی قبوڵ نەئەکرد و زۆر سەر ڕاست بوو لەگەڵ ئەوەشا زۆر خۆش باوەڕ و دڵ پاك بوو ناهی خان ( دایکی ڕۆژ ) بەکەیفی خۆی ئەیتوانی کاری تێ بکات و هەڵیگێڕێتەوە. چەند جارێك لەماڵی ئێمە برادەران کۆبونەوەیان کرد هەڵبژاردن بو شتێکی وابو ( لەبەرئەوەی من هیچ کات ئەندامی حیزب و ئافرەتان نەبووم هەقم نەبو بەسەر ئەو کارانەوە بەلاّم ئەوەی بەهۆی خالّم و باوکی هێرۆوە ئەم دیت و لەناویانا بووم و لەبەرچاوم ئەبو ئەوانە باس ئەکەم ) من لەتەمەنی پێنج ساڵیەوە لەناو دەربەدەری و نەفی و بەزمی گرتن و هەلاّدا گەورە بوبوم لەبەرئەوە وەکو عەرەب گوتەنی ( اشباع ) بوبوم لەو دانیشتن و کۆبونەوەیە مەلامصطفی ی

بارزانی نەمریشی لێبو و کاک سەید عەزیز شمزینی دەنگە دەنگی زۆر بوو لەناو هەموویانا گوێم لەدەنگی کاک نوری شاوەیس بو کەناڕەزایی خۆی دەرەبڕی بەرامبەر بەکارێك کە ڕوی دابوو گوێی نەئەدایە لەبەرخاتر یا ئەی وانەڵێت. کاک سەید عەزیز لەگەڵ خوالێخۆشبوو مەلا مصطفی لەئیتحادی سۆڤێتی بوو لەگەڵ ئەویش گەڕایەوە.

لەو ماوەیە زو زو حەفلەو زەماوەند ئەکران لەلایەن دەزگاکانی حکومەت و سەر بە زەعیم عەبدولکەریم قاسم و هەروەها لەلایەن حیزب و کۆمەڵگاکانیشەوە خەڵك هەر بەوا ئەگەیشتن خۆیان بڕازێننەوە بڕۆن بۆ ئەو جۆرە زەماوەندانە کاتێ بانگ ئەکران زۆرجار سەرۆك عەبدولکەریم قاسمیش لەوێ ئەبو یا تێکرا مهداوی کە سەرۆك مەحکەمەی شۆڕش بو لەگەڵ ئەوانەی دەورویشتی زەعیم عەبدولکەریم دیارە هەمیشە پارتیش بانگ ئەکران و باوکی هێرۆ کە سکرتێری پارتی بو ئەو بانگ ئەکرا کەچی ئەچوون لەگەڵ برادەرانی تر گەلێ جار کاك نوری شاوەیس و دایکی ڕۆژیش ئەچوون بەتایبەتی کە هاتبون و ئیتر لەبەغدا ئەبوون کەچی دوایی لەدەمی ئەوانەوەم ئەبیست کە ئیمشەو لەو جۆرە زەماوەندو حەفلانە بوونە جارێك کە بیستم زۆر توڕەبووم و هەڵم کوتایە سەر باوکی هێرۆ و گوتم ئەوە بۆچی بە منیش ناڵێیت کە بێم و هەر خۆت ئەچیت کە کارتەکەی بۆت دێت ناوی منیشی تیایە. باوکی هێرۆ کە ئەویست خاوم کاتەوە پێگەنینەکەی ش لردەوە و گوتی ه ا وا وەم زانی نایەیت چونکە تۆ زو ئەنویت وەم زانی تاقەتت نیە بێیتە شوێنی وا منیش هەر ئەمگوت بۆ بە منیش ناڵێیت ئاخری گوتی : ئەزانی بۆچی پێت ناڵێم ؟ چونکە لەو جۆرە شوێنانە هەمووی هەر زابت و پیاوی چاو باشقاڵن بەناو خەڵکەکاندا ئەگەڕێن گوایە بۆ سەلام و هەواڵ پرسینی ناسیاوەکانیان بەلام بەخوا لەڕاستیدا لەبەر سەیرکردنی کچان و ژنانن خۆم گوێم لێیان بووە کە



یەکێکی کوردی ناسیاویشمان لەگەڵیان بووە خۆم ئاگام لێیان بوو ئەوجۆرە قسانەیان ئەکرد بۆیە حەزناکەم بێیت. هەروەها ناوی ناسیاوە کوردەکەشی پێگوتم کە کێ یە کە ئەویش لەسوپا بوو گەورەش بوو. لەدوای دوساڵ بگرە هەندێ پتریش و دوای پەلاماردان و چەند کودەتا زەعیم عەبدولکەریم قاسم ناوچەو دەورویشتی و دەزگاکانی حوکمی بۆ پاك کرانەوە و پشتی ڕاست بو لەو ڕووەوە. دیارە هەموو ئەم کارانەی کە کران بە هیمەت و بەرەکەتی میلەت بوو بە کوردو عەرەبەوە لەبەرئەوە کە زەعیم عەبدولکەریم دونیاکەی بۆ تەخت بوو لەگەڵ ئەو هەموو خۆشەویستی و بەتەنگەوەبونی گەل و هاولاتی وەکو شتێ ئیتر وەکو لەخۆی بایی بێت وای لێهات هەروەها زۆر ناحەزی کوردیش کەوتنە قسە هێنان و بردن و کاریان تێ کرد بەتایبەتی حیزبی شیوعی کە ڕەفتاریان زۆر دوژمنانە بو بەرامبەر بە پارتی بەتایبەتی شیوعیە کوردەکان ئەویش وردە وردە کەوتە جوڵەو بیانو گرتن لەکورد یەکەم شاڵاوبردنی بۆسەر کورد فەرمانی دەستگیرکردنی باوکی هێرۆ بوو دای بە مەحکەمە لەسەر ئەو وتارە بوو کەنوسی بوی ( العراق لیس جزو من الامە العربیە )لەسەر ئەو سەروتارە بو بەهەرا کەلەڕۆژنامەی خەباتا نوسیبوی ڕوژی مەحکەمەی ۆ د انر او ابزا صەد و دوصەد محامی هاتنە پێشەوە کە دیفاع لەباوکی هێرۆ بکەن تاوەکو لەبەصرەشەوە محامی ئامادەیی خۆیان دەربڕی و ناوی خۆیان نوسی هەرچەندە باوکی هێرۆ خۆی ئەوەندە محامێکی زیرەك و لێزان و پێشکەوتو بو کە پێ ویستی بەکەس نەبو لەسەری بکاتەوە بەلام زۆر خۆشی و دڵنیای و پشت ئەستوری بوو بۆی کە ئینسان ئەوەندە بە قیمەت و خۆشەویست بێت کە ئەوەندە محامی ئامادەبن لەسەری بکەنەوە. ئاخری مەحکەمە بوو بەپێی ئەو قسەو بەڵگەنامانەی باوکی هێرۆ و هەندێ لەمحامی تر پیاداچوون و خستیانە ڕوو توانیان بەپێی قانون وابکەن

کەئـەوەی بـاوکی هێـرۆ نوسـیوێتی هـیچ جـێ گومـان و ناڕاستی نیـە. بۆیـە مەحکەمە نەیتوانی حوکمی بدات و بێ گوناه دەرچوو.

بەڵام حکومەتی کریم قاسم بێ دەنگ نـەبوو لـەژێرەوە و ئاشـکرا کەوتـە شەڕفرۆشتنی و پیلان گێڕان.

ئـەم جارە فـەرمانی گرتنـی بـۆ بـاوکی هێـرۆ دەرکـرد کـە گوایـە صـدیق میرانــی کوشــتوە لــەڕێگای شــەقڵاوە. دیــارە ئــەبو بــە ڕیمــۆد کــۆنترۆڵ کوشـتبێتی هەرچـەندە ئەوکاتـە ڕیمـۆد کـۆنترۆڵ هێشـتا بـڵاو نـەبوبووەوە ، چـونکە بـرایم ئەحمـەد لەبەغـدا و صـدیق میرانـی لەشـەقڵاوە ئـەبێ چـۆنی کوشتبێ صدیق میران لەکوردە یاخیەکان بـوو خـەریك ئـەبوو ببێتـە دەست عەسای حکومەت بۆ لێدانی کورد.

ئـەم جارە دەزگـای ئـەمن و پـۆلیس چـوبون پـەلاماری مەقـەڕیان دابـوو لەبەتاوین بۆ گرتنی باوکی هێرۆ بەڵام هـەر زو برادەران توانییویـان بـاوکی هێـرۆ لەدەرگاکـەی پشـتەوە ڕزگـار کـەن ، ئیتر ئـەو پـەلاماردان و دانـە سـەر بارەگا و فەرمانی گرتنی باوکی هێرۆ بو بە ئاشکرا کردنی نیازی حکومەت بەرامبـەر بـە کـوردو لـەو ڕۆژەشـەوە بـاوکی هێـرۆ بەشـاراوی مایـەوە لـەلای برادەرە فەیلیە دڵسۆزەکانی بەغدا تاوەکو دەربازکرا بۆ سلێمانی لـەوێش هــەر بەشــاراوەیی مایــەوە و ئێمــە لەبەغــدا ماینــەوە هــاوڕێ و دۆســت و ئاشنای هەر دولا چ هـی عەبدولکـەریم قاسـم و چ هـی کـورد کەوتنـە بـەین و کەوتنە چالاکی بۆئەوەی بەشکەم بـەینی کـوردو زەعـیم قاسـم چاك کەنـەوە بەڵام فایدەی نەبوو. تا ئەهات حکومەت نیازی خراپتر ئەبوو ، تـاوەکو لـەو بەینە پارتی بە دو دڵـی و شـپرزەی وەزعـەوە ئاهـەنگی نـەورۆزی بـەرپاکرد لــە( قاعــە الخلــد ) لەبەغــداو زەعــیم عەبدولکــەریم و دەســت و دائـیرەی حکومەتیشـیان هــەموو دەعـوەت کردبـوو وایـان دانـابو کـە ئەگـەر زەعـیم عەبدولکەریم هات ئەوە نیشانەی ئەوە ئەبێت کە نیازی چاك بونەوە ئـەبێت



لەگەڵ کورد. بیرم دێ کە خۆشم لەوێ بووم قاعەکە پڕبو لەخـەڵك شـەو بـوو هەموو ئەم خەڵکە زۆر چاوەڕێی هاتنی زەعیمیان ئەکرد بەڵام زەعیم نەهات و مهداوی و ئەوانی تر هاتن بیانوێکیان بۆ زەعیم دۆزیـەوە. لای کـورد پتر ڕوون و ئاشـکرابو کـە نیـازی حکومـەت خراپـە بەرامبـەریان ، مـام جـەلال وتـارێکی هـەبوو ئـەبو بیخوێنێتـەوە هـەموو زۆر ترسـان کـە نـەوەکو هـەر لەسـەر شـانۆکە بـێن بیگـرن چـونکە زانیـان کـە ئـەمن و ئیسـتخباراتی زۆر لەدەوروبەری شوێنەکە ئامادەیە ، مام جەلال گوێی نەدایێ و نەترساو چوە سەر شانۆکە وتارەکـەی خوێنـدەوە و تـەواوی کـرد ئیتر نـەما دیـار و خـۆی وون کرد و لەبەرچاو نەما ، ئیتر وردە وردە حکومەت کەوتە شەڕ فرۆشتنی بـە کـورد. لەبەغـدا ڕۆژنامـەی خـەباتیان داخسـت چـاپخانەکەیان دەسـت بەسەرا گرت هەروەها دەستیان بەسـەر بارەگاشـەوە گـرت و کەوتنـە گرتنـی ئـەم و ئـەو و هاتنـە سـەر مـاڵی ئێمـە جـاری وا هـەبوو دوجـارو سـێ جـار هەروەها کاك نوری شاوەیسیش کـە دیوارێکمـان لەبـەین بـو بەڕێکـەوتێکی خـۆش لەدەسـتیان ڕزگـاری بـوو دراوسـێیەکی زابتیـان لەتـەنیش بـو نـاوی وەهبی بابان بوو ، وەهبی باوێ تو لنی کك نوری رزگارکات کاتی وابزا
هــاتبون ماڵەکــەیان بپشــکنن. جــاری وا هــەبو ســەعات ســێ و چــواری بەرەبـەیان ئەیانـدا بەسـەرماڵمانا دیسـان دایکـم بـەرۆکی ئـەگرتن و پێـی ئـەگوتن خۆڕامـان نەئـەکرد ئەمـەتا لەبـەر دەسـتانین بۆچـی لـەم کاتـە دێـن مناڵەکانتان هەموو تۆقاند ئەمەکەی ویجدانە ، جارێکیان کە هاتن دایکم وا چوو بەگژیانا کابرایەکی سەر سپیان لەگەڵ بو بەڕوێکی خۆشـەوە بـەخۆم و دایکمی گوت : کەوا ئیمڕۆ چل و سێ محـامی ئیبراهیم ئەحمـەدیان گرتـوە کەچی هیچیان ئەو ئیبراهیم ئەحمەدە نەبون بۆیە من پێم گـوتن بابـە بـا من بچم من ئەیناسم ئینجا پـێ کـەنی و گـوتی چـونکە مـن ئـەمن و لێپرسـراوی کاتی پێشوبوم هی ( ملکی ) بۆیە وا من هاتووم و پێم گوتـون کـەس بەقـەد

من برایم ئەحمەد ناناسێ ( لأنه زبوني القديم )چونکە لەمەعمیلەکۆنەکانمە هی زەمانی ( مليك ) هەروەها ئەوشەوە هەنێ نانی تیری لەسەر مێزی نان خواردنەکەمان مابوو لەهۆڵەکەکاتی نان خواردن دیارە لەبیری ئەوکەسانە چوبو کە سفرەیان هەڵەگرت و دائەنا بۆیە چووە لای مێزەکە و نانە تیریەکەی گرت بەدەستەوە قەپاڵێکی لێ گرت و گوتی بەخوا نانی تیری کوردی خۆشە. دایکم گوتی ئەتەوێت دو سێ نانت بدەینێ گوتی خۆزگە بەڵام ناوێرم ئەم ( زعاطيط ) تازانە خەبەرم لێ ئەدەن ( زعاطيط )یعنی منالەوردکە.

ئێمەش وەکو دیل و حەپسمان لێ هاتبوو لەبەغدا دائم دوسێ ئوتومبێلی عەسکەر و ئەمن لەبەر دەرگاکەمان بوون و سەری کۆلانەکەشیان گرتبوو کەماڵی کاك نوری شاوەیس و دایکی ڕۆژی لێبوو.

ڕۆژێك بە دڵتەنگی من و دو سێ کەسی ماڵەکەمان و یەك دو منداڵ لەباخەکە بووین ئەحمەد هەورامی کوڕی ماڵمان حەمامی بۆ دائەخستین بە دارو گەڵای باخەکەمان کە سەیرم کرد دایکی ڕۆژ بەهەڵەداوان هات بۆلامان پریاسکەیەکی بەدەستەوە بوو هەندێ توڕو شیرزە دیاربوو سەیرێکی کردم و گوتی : ها دایکم ها بیگرە من هەقم نیە بەسەرەوە پریاسکەکەی دایە دەستم منیش بەسەر سوڕمانێکەوە گوتم ئەوە چیە ناهی خان ؟ بگرە دایکم بگرە ئەمە مۆرەکانی پارتیە و من بەهیچ جۆرێك هەقم نیە بەسەرەوە منیش گوتم ئەی من چی لێبکەم گوتی هەقم نیە فڕێی دەرە ناو ئەم تونی حەمامەوە با بسوتێن چەند جنێوێکیشی دا منیش پێم گوت : تۆ ئەندامی و تۆ لجنەی مەرکەزی و شتی وای تۆ ئەبێ بزانی چی لەم شتانە ئەکەیت دیسان گوتی فڕێی دەرە ناو ئاگرەکەوە. ئەمن گوتم وا فڕێی نادەمە ناو ئاگرەوە و چومە ژوورێ و دامە دەست دایکە بێ وێنە شیرینەکەمەوە سەبەتەکەم تێ گەیاند و هەر زو لێم وەرگرتم و بوی قیلمی کرد و دانا چی لێ کرد تاوەکو ئەو ڕۆژەی دایە دەست باوکی هێرۆ.

حکومەت کەوتە وردە وردە لێدانی شارەکانی کوردستانیش ناوبڕی کەری کورد و عەرەبیش هەر خەریکی ناوبڕی کردن بوون ، هەموو ڕۆژێکیش قاوێك بڵاوئەبوەوە. ڕۆژێك ئەیانگوت زەعیم عەبدولکەریم پەشیمان بوەتەوە و گوتویەتی چۆن من وا لەکورد ئەکەم کورد پشتی من بوون و خۆشەویستی منن ئەویکە ئەیگوت ئاخر دایکی کوردە چوە بەگژیا و لێی توڕەبوە ئیتر هەر قسەبو بڵائەبوەوە.

ئاخری بوبە ڕۆژی کردنەوەی تونێلی دەربەندیخان هەموو گوتیان ئیمڕۆ لەکاتی کردنەوەدا زەعیم عەبدولکەریم باسی کورد ئەکات و پەشیمانی خۆی دەرئەبڕێت هەموو کورد چاو و گوێچکەی کرانەوە و زەق بوون و چاوەڕێی خوتبەی زەعیم بوون و بەدیار تەلەفزیۆن و ڕادیۆوە دانیشتن زەعیم عەبدولکەریم تونێلی کردەوە و کەتە خوتبەدان و بەپێچەوانەوە بەمەعناوە تێروپڕ قسەی بەکورد گوت و ئەتگوت کە ئەو تونێلەی ئەکردەوە لەسەر ئەرزی باوکی دروست کرابو نەك لەسەر ئەرزو خاکی کورد دوای کردنەوەی ئەو تونێلەئیتر بەهیچ جۆرێك هیواو ئومێدی ئەوە نەماکە قاسم شتێکی باشی لەدڵدایە بەرامبەر بە کورد بەرەبەرە خۆمان کۆکردەوە و بەهەزار فرت و فێڵ و ئەمبەرو ئەوبەر توانیمان خۆمان دەربازکەین خۆمان و ماڵ و منداڵ و ئەو خێزانە زۆرەمان بۆ سلێمانی پێش ئەوەی بەماڵەوە بگەڕێینەوە سلێمانی خۆم لەگەڵ دو منداڵم گەیشتینە سلێمانی بۆ ماڵی مامە ڕەمزی فتاح چونکە هەرچەند ئەهاتین بۆ سلێمانی لەماڵی ئەوان دائەبەزین.

ۆرتی بۆیە هاتم کە هەوالێکی باوکی هیۆۆ بزا زستان و باران بوو ئێوارەیەك کاك نوری ئەحمەد تەها هاتە لامان و بەئەسپایی چرپاندی بە

گوێ مامە ڕەمزیدا و گوتی هاتوم گەلاوێژ و منداڵەکان بەرم بۆلای کاکە برایم. کە دونیا بەتەواوی تاریك بو کاك نوری بردینی بەڵام نەی گوت لەکوێیە ئاخری سەیر ئەکەم ماڵەکەی ماڵی برای دڵسۆز و مەرد کاك حامید قەرەو منیرە خانی قەفتانە منیرە خان کوژراوی ناوی کوردو کوردستان بوو ، زۆر ئاشناو تێکەڵ و دڵسۆزمان بوون باوکی هێرۆ بۆماوەیەکی باش لەماڵی ئەوان شاراوە بوو چەند مانگ بو نەمان دیبوو ، دو ڕۆژێك لەلای ماینەوە هەواڵ و دەنگ باسیم زانی و دڵنیای کردم کە حاڵیان باشە و وەزعیان زۆرچاکە و ئێستە گوێت لەدەنگ و باسی خۆش ئەبێت. ئیتر من گەڕامەوە بەغدا و ئەویش لەگەڵ برادەرانی خۆیان گەیاندە شاخە سەر بەرزەکانی کوردستانی ڕەنگین و لەوێ خەریکی دامەزراندنی هێزی پێشمەرگە بوون و ئەو ناوی ئەو هێزە چەکدارەی نا پێشمەرگە. دوایی بەماڵەوە گەیشتینە سلێمانی لەخانوێك دامەزراین لەپیرمە سور چونکە خانوی خۆمان کە زاموای ئێستەیە مامە ڕەمزی بۆی تەعمیر ئەکردین هەندێ پەڕپوت بوبو.

دوایی هەر زو گواستمانەوە ئەوێ ، یەکەم جار کە شۆڕش دەستی پێ کرد عشایر دەستی پێ کرد لەلێدانی حکومەت و لەدەربەندی بازیان ڕێیان بە قافڵەی حکومەت گرت کە هێزی زۆری ڕەوانەی سلێمانی ئەکرد هەروەها پێش ئەوە لەبارزان و بادینان حکومەت دەستی کردبو بە بۆردومانیان و لەوێوە شەڕ دەستی پێ کردو گەرم بوو باڵی عشایری و باڵی خوێندەوار و پێشکەوتن خواز کە پێیان ئەگوت باڵی مەکتەبی سیاسی ئەگەرچی ئەو دوباڵەزۆر ڕێك و تەباو یەك دڵ و یەك دەست بوون بەڵام باڵی مەکتەبی سیاسی حەزیان نەئەکرد کەوا زو دەست بدەنە چەك و شەڕبەرپابێت چونکە زۆر بێ پشت و بێ کەس بوون زۆر بێ دەرامەت و بێ تفاق بوون بەڵام کە شەڕدەستی پێ کرد لەترسی ئەوەی نەبێ بەدوبەشەوە



بۆیە ئەو باڵەبەپەلەخۆیان گەیاندە شاخ کە باوکی هێرۆ سکرتێری حیزب بوو یەکێ لەسەرکردەکانی ئەو باڵەبوو.

پێشمەرگەی قارەمان بەو چەند تفەنگە شڕەی کە هی خەڵکەکە خۆی بوو لەپەنا و ئەوپاسارانەی دێیەکان پەیایان کردبوو زیڕەیان خستە دڵی حکومەت و هێزەکانیەوە. حکومەت کەوتە خۆی و هێزی نارد بۆ سلێمانی و شوێنەکانی تری کوردستانی ڕەنگین بەهیچ جۆرێك دەبابەکانی حکومەت نەیان ئەتوانی سەر ئەزمەڕکەون جارێکیان هەر بەچاوی خۆمم دیت کە دیسان چوبومە ماڵی منیرە خان و کاکە حامید گوتیان شەڕە وا دەبابە هجوم ئەکاتە ئەزمڕ ، ئەو کاتە کاك علی عەسکەری نەمر لەگەڵ هێزەکەی لەئەزمڕ بوو بەو چەند تفەنگە شڕەی کە هەیان بو بەچاوی خۆمم ئەبینی کە هەموومان بەبێ ترس چوینە سەربان لەگەڵ منیرە خان و چەند کەسێکی تر ئەو دەبابانە گوڕیان ئەدایە خۆیان و تۆزێك سەرئەکەوتن و هەر گورج دوابەدواوە ئەگەڕانەوە یەك لەدوای یەك ڕائەوەستان و گوڕیان ئەدایەوە خۆیان ئێستەش نەیان توانی سەرکەون لەبەر ئەو قارەمانانەی لەوێ و بەپەنا ئەو شاخ و بەردانەوە بەرەنگاریان ئەبوون.چەندەهاجار ئەو پێشمەرگەو ئەو سەرکردە قارەمانانەیان بە برسی شەڕیان ئەکرد کاتێ نانیان لێ ئەبڕا هەندێ جار کە جاشی حکومەت لەشوێنێك نەئەمان قەراغە کولێرەی وشك بووی ئەو جاشانەیان کۆئەکردەوە جارێك علی عەسکەری نەمر ئەو قەراغە کولێرانەی کوڵاندبوو لەناو کتلی تا توانیبویان بیخۆن.

نیسکێنە شایی و حەفلەو زەماوەند بوو ئەگەر هەبوایە بیخۆن مووچەی هەموویان یەك کولێرەو یەك پیالەچا بوو ، کولێرە چ کولێرە هەر زیخ و ەرد بو ئەکەوتە بەر د لنی ئیشد لن لە بەر ئەوەی بەپە لەگە ئەهاڕرا و پێیان ە ئەکر اگە ببژێرن یا بشۆنذ.

كاك حبيب محمد كەريميش ڕای كردبوو گەیشتبوە ناو شۆڕش كاك حبيب زۆر قسەی خۆش و گاڵتەچی بو لەبەرئەوە خۆی لەئیستگەی بەغدا كاری ئەكرد هەروەها لەمصرف الرهونيش مأمور بو لەبەغدا بۆیە ناوی ئە كولێرە و پیالەچایەی نابو ( الرفوف العاليە )الرفوف العاليە بەرنامەیەكی مۆسیقای كۆن بوو لەئێستگەی بەغداوە لێئەدرا كاتی خۆی.

ئەوسا وەكو ئەم زەمانە نەبوو كە سەركردەی لەشكر بە مارسیدس سەری سەنگەرو هێزەكانی بدات و قەل و مریشكی بۆ ببرژێنن ئا بەو حالەشۆڕش پێ گەیشت تاوەكو لادێیی داماو وبێچارەكانیش قەدەغە و ( حصار ) خرابوە سەریان لەسەر ئەوڕێگاوبانە ئەگەر بەیانیان بە هەزار حاڵ خۆیان و بارە دار و یا میوە و ماست بهاتنایەتە ناو شار كەبارە كەل و پەلیان بفرۆشن بۆ ماڵ و منالیان و پێویستیان پێ ئەكڕی و پاشان ئەو كەسانە ئەگەڕانەوە دێهاتەكانیان لەسەر ڕێگاوبان عەسكەر لێیان دەرەپەڕی لەسەیتەرەكان شتەكانیان ئەپشكنی كە چیان پێیە دەستیان ئەدایە ئەو دوسێ كیلۆ شەكرو ئەوتۆزە چایەی كڕیبویان ئەیان ڕشتە سەر ئەرزو بزانە چی كەیان پێ بوو ئەویشیان ئەڕشت و بەپۆستاڵەوە ئەچونە سەری و ئەیانگوت ئەوە شەكرو چا بۆ پێشمەرگە ئەبەن ؟ لەبەرئەوە دێهاتیش زۆر لێقەوماو بوون بەو حاڵەش لەدەمی خۆیان دەرئەهێنا ئەیانخستە بەردەمی ئەو میوان و ڕێبوارو مالەخەباتكەرو ئەوكەسانەی بەڕێوە ئەبوون و بەسەر دێهاتەكانیانا تێ ئەپەڕین و زۆرجار ئەبوون بە میوانیان. وردە وردە هێزی پێشمەرگەی قارەمان پتەو بەهێز ئەبوون و چەك و تفەنگیان دەست ئەكەوت ئەویش هی عەسكەرە پەلاماردەرەكان بو لەو پەنای گرد و شاخ و پێچی ئەزمڕ هەیبەت سوڵتان و شوێنانی تری كوردستانی شیرین و ڕەنگین هەر دەبابە و ئوتومبێلی سوتاو و شكابو. عەسكەر لەئێوارەوە ئەچونە ناو سەنگەرەكانیان و خۆیان ئەشاردەوە شەو



پێشمەرگەی ناوشار و هەروەها خەڵكی شاریش ئەكەوتنە چالاكی و كەل و پەل پەیداكردن و ناردنی بۆ هێزی پێشمەرگە و خەباتكەرانی شاخ هەندێ جار ئەگیران زۆرجاریش بەسەلامەتی تێ ئەپەڕین و دەرباز ئەبوون وردە وردە فێری ڕێگاوبانی باشتریش بوون بۆ پەڕینەوە حكومەت ئیتر بەجارێك شێت بوو كەوتە لێدانی خەڵكی ناوشار و كەس و كاری پێشمەرگەو كوتانە سەر ماڵان و ماڵ پشكنین و ئەزیەت دان و كەوتە ناردنی دڕندەترین و خراپترین كارمەند و لێپرسراو بۆ ناو شارەكانی كوردستان. پێشمەرگە وایان لێهات كەوتنە گرتنی مەخفەرو دائیرە و جێ دەسەڵاتی حكومەت لەدێهات و ناحیەو قەزاكان لەو دەست بە دەست گرتنانە دەست گرتن بەسەر قەزای زاخۆدابو كەپارتی بۆ چەند ڕۆژو ماوەیەك زاخۆیان داگیر كرد و لێپرسراو مأمور و قائیمقامی حكومەتیان بە دیل گرت بەڵام لەدواییا لەموسڵەوە هێزی حكومەتیان بۆ هات هەرچەندە تاوەكو گەیشتنە زاخۆ لەڕێگا بە تایبەتی لەگەڵ زاخۆ حەشریان پێ كرا و زیانێكی زۆر بەسەرو پۆتەلاكی شكاو وشێواوی زاخۆیان گرتەوە.

ماڵی ئێمە هێشتا لەسلێمانی بووین كە ڕۆژێك بوبە هەرا و گوتیان بوبە كودەتا ( انقلاب ) لەبەغدا عەبدولكەریم قاسم و دەست و دائیرە سەرنوگوم كران و عەبدولكەریم كوژرا شار ووروژا خەڵك بەیەكا هاتن لەخۆشیانا بەڵام عەبدولكەریم قاسم ئەوەندە خۆشەویست بو لای هەموو كەس ماوەیەكی زۆر زۆری ئەویست تاوەكو بەتەواوی ببوایە بە دوژمن من بەش بەحاڵی خۆم بۆی گریام لەگەڵ ئەوەشا كە لەژێر بۆردومان و ماڵ پشكنین و ناوەحەتی و ئازاری ئەودا بووین. ن زۆر بەحەم م بەهیچ جۆریك ذلتوا هەر لەتەلەفزیۆنیشا چەند كەسێك ببینم كە كەسێك ئازار بدەن یا لێیبدەن اوەرناكەم كەس یك ئەگەر باوكیش می كوش تبی بیدەنە دەس تم من بتوا تبیگی لی بكەم بەدەست خ ۆم نیەو ذلتوا شۆیە بۆ عەبدولكەریم قاس م .

گریام کە ڕەسمەکەیم دیت بەکوژراوی و خەریکی لێدانی بوون. ڕۆژی کودەتاکەو بەیان دەرکردن و زانینی کە ئەمانە کێن کە هاتنە سەر حوکم و ئاشکرا بوو کە عبدالسلام عارف و تاقمیٚ بوون منیش هەر ڕادیۆکەم بەدەستەوە بوو گوێم لیٚ ئەگرت و میلی ڕادیۆ کەم ئەگێڕا بەملاو ئەولادا و هەمو شپرزە و لەمەراقدا بوین و هەزار خەیاڵ و بیری چاك و خراپ مێشکی شێواندبوین. ڕادیۆ کەم ئەگێڕا کەوتەسەر ئێستگەی پاریسی عەرەبی وەکو BBCی عەرەبی گوێم لیٚ گرت باس هەر باسی بەغدا و کودەتا و انقلاب بوو دوایی یەکیٚ لەوچەند کەسەی قسەیان لەکودەتاکە ئەکرد کە ناویشی برد بە محلل سیاسی بەڵام ناویم لەبیر نەماوە دوا قسەی ئەوەبو ئەو قسەیە قەت لەبیرم ناچێتەوە گوتی : ( لو ان الزعیم عەبدولکەریم قاسم کان قد عالج مسألەالٲکراد بتعقل لما کان الآن فی عداد الٲموات ) یعنی ئەگەر عەبدولکەریم قاسم مەسەلەی کوردی بەئاقڵی گویٚ بدایەتیٚ و جیٚ بەجیٚ بکردایە ئێستە لەناو مردووەکان نەئەبوو ، ئەم قسەیە زۆر ڕاست بوو چونکە کورد زۆر پشتیوانی بوون و ئەو ڕۆژەی دەستی لەکورد هەڵگرت و کەوتە لێدانیان ناحەزەکانی بەفرسەتیان زانی و کە ئەو سەری بە لێدانی کورد قاڵ بوو ئەوان توانیان کودەتای لێبکەن و لەناوی بەرن. عەبدولکەریم قاسم وەکو هەنگی لێهات کەبەخەڵکەوە ئەدات خۆشی ئەمرێت.

چەند ڕۆژێکی پێچو گوتیان کودەتاکەرەکان خۆیان دامەزراند قاو بڵاوبووەوە وا خەریکن لەگەڵ کوردەکان ( مفاوەزە )و گفتوگۆ ئەکەن گوتویانە کورد چی ئەوێت بابێن وەری گرن بەسەرچاو دیسان شارشڵەژا و خۆشی و هەڵپەڕین دەستی پیٚ کرد ، پێشمەرگە یەکەم جار بو بەجلی پێشمەرگەوە و بەچەکەوە بێنە ناو شار پێشمەرگە وەك ملائیکەت و مقدسی ئەهاتنە بەرچاوی خەڵك خۆ سەرکردەکانیان ئەوە هەر باسی



ناکرێت مام جەلال هاتەوە شار و لەسەر بیناکەی نوری عەلی لەبەر دەرکی سەرا قسەی کرد و خوتبەی دا بیناکە ئەوەندەی نەمابو بڕوخێت لەبەر قەڵەباڵغی. مام جەلال بەباوەش و سەرپشتی جەماوەر هەڵگیرا و باوەشی پیاکرا لەخۆشیانا.

باوکی هێرۆش لەگەڵ برادەرانی تری گەیشتنە لامان هەروەها هەموو شارەکە بوبو بەشایی و هەڵپەرکیٚ ، دیسان وەفد هات و وەفد چوو بۆ بەغدا باوکی هێرۆ و برادەرانی چوون بۆ لای مەلا مصطفی ی خوالێخۆشبو چوون باسی ئەم مفاوەزاتە بکەن و قسەیان بکەن بەیەك و ابزا[illegible] مەلا مصطفی ی ڕەحمەتیش هاتبو بۆ کۆیە و لەماڵی زیاد ئاغای ڕەحمەتی میوان بوو لەو برادەرانەی لەگەڵ باوکی هێرۆ چوون لەسلێمانیەوە کاك عەلی عەبدوڵلاٚ ش بوو ، ئەو ڕۆژەی باوکی هێرۆ گەیشتە لامان جانتایەکی پیٚ بو دایە دەستم و گوتی ئەمە لەشوێنێکی باش بشارەوە منیش پیٚ کەنیم و گوتم چی تیایە وائەڵێیت بیشارەوە خۆ ئێستە مفاوەزاتە ناترسێن حکومەت بێت ماڵەکەمان بپشکنێت و کاغەزی قەدەغە ببینێت گوتی ئەمە پارەیە بۆ خوالێخۆشبوو مەلا مصطفی ی ئەبەین ، باوکی هێرۆ مەلا قادر بو لەناو شۆڕشدا ناوی حیزبی نهێنیشی ( تیشك ) بوو.

باوکی هێرۆ و برادەرانی چوون و خەڵکیش هەر خەریکی هەڵپەڕین بوون جاری وا هەبو عەسکەری حکومەت بە دەبابەوە بەسەر شەقامەکانا ئەگەڕان بەتایبەتی کە شار زۆر شڵۆغ و قەڵەباڵغ و هەرا بوو بۆیە هەندیٚ جار عەسکەرەکانیش ئەکەوتنە ناو خەڵك و ئەوانیش هەڵەپەڕین و هەندیٚ کەسیش سەر دەبابەکان ئەکەوتن بەچەپڵەو هەڵپەرکێوە ئێستەش لەبەرچاومە کچێکی ئاشنای ماڵی مامە ڕەمزی هەبوو ناوی سەبیح بو خوشکەکەشی ناجی بوو سەبیح خۆی کرد بەماڵەکەماندا بەخۆشی و بە

ئارەق ڕشتنی خۆشیەوە و گوتی ئێستە چوبوینە سەر دەبابەکە و پیامانا ئەکێشا و ئەمانگوت : هی خۆمانە هی خۆمانە عەسکەرەکانیش چەپڵەیان لێ ئەدا و هەڵەپەڕین وەزع و حاڵ و وەفد هاتن و ڕۆشتن تا بەینێکی باش وامایەوە پێشمەرگە هەموو ڕژانە ناوشارەکان بۆ لای کەس و کار و ماڵ و مناڵیان ناوداری نهێنی هەموو ئاشکرابوون و هاتنە بەرچاو حکومەتیش هەر ئیمڕۆ بەسبەینێ ی ئەکرد و هەر ئەیگوت باشە چی ئەڵێن قسەتانە دەی هەر باوەفد بێت و وەفد بڕوات لەژێریشەوە ئەکەوتنە خۆ قایم کردن و خۆ دامەزراندن و دەورو پشت توندو تۆڵ کردن. لەگەڵ ئەو کارانەیان ئینجا وردە وردە و لەسەر خۆ کەوتنە دەست نیشان کردنی خەباتکەران و پێشمەرگە و دەست وەشاندن لێیان جاری یەکەم دەستیان لەپێشمەرگەیەکی زۆر ئازا و قارەمان وەشاند لەناو بازاڕی کەرکوك. قاو بڵاوبوەوە کە ئەمەکێ بوو وای لەو پێشمەرگە ئازاو دلێرە کرد ئەو گوتی شەڕی شخصی بوە ئەو گوتی دوژمنایەتی و ناحەزی ناو خێزان بوە کەوای کردووە. لەدوای ئەوە هەر بۆ چەند ڕۆژێکی تر چەند کەسی کەشیان والێ کرد و بیانوشیان لەچەندانی تر گرت و گرتیانن هەروەها لەسلێمانی و شارانی تری کوردستانیش هەر عەینی پلانیان بەکارهێنا ، تا ئەهات لەو جۆرە دەست وەشاندن و کوشتنە زیاتر ئەوبو ئەویش هەمووی خەباتکەر و پێشمەرگەی هەڵبژاردە ، کورد بۆی ئاشکرا بوو کە ئەمە کارو پلانێکی داڕێژڕاوە لەلایەن حکومەتەوە و ئەیانەوێت بەبیانوی ( مفاوەزات ) و گفتوگۆوە تا پێیان ئەکرێت ئەو قارەمان و ڕۆلەنەبەزانە لەناوبەرن ، بۆیە کوردیش کەوتنە خۆیان ئەوانیش کەوتنە خۆ ئامادەکردن بەدزیەوە و کەوتنە هەندێ زەخیرە و کەل و پەل کڕین و ڕەوانە کردنی بۆ ناو شاخەکان هەروەها پێشمەرگە و خەڵکی لەبەرچاوو ناسراو هەموو وردە وردە خۆیان گەیاندە شاخ کوردیش قازانجی لەو ماوەی مفاوەزاتە



کرد. ئیتر وردە وردە ئەو گفتوگۆ و پلانە ساختەیە توایەوە و لەناوچو ، وەزع دیسان تێك چووەوە.

دیسان سەر لەخەڵك شێوا ترس و نا ئومێدی بەدەمو چاوی هەموو کەسێکەوە دیار بوو هەر ئەم و ئەو بو خۆیان ئەگەیاندە لای یەکترو لای کەس و کاری یەکتر و ئەکەوتنە پرس و پرسیار دیسان دایك و باوك چاو لەدوی مناڵەکانیان و کوڕو کچی هەرزەکاریان بو بەتایبەتی ئەوانەی لەمەکتەبی ناوەندی و سانەوی بوون و ئەوانەی لەوتەمەنە بوون کە مەترسی بیانو گرتنیان لێ ئەکران. دیسان هەموو کەس دەست لەسەر دڵ بوون کارمەندی کورد بچن بۆسەر ئیشەکانیان یا چی ؟ خۆیان وون کەن و کار بەجێ بهێڵن ئەوەندەی تر خەتابار ئەبن لەلای حکومەت نەچن و هەر لەسەر ئیشەکانیان بن ئەوەتە هەندێ ئەگرن و هەندێ ڕەوانەی خوارووی عێراق ئەکەن. کاسب و دوکاندار لەهەموو کەس شپرزەتر بوون ، دیارە خۆ هەموو کەس هەر خەباتکەر و قارەمان نەبو هی واش هەبو کە ئەیبۆڵاند لەژێر لێوەوە کە ئەوە چی بو دیسان دونیایان تێکدا و نایڵن کاسبی خۆیان بکەن هەرچەند ئەوجۆرە کەسانە زۆرکەم بوون لەچاو زۆربەی هەرە زۆری میلەت ، ئاخری شەڕ دەستی پێ کردەوە شەوێك لەپڕ لەبەرەبەیانا نزیك سەعات سێ و شتێکی بەیانی بو کوردەی کچم شەش مانگان بوو هەستا بووم شیری بدەمێ کە گوێم لەدەنگێك بوو ، سەیرێکی سەعاتەکەمم کرد لەدڵی خۆما گوتم تۆ بڵێی سەعاتەکەم تێك چوبێت چۆن بانگ سەعات سێ ئەدرێت وردە وردە دەنگەکە نزیك ئەبوەوە لەپڕ سڕبووم کە بەتەواوی گوێم لەدەنگەکە بوو دەنگەکە بەکوردێکی تێك شکاو دیاربو عەرەب بو فێری هەندێ کوردی بوبو ئەیگوت : ( مەنع التجول لەئێستەوە بۆ اشعارك ئاخر ). بە شپرزەیی و حەپەسان و دلەکوتیەوە کوردەم دا بەشانماو چومە سەر مناڵەکان کەلەژوورەکانی سەرێ بوون لەو خانوەی کە ئێستە زاموایە

هەروەها چومە خواریٚ ژێر خانەكانیش پڕبو لەكەسی ماڵەكەمان دادەی مناڵەكا ئاسیٚ ی ناوبو كە زۆر خۆشەویست بو لەلامان ، سەبریەی خوشكم لەو ڕۆژانە ئەویش ڕایكردبو لەگەڵ كوڕەكەی مناڵی ساڵ نەئەبو ناوی دژوار بو سەبریە ژنی جەلال ئەتروشی بوو جەلال ئەتروش برازای دكتۆر صدیقی زاوام بوو كوڕی قازی عبدالرحمن ئەتروشی بوو ئەویش خۆی گەیاندبوە شاخ لەگەڵ دكتۆر صدیقی زاوام سەبریەش هاتبو بۆ لامان یا ڕاستتر ڕایكردبو لەبەغداوە. هەروەها خولەشێتەكەمان لەگەڵ كوڕەكەمان كە بەخێومان كردبو ئەحمەد هەورامی و عەلی كوڕی ئاسیٚ كە تەلەبەی متوسگە بوو.

چوومە سەریان و خەبەرم كردنەوە ، هێرۆی كچم و هەڵۆی كوڕم تۆزیٚ باش بوون دەساڵ و دوانزە ساڵ بوون ئەوانی ترم هەموویان زۆر ووردو چ وك بوون ، هەمویا هەستاند و كەوتینە گەڕان بۆ كاغەزو كتێب و ئەوجۆرە شتانە لەهەمووشی خۆشتر ئەو ئێوارەیە كوڕێكی ناسیاوی ماڵی مامە ڕەمزی و ئێمە بو عەسكەر بوو ناوی عمر بوو ئەو ئێوارەیە خۆی كرد بەماڵمانا و كیسەیەكی پیٚ بوو بەئەسپایی دایە دەستم و گوتی ئەوە دو دەست جلی عەسكەریە هێناومە ڕەوانەی كە بۆ پێشمەرگە پێشمەرگە هەندیٚ جار جلی عەسكەریان لەبەر ئەكرد و ئەهاتنە ناوشار بۆ ئیش و كاریان منیش لێم وەرگرت و گوتم زۆر چاكە سبەینیٚ ڕەوانەی ئەكەم. عمر ڕۆیشت منیش كیسەكەم لەشوێنێك دانا ئیتر كە ئەو منع التجول و بەزمە ترسناكە بوو كەوتینە گەڕان بۆ كاغەزی قەدەغەو كتێب لەپڕ كیسە بۆرینم بیر كەوتەوە و گوتم : ئای قوڕ بەسەر باوكم بەخوا ئێستە بێن ببینن هەكە هەرهەموو مناڵەكا ئەكوژن ، بەڕێكەوت دایكم لەلامان نەبوو ئەو شەوە ئەویش توشی تەگەرەی خاڵە هەمزەم بوبو كە هاتبو و خۆی شاردبوەوە و لەماڵێكا لەعقاری خالەمحمدیشم برابو بۆ ئەویٚ تاوەكو



كەس شك نەخاتە سەر ماڵەكە ، دایكیشم كە گوێی لەجاڕەی منع التجول بوبو هەر ناڕەحەت بوبو و گوتبوی بەخوا ئێستە ئەچن گەلاوێژو مناڵەكان لەت و پەت ئەكەن سەرەڕای دەردان خاڵە هەمزەی قاچاغیش لەژوورەوە بوو.

دەی گوتم وەرن ئاسیٚ سەبری خولەشێت ئێمە ئێستە چی لەم كیسە جلی عەسكەریە بكەین ؟ خولەبەزمانە لاڵەپەتەكەیەوە گوتی : بێنە ئێستە سەر توەكە ئەكەوم و لەویٚ قایمی ئەكەم هەموومان گوتمان ئەی بەشكەم یەكیٚ سەری بەرزكردەوە و سەیری توەكەی كرد خۆ كوێر نین ، ئاخری ئاسیٚ گوتی بێنە ئەیكەم بە دۆشەكەڵەیەك و لەناو نوێنەكانا دایئەنێم ئاخری بەپەلەچوو دەرزی و دەزو و قوماشی هێنا و خەریك بوو دەنگیش تا ئەهات نزیك ترو بەرزتر ئەبوو زیقە زیقی چەرخی دەبابە و دەنگی ئوتومبیلیش ئەهات جاڕچیەكە بەسەر ئوتومبێلەوە بوو باشە وا دەستە جل عیلاج كرا ئەی چی لەو دوو كلێتە كڵاوە بكەین. گوتم خولەگیان بڕۆ خێرا حەمامەكە داخە و دو كڵاوەكەی تیٚ فڕێدە با بسوتێن خولەگوتی بلە ه وچو لەدولی بەینیٚك چووم بزا چی كرد سەیر ئەكەم لەسەر بارە دارەكەی پەنا حەمامەكەی داناوە و خۆشی لەبەردەمی دانیشتوە خەریكە خەوی لیٚ ئەكەوێت قیڕاندم بەسەریاو گوتم هەی ئاگرت تیٚ بەربیٚ ئەمە چیە ؟ خولەدەم و لوتی هەڵگلۆفت كە خەواڵو بوو لەكاتی ئەم جاڕە ترسناكە گوتی : حەمامی چی ئێستە ناڵێن لەم سەعاتە ئەم دوكەلەچیە لەم مالەبەرز ئەبێتەوە دوایش دەستی دایە دو كڵاوەكەو گوتی : بەخوا حەیفە بیسوتێنین بالەشوێنێك قایمیان كەین هەندیٚ جار ئینسان لەوكاتانە كە توشی ئەجۆرە ڕوداوانە ئەبیٚ وا ئەزانیٚ تەواو سەری دونیای لیٚ دێتەوە یەك شتێكی بچوكی لیٚ ئەبێتە بەلاو تەگەرەی گەورە كەچی لێبكات چۆن

چـۆنی بیشـارێتەو وا ئـەزانێت ئەوانـەی دێنـە سـەریان وەکـو سـاحر و جادوکەر هەموو شتێك ئەدۆزنەوە کەچی وانیە.

ئینسان ئەتوانێت شتی وا لەشوێنێکی وا سادەو ئاسان دانێت لەوانەیە ئەو عەسکەرانە بەسەریا تێ پـەڕن بـەڵام شپرزەیی و نائـارامی هەنـدێ جار بیرکـرن ئەشـێوێنێت بۆیـە قسـەی خولەشـێت بـەجێ بـوو دوکـەڵ و حـەمام ئەوکاتـە و زۆر سـەرنج ڕاکێشـەر بـو لەبەرئـەوە دو کڵاومـان خسـتە کیسەیێکەوە و لەپەنا بەردێکا دامانا لەحەوشەکە کە دار زەیتون و گـەڵامێو وهەندێ ئینجانەی لێ بوو.

ئەوەندەی پێ نەچوو قڕەو زریکەی خەڵك لەدورەوە و لەدەرو دراوسێ و نزیکەوە بەرزبوەوە و دەنگی شەق وەشاندن و دەرگا و پەنجەرە شکاندن و هاڕەی شوشەو تەپەو گرمەی شەق وەشاندن و هـاوار هـاواری ژن و قیڕە و زریکە کە ئەهاتن پیاو و کوڕەکانیان ئەبردن.

ئاخری ئەو شەوە هەر لەتەمـەنی شانزە ساڵەوە تاوەکو تەمـەنی نـەوەد سـاڵ نێرینـە نەماڵـەناو شـار ئینجـا ئـەوە نـەك لەسـلێمانی بگـرە لەهـەموو شـارەکانی کوردسـتان وابـو دوای بـەینێك لـەدو سـێ مزگـەوت بـەکزی و کەساسـی دەنگی بـانگ بـەرزبوەوە لەگـەڵ ئەوەشا ئـەو شـەوە مزگـەوتیش ڕزگـاری نەئـەبو لەدەسـتیان ، ئێمـەش دەسـتمان لەسـەر دڵمـان و گوێمـان لەدەنگی دەرگا بو هاکە هاتنـە سـەرمان. دەی ماوەیـەکی بەسـەر چو گرەی ئوتومبیل و زیقـە و گـرم و هـوڕی دەبابـەی سـەر شـەقامەکان هەنـدێ کـەم بونەوە. سەرمان سوڕمابوو بەشپرزەییەوە سەیری یەکترمان ئەکرد کە ئەمە چ ـیە بـۆا کـەس نـەهات بـەلای ئێمـەوە ، وردە وردە دەنگـەکان دورئەکەوتنەوە لەدەوروبەرمان دونیا خەریك ئەبو ڕوناك ئەبوەوە.

بۆ بەیانی شەقام و ڕێگاوبان چۆڵ بون لەبەر ( منع التجول ) قەدەغـەی هاتوچـۆ بۆیـە کـەس نەیـەزانی ئەویکـە و دراوسـێ و خـزم و ئاشـنا و



ناسیاوی چیان بەسەر هاتوە. ئەو شەوە چەندەها ژن کەوتبونە ژانـی سـەر منـاڵ بـوون و منـاڵیـان بوبـو بـەبێ دکتـۆر و مامـان چـەندەها کـەس توشـی سەکتە و جەڵتەی دڵ بوبون بەبێ دکتۆر و خەستەخانە ئـەو شـەوە لەشـەوە لەبیر نەچوەکان بوو.

ماڵی ئێمەش وەکو خۆمان ماینەوە کەس نەهاتە سەرمان خـزم و ئاشـنا و کەسیشمان هـەر خـەمی ئێمـەیان بوبـو لای سـەعات سـێ ی پـاش نیـوەڕۆ هەر عەینی کەس و بەهەمان دەنگ بڵاوی کردەوە کە منع التجول لائەچێت تەینا بۆ یەك سەعات واتە لەسەعات سێ وە تـاوەکو چـوار ، سـەعات چـوار هات شەقام و جادە وەك لافاوی ڕەشی لێهات لەبـەر عەبابەسـەر کـە دایك و کەسی گیراوەکانی شەوێ بوون. منیش لەگەڵ یەك دو کەسی مـاڵی خـۆمـان ڵم ـە دەڕی ۆ گـوتم بۆا چـی قـەوماوە دڵـم زۆر لای مامـە ڕەمـزی بـووە ماڵەکەمان خانوی زامـوای ئێستە بو بۆیە هـەر کۆڵانەکـەمان بڕی و پێچمان کردەوە بەرەو سەر شەقام گەیشتین کە سەیر ئەکەم وا کۆمەڵێك بەرەو ماڵی ئێمـە دێن. هەنـدێ خـزم و کـەس برادەرمـان بـوون ئیتر کەبەیـەك گەیشـتین هـەواڵی یـەکترمان پرسـی و پەرۆشـی خـۆمـان دەربـڕی بۆیـەکتری لـەناویانا کاك حەمە صالحی خزمی باوکی هێرۆ بوو وەکو شتێك ئەو نەگیرا بو و تاك و تـەرا پیـاو ئـەبینران لـەناو لافـاوی ژنـان و عەبابەسـەردا کە پێم گـوتن کـە نـەهاتون بـۆ مـاڵی ئێمـە سـەریان سوڕما و زۆریـان پـێ خـۆش بـوو گـوتیـان ئێمـە لـەتاو ئێـوە و مـاڵی ئێـوە نـەمان ئـەزانی چـی بکـەین منـیش کەوتمـە ناویـان و چـوین بـۆ مـاڵی مامـە ڕەمزی دوای ئـەوەی لـەکاك حەمـە صـالحی خزممانـەوە زانیم کـە مامـە ڕەمـزی و سیروانی کـوڕی گیراون ، ئـەم خەڵکـە لافـاوە سـەریان لێشـێوابو نـەیان ئـەزانی بـە چ لایێکـا بـڕۆن ئەیانویسـت بەپەلـەبزانن کـە کـوڕ و بـرا و مێـرد و مـام و خاڵیـان کـە بـراون چـییان بەسەرهاتوە و براون بۆ کوێ عەسکەر بەسەر دەبابـەوە بوون ژنـەکان لێیـان

ئەپاڕانەوە کە کوڕو کەسیان لەکوێن هەندێك پێیان ئەگوتن لەحەپسخانەی سەرەوەن لای توی مەلیك لەپڕ ئەم لافاوە ڕوی ئەکرد بەرەو حەپسخانەی گەورە لەپڕ یەکێ ئەیقڕاند و ئەیگوت کچێ ئەڵێن براون بۆ حامیە لەپڕ ئەم وورووژمە ژنە ڕویان وەرەگێڕا و ڕویان ئەکرد بەرەو حامیە. لەگەرمەی ڕۆیشتندا بوون کە ژنێکی سەلاری بە عومر و تەمەن چوە سەر بەرزاییێکی بچوك نزیکیماڵی شێخ لەتیف حەفیدەوە و گوتی : گوێم لێ بگرن ئەوەتە بەو تۆزە هاتن و چوون و هەڵگەڕانە نیو سەعات لەماوەی ( منع التجول ) تەواو بو بەقسەی من ئەکەن هیچمان پێ ناکرێ باشتر ئەوەیە بگەڕێینەوە شوێنەکانمان و ماڵەکانمان چونکە بو بەسەعات چوار ئەمەتا عەسکەرەکان ئەڵێن ئەو کەسەی سەعات چوار لەسەر شەقام و بەر دەرگا ببینرێت دەست ڕێژی لێ ئەکرێت فریای هیچ ناکەون و ناتوانن کەس ببینن لەبەرئەوە بڵاوەی لێ بکەن ، ئاخری بڵاوەیان لێکرد بە دڵی گوشراو و چاوپڕفرمێسکەوە چەند ڕۆژێك وەزع وا مایەوە وردە وردە سەعاتەکان کەم ئەکرانەوە تاوەکو وای لێهات لەسەعات شەشی ئێوارەوە منع التجول بوو تاوەکو شەشی بەیانی ، ئەو چەند ڕۆژە ئاشکرابو کە چەند کەسیان شەهید کردووە چەند مامۆستای قوتابخانە چەند مامۆستای سانەوی و چەند کەسی خەباتکەریان هەر زیندە بەچاڵ کردبوو لەوانە کە ماڵی حەمەی فەرەجە ئەفەندی بو کە بەسویچی ئوتومبێلەکەی کەلەگیرفانیابو بەوە ناسیبویانەوە ئەگەر. دو سێ کتێب پڕکەمەوە لەباس و وەسفی ئەو شەوە هێشتا هەر کەمەو هەر تەواو نابێت بۆیە هەر ئەوەندە باسی ئەکەم.

( ڕۆمانی بەرەو ئەشکەوتی دلێران ) هەمووی لەم ڕوداوانەوە پێك هاتوە هەمووشی ڕوداوی ڕاستن بەڵام وەکو چیرۆك نوس و نوسەرێك بەخەیاڵ ڕازاندومنەتەوە و خەیاڵیشم تێکەڵ کردوون بەڵام ( پاڵەوانەکانی بەرەو ئەشکەوتی دلێران ) هەموویان خەڵکی خەیاڵین خۆم ڕێکم خستون.



خانوەکەمان لەناو بازاڕ بو زۆر قازانجی هەبوو ئەو شەوە کەس نەپەرژابوە ناو بازاڕ و ئەو دڕندانە هەر خەریکی ماڵان و خەڵك گرتن و کوشتن بوون و بۆ ڕۆژانی دوایی لەزۆر کەسیان پرسی بو ماڵی برایم ئەحمەد لەکوێیە ؟ پێیان ئەگوتن لەبەغدان ئەوەندە نەبو لەبەغدا هاتبوینەوە بەماڵەوە هەموو چەند مانگێك بوو لەبەرئەوە بەپەلەبرادەران ئاگاداریان کردین کە تازوە ئامادەبن تاوەکو دەربازتان کەین بەپەلەخۆمان کۆکردەوە هەروا سەر پرپاسکەیەك بۆ کوردەی کچم شەش مانگانە بو هەندێ شیری قوتو و ئەوشتانەمان بۆ پەیداکرد چونکە خێزانەکەمان زۆر بوون بەچەند جارێك گوێزراینەوە هەروەك بچین بۆ حەمامی ناوبازاڕ وا دەرباز بووین بۆ ئابلاخ هەموو لەوێ لەماڵی برادەرێکی حیزبی کۆمەڵ بوین شەو کە دێکە هەندێ مات بوون بردیانین بۆ شوێنێك نزیك ئابلاخ لەوێ وڵاخ و قەتارچی و پێشمەرگە چاوەڕێیان ئەکردین مانگە شەوێکی زۆر خۆش بوو ئەو برادەرەی هاتبو بەدوامانا ناوی نهێنی حەسەن ئاغا بوو ، پێش گەیشتنی ئێمە بە ئابلاخ بەدزیەوە هەندێ لێفەو پێویستی خەویان بردبو بۆمان ، بەبێ دەنگی هەموو شوێن یەك کەوتین لەسەر چەند جۆگەلەئاو و چڵکاو پەڕینەوە شوێنی حەسەن ئاغا کەوتین تا گەیشتینە لای ئەوانەی چاوەڕێیان ئەکردین لەو شوێنە هەرچەند هەموو هەر زەوی و چۆڵەوانی بوو بەڵام ئەو شوێنەی چاوەڕێیان ئەکردین لێی چاڵێکی بەرین بوو بەئەسپایی لەحەسەن ئاغام پرسی : حەسەن ئاغا هەموو دەوروپشتی شار ڕەبییەی حکومەتە ئەمە چۆن دەرباز ئەبین ؟

حەسەن ئاغا گوتی : خەمت نەبێ ڕێگای تایبەتی خۆمان هەیە.

وڵاخ ئامادەکرابو هەر وڵاخە یەك دو لێفەیان لەسەر پشتی بەست بۆئەوەی ئێمەشی لەسەر سواربین هەموو ئەوکارانەشیان بەچرپەو ورتە ورت ئەکرد زۆر دیمەنەکە ترسناك بوو منداڵی بەسەزمان نەیان ئەزانی چی

بڵێن و ئەمە چیە هەر چاویان زەق بوبو ، ئاخری دامەزراین و سوار بوین من کوردەم لەباوەشا بو ، ئاسیێ دو منالێ یەکێ لەباوەشی یەکێ لەپشتی سەبری خوشکم کوڕەکەی و منالانی تریشی سوار کردو قەتارچی سەری ولاخیان ڕاکێشا برادەرو پێشمەرگەش لەدەورو پشتمان من هێشتا دو سێ هەنگاو نەچوبوین لێفەکەی سەر ولاخەکەم کەلەسەری دانیشتبوم خزا و خەریك بووم بکەوم چونکە لێفەکە سەرەکەی سەتەنە لوسەکان بو بۆیە زو فریام کەوتن بۆیان چاك کردمەوە ئینجا کە کەسێك ڕائەوەستا هەموو ئەو قافڵەیەش ڕائەوەستا حەسەن ئاغا هەر لەناو چاڵەکە بووین گوتی : کوڕینە کەس جگەرە نەکێشێت و نابێ کەس قسە بکات هەمووگوتیان باشە هەرچەندە ئەوان فێربوون و هەموجارێك خەڵکیان دەربازئەکرد بەڵام هەر بۆ بیرخستنەوە ئەو قسانەیان کرد. بەینێکی باش ڕۆیشتین حەسەن ئاغا ڕاوەستاو ئیشارەتی بۆ قافڵەکە کرد هەموو ڕاوەستن حەسەن ئاغا هاتە نزیك و گوتی : دادە گیان ئەبێ ئێستە ئێمە لەم جادە قیرتاوانە دەربازبین ئەمە جادەکەی کەرکوك سلێمانیە ئەچێت بۆ چەمچەماڵ و کەرکوك ئێستە ئەبێ ئێمە لەم جادە بپەڕینەوە ئەوبەری ئینجا وەزعەکە زۆر خەتەرناکە یەك جولەیەك گریانی منالێ یەك کۆکە و پژمین یەکسەر لەناومان ئەبەن ئینجا وەرە من ئەبێ چیم بەسەر هاتبێ لەترسی ئەو منالەوردە بەسزمانە ، گوتم حەسەن ئاغا ئەی تۆ گوتت ڕێگای تایبەتی خۆتان هەیە ئەی ئەوە چی بوو. حەسەن ئاغا گوتی : دادەگیان ئەبو وابڵێم تاوەکو نەترسن و بێن و ئێستەش واتان پێ ئەڵێم تاوەکو ئاگادارابن و چار نیە و ئەبێ بپەڕینەوە. هەموو منالێ و گەورە وەك بتمان لێهات و قەتارچی سەری ولاخی پێشەوەی ڕاکێشا و گوتی خوایە لەسەر تۆ.

کاتێکی زۆر بەسام و ترسناك بو هەروەك ئەوەمان لێهات کە بڵێن تازە تەواو ئیتر خۆمان و بەختی خۆمان لەهەمووی ترسناك تر تەقەی سمی ولاخەکان بوو بەسەر ئەو شەقامە قیرتاوکراوەدا تێ ئەپەڕین ، لەویش ترسناك تر کە نەکا ئێستە ئوتومبێلی عەسکەری لەوکاتەدا بەوێدا تێ پەڕێت چونکە دەوریەو پاسەوانی سەربازی حکومەت هەمیشە و بەبێ وچان لەگەڕدا بوون.

لەشەقام پەڕینەوە و قەتارچیەکان سەری ولاخە بەسەزمانەکانیان وا ڕائەکێشا کە خەریك بو ولاخەکان هەناسەیان لێبڕێت بەپەلەپەل گەیشتنە گردێك دونیا زۆر زۆر تاریك بوو چاو چاوی نەئەبینی وەکو ئەڵێن کەوتینە ناو د لو درێ وش ینابییەوە کە لەگە□□ و جۆو شتی وا ئەچو ، بەدەوری گردا تێ پەڕین و کەوتینە ئەو دیوی لەپڕ حەسەن ئاغا ڕاوەستا و گوتی ئیتر صلاوات لێدەن سەفەر سەلامەت شکور گەیشتینە ماڵی خۆمان دەی ئیتر جگەرە بکێشین و قسە بکەن و حەز ئەکەن گۆرانیش بڵێن سەرمان سوڕما و هەر کەسە قسەیەکی کرد گوتم : حەسەن ئاغا لەڕێی خوادا خۆ هەمووی چارەکە سەعاتێك نابێت لەسەر شەقام و بەناو ڕەبییە و سەنگەری عەسکەرەکانا تێ پەڕیوین چۆن بەم زوانە و بەم چەند هەنگاوە ئەڵێیت ئیتر ترس نەما و گەیشتینە ماڵی خۆمان حەسەن ئاغای پێ کەنی و گوتی : ئەی چۆن دادەگیان ئەوانەی لەناو ئەو کونە گورگانەیان لەوێ خزاون لەوێشەوە تەقە و دەست ڕێژ ئەکەن ناوێرن بێنە دەرەوە بەشەو لەترسی پێشمەرگە ، هەر ئەوەیە کە گوێیان لەخشپە و دەنگێك بوو شتێك هەڵئەدەن ئەو ناوە ئەکات بە ڕۆژی ڕوناك ئینجا ئەکەونە دەست ڕێژ.

حەسەن ئاغا وای گوت هەر دەست بەجێ ئاسێ دایەنی منالەکان و لەگەڵ هێڤی کچم کە لەگەڵی و لەباوەشیابوو هەردوکیان لەولاخەکە بەربونەخوارێ تا گوتمان ئەوەکێ بو ؟ سەبریەی خوشکم و دژواری کوڕی ئەوانیش بەربونە خوارێ ئیتر گریانی منالێ و ئاخ و ئۆفی ئاسێ و سەبریەی خوشکم لەگەڵ پڕمەی پێکەنین هەمووی تێکەڵاوی یەکبوون

دڵمـان خـۆش بـوو هـەموو کەوتنـە قسـەو بـاس و دڵ دانـەوەی ئەوانـەی کەوتوون.

ئەو شەوە تابەینێکی باش هەربەڕێوە بووین تا وای لێهات هەموومان هاوارمان پێ کەوت منالَ خەویان ئەهات من زۆر بێ تاقەت بووم و هەردو قاچم سڕبوبو لەسەر پشتی وولاخ بۆیە بە حەسەن ئاغام گوت : ئەوە ئێمە هەروا بەڕێوە ئەبین شوێنێك نیە هەندێ پشوێك بدەین ؟ حەسەن ئاغا گوتی : با ئەوەتە گەیشتینە ئاشەکە لەوێ دا ئەبەزین و بۆخۆتان پشو ئەدەن و ئەنون.

ئلذری گەیشـتینە ئلذ اکە و ابزا ناوی ئاشە بەردینە بوو بەلاَم لایتی دەستی مان پێ بوو هەر بەو تۆزە شەوقە کوتوپڕەی لایتەکە دیمان ئاشی چی و حالَی چی شوێنێکی کەلاوە و ڕوخاو بەردی بەسەر بەردەوە نەمابوو لەو دەورو پشتەی هەموو تاشە بەردو دیواری کاول کرابوو. گوتمان : ئەمە چیە حەسەن ئاغا چۆن لێرە ئەنوین وامانزانی ئەگەینە دێ و ئاوایی و خانوو ؟

حەسەن ئاغا گوتی : ئەمە ئاشێکی زۆر بەکەلَك و باش و قەلَەبالَغ بوو وائم و هەمیشـ ە بەرکەس نەئەکەوت ئەم دیهاتی دەورو بەرە گە و چەلَتك د و کەل و پەلیان ئەهێنا بۆ ئێرە بۆ هاڕینی چەلَتوك کوتان بەلاَم ئەمە سێ چوار ڕۆژە فڕۆکەی حکومەت گەیشتە سەری و وا کاولی کرد ڕەبی مالَی ئەوانیش وا کاول بێت. چونکە حکومەت زانی کە پێشمەرگە لێرە کۆمەلَ ئەبن و لێرەوە ئەڕۆن بۆ جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانیان.

ئاسێ و ئەوانەی لەگەلَمان بوون بەپەلەپەل کەوتنە نوێن داگرتن و هەروا لالَ و پالَ هەریەکەمان لەشوێنێك جێ خۆی کردەوە. منالَەکان ئەوەندە ماندو بوبون هەر دەست بەجێ نوستن بگرە هەموومان وامانزانی لەسەر دۆشەکی پەڕی قو نوستوین کەچی لەسەر ئەو بەردانە پالَکەوتین و



تەنیا هەندێ سەرین و چەند پەتۆ و لێفەمان پێ بوو دوای بەینێك هەر وەکو گوێم لەدەنگێکی زۆر قولَی ناو بیر و ژێر زەمینم هاتە بەر گوێ کە ئەلَێت : دەی دادەگیان هەستن درەنگە ئەبێ لەپێش هەتاو هەلَهاتن بکەوینە ڕێ چاوم کردەوە جارێ نەم زانی ئەو دەنگە چیە و ئەوە کێ یە و درەنگ و هەتاو هەلَهاتنی چی ؟بەلاَم فڕە فڕی لوتی ئەسپ و ولاَخەکان و قسەکردنی حەسەن ئاغا لەگەلَ قەتارچییەکان هاتە بیرم کە ئەمە ئێمە لەکوێین و بۆ کوێ ئەچین.

ئاسێ هەستا منالاَنی خەبەرکردەوە و هەموو ڕاپەڕین ئەویش چونکە حەسەن ئاغا گوتی ئەگەر ئێستە نەکەوینە ڕێ لەگەلَ هەتاو هەلَهاتن فڕۆکە دێتە سەرمان چونکە هەر ڕۆژیان لێبوەوە ئەکەونە بۆردومانی ئەم ڕێگاو بانە بۆیە بەهاتنی ناوی فڕۆکەو تەیارە هەموو ڕاپەڕین و بەچاوی نیوە نوستو سەر و پۆتەلاکی شێواو کەوتینە ڕێ. دیارە لەهەموو مالەکا دلَم زۆر بۆ کوردەی کچم ئەسوتا و زۆر خەفەتم بۆ ئەخوارد و زۆر ئاگام لێبوو نەمەدایە دەست کەس چونکە تەمەنی شەش مانگان بوو زۆر ناسك و سپی کەلانە و گوناه بوو ئەگەرچی منالَەکانی تریشم هەر وەکو ئەو دلَم لەلایان بوو خەفەتم بۆ ئەخواردن بەلاَم ئەوان گەورەتر بوون و ئاسێ و خەلَك ئاگاداریان ئەکردن و بەتەنگیانەوە بوون.

بەدەم ڕۆیشتنەوە ڕۆژبوەوە و هەتاو هەلَهات حەسەن ئاغا لەقەراغ دێیەك لەژێر هەندێ درەخت دایناین و چو لەگەلَ چەند کەسێك بۆ ناو دێیەکە نان و ماست و چای بۆ هێناین. هەر ئەوەندە ماستیان دانا لەگەلَ نان ڕەشەبایەك هەلَی کرد و هەرچی ئەو خۆلَ و تەپ و تۆزەبو خستیە ناو ماست و خواردنەکەمانەوە. ن هەندێ تورەبووم و گوتم وا من ئەم زبلەناخۆم بەلاَم ئەوانی تر هەرچۆنێك بو شتێکیان خوارد ، من یەکەم جار بوو بچم بۆ لادێ و ڕێو شوێنی وا بەتایبەتی لەم زروفە نالەبارەدا بۆیە

سەرەڕای دەردان چوبوم پێڵاوێكی باتەی ناسكیشم كردبوە پێ لەبەرئەوە هەرچەند هەنگاوێك ئەكەوتینە ڕێ بەرەو بناری شاخی قندیل چونكە لەووڵاخ دابەزیم و ترسام لەبەر كوردەی كچم كە بەباوەشمەوە بو هەتاویش هەڵهاتبو دونیا گەرم گەرم بو فەسڵی هاوین بو لەبەرئەوە هەر هەندێك بەناو ئەو دارو و بەردانە ڕۆیشتم و خەریكی سەركەوتنی شاخ بوین كە پێلاّ وەكا پەكیان كەوت و پاژنەكانی لێبوەوە و ئیتر بەباشی نەم توانی بڕۆم بوم بەتەگەرە بۆ حەسەن ئاغا و پێشمەرگەكانی لەگەڵمان بوون.

پێشمەرگەیەكی ناسیاومان دەستی دایە كلاّشەكەی و گوتی بەو خوایە باجی هەمووی دە ڕۆژە لەپێم كردووە دە هەرچۆنێك بێت لەپێی كە باشترن لەمانەی خۆت خەریكن لێت بەجێ ئەمێنن و لەپێت دێنە دەرێ سەیری كلاّشەكەیم كرد و گوتم نەو لەپێی ناكەم كلاّشەكەت ئارەقی پێوە دیارە و بۆنی دێت. هەموو پێكەنین خۆشم پێكەنیم ، چونكە ڕێگاكەمان وا سەخت بوو هەرچەندە هەر ترسی فڕۆكە هاتنمان لەدڵابوو لەگەڵ ئەوەشا قسەی گاڵتەو پێكەنینمان ئەكرد لەگەڵ یەكتری. لەوكاتەدا كە گوتم ئەم كلاّشە لەپێ ناكەم خولەشێتەكەی خۆمان لێم ڕاپەڕی و بەزمانە لاڵەپەتەكەیەوە گوتی : ئەی بۆچی پێڵاوێكی نزم و باشترت لەپێ نەكرد بۆچی تۆ وائەزانی ئەچیت بۆ شارع الرشید و شارع ابو نواس ؟ خولەشێتەكەمان چونكە ئەیزانی هەموومان خۆشمان ئەوێت و هەموو شتێكی لێ قبوڵ ئەكەین لەبەرئەوە كە ئەیویست شتێك بڵێت بەبێ ترس ئەیگوت و ئەهات بەگژ هەموومانا. چونكە پشت ڕاست بو كەلێی قبوڵ ئەكەین ئەگەرچی من هەندێ جار شوێنی ئەكەوتم و ڕاوم ئەنا ئەگەر توڕەی كردمایە ، هەروەها هێرۆی كچیشم پەلاماری ئەداو شوێنی ئەكەوت ئەگەر توڕەی كردایە.

پارچە پەڕۆێكی گەورە كە وەكو سەر جێگا وابو دابوم بەسەر خۆما و كوردەی كچم خستبوە ژێری بە باوەشمەوە بەفەلاكەت و ماندوبونێكی زۆر گەیشتینە سەر شاخی قەندیل و چوینە سەر كانی و ژێر درەخت پەردەكەم لادا لەسەر سەرم سەیر ئەكەم نیوەی قاچی كوردەی كچم سوربوبوەوە و لەبەر هەتاوەكە سوتابو تمەز كە بەباوەشمەوە نوستوە زۆر ئاگاداری سەرو لەشی بوومە و پەردەكە نەگەیشتۆتە سەر قاچی كە داپپۆشێت بەڵام من هەركە هێشتا لەبەغدا بووین ئەم زانی چیمان بەسەر دێت یەك تورەكەی ەورە دەرمانی چ ك و كریمْ و رگْنی ڤازەیل وچەنەدەهاجۆرەحە پیّ بوو تەنانەت حەبی خوێن لەبەر ڕۆیشتنیشم پێ بوو ( نزیف ) ئەویش لەبەغدا بەسەر كوردەی كچمەوە توشی خوێن لەبەرچوون بووم و دكتۆر حەبیان دامێ بە دوو حەب خوێنم ڕاوەستا بۆیە ناردم لای دكتۆرێكی ئاشنام بۆی پەیا كردم و لەگەڵم بوو. دوایی ئەو حەبی خوێن لەبەرچونە بەكەڵكی پێشمەرگەیەكی بریندا هات دوایی ( لەشوێنی خۆی باسی ئەكەم ).

گەیشتینە هەڵەدن و مالومە باوكی هێرۆ و پێشمەرگەی زۆر لەئەشكەوتی مالومە بوون. شەو لەهەڵەدن نوستین بەڵام چ نوستنێك تاوەكو بەیانی كێچ خواردینی ماڵەكە زۆر ماڵی باش بوون بەسەزمانانە زۆر بەدەورمانا هاتن بڵێن چی ماڵەكەیان پڕبو لەكێچ و جانەوەری هەمە جۆر لادێی بەسەزمان حاڵیان زۆر شڕبوو بەدەست حكومەتە بەد ناوەكانەوە.

لادێ زۆر زۆر لەسەغڵەتیدا بوون و زۆر ئازاریان ئەبینی. هەروەها هەمیشە پێشمەرگەو خێزانی خەباتكەرەكان كەلەشارەوە ڕایان ئەكرد بۆ شاخ هەمیشە ئەبوون بە میوانی ئەو دێهاتانە لەو ڕێگایانە ئەبوون كە لێوەی تێ ئەپەڕین ئەو مالەلادێییانەش دڵیان بۆ ئەكردنەوەو جێیان ئەكردن تاوەكو ئەگەیشتنە شوێنی خۆیان هەروەها زۆر دڵسۆزی پێشمەرگەكانیش بوون و یارمەتیان ئەدان كاتێ ڕێیان بكەوتایەتە لایان.

ئێمە ئەچووین بەرەوە سەرگەڵو لەدوای ئەوەی شەهیدی قارەمان کاك علی عەسکەری وای بۆ ڕێکخستبوین کە جارێ بڕۆین بۆ ئەوێ چونکە لەوێ ماڵ و منالی خۆشی لەوێ بوون لەگەڵ ماڵی شێخ جەلالی خالی کە باوکی سەبیحەخانی هاوسەری بوو لەوێ جوابی بۆ ناردبون کە بەڕێوەین کەپرو شوێنمان بۆ ئامادەکەن.

شەوێکیش لەچوغماغ نوستین شەوێکیش لەدێیەکی تر ناویم لەبیر نەماوە ئەو دێیە کەناویم لەبیر نەماوە شەو گەیشتینە ئەوێ ئەوانیش ئەیانزانی کە دێین بۆلایان و وابەڕێوەین. ئێمەش ئەوەندە ماندوبووین هەر کە گەیشتینە لایان لەسەربان جێگایان بۆ ڕاخستبووین لەبەرئەوە هەر چاك و چۆنیمان لەگەڵ کردن و وەکو بێهۆش هەمووومان لەسەر جێگاکان کەوتین و نوستین ئەوەندەی پێ نەچو هاتن خەبەریان کردینەوە کە هەستین نان بخۆین. ئەو مالەبەسەزمانە زۆر ئەزیەتیان لەگەڵ کێشاین چونکە خۆمان خێزانێکی زۆر بووین و ئاگایان لێمان بوو لەگەڵ ئەو کەسانەی لەگەڵمان بوون هەروەها خاوەن وولاخەکانیش ئەبوو هەموو لەوێ نان بخۆن. کە هەستاین بۆ نان خواردن زۆر دیمەنێکی جوان و جادوییم دیت ، مانگ هەڵهاتبوو ئەو ناوەی بەشەوقی زیوی دڵفرێنی خۆی داپۆشیبوو دێکە هێمن و بێ دەنگ بوو دیارە وەکو پیشەی هەموو لادێ و فەلاحەکان چونکە بە ڕۆژ زۆر زۆر ماندو چەوساوەن بەسەزمانانە بۆیە شەو زو ئەنون بۆئەوەی سبەینێ شەوەکەی هەستنەوە بەلای ئیشەکانیانا لەبەرئەوە دێیەکە بێ دەنگ بو دەورمان هەمووی شاخ و گرد و دارودرەخت بوو شەو فێنکی کردبوو بەین بەین دەنگی وەڕینی سەگی دێیەکە ئەهات منالڵ بەرەبەرە هەستان و سینی خرایە بەردەستمان. سینی چی تیابوو ؟؟ قەرەخەرمانی فەریك و گۆشتی گیسکی خرابوە سەر. ئەو قەرەخەرمانەی ئەو شەوە و لردم ئەوەندەخۆش بوو هەتاوەکو ئێستە و چەندەها جار قەرەخەرما



خواردووە و چەندەها وولات و شوێنی خۆشم دیوە و خواردنی خۆشم خراوەتە بەردەم. هیچ کات و قەت قەت نەگەیشتونەتە پارویکی ئەو قەرەخەرمانەی ئەو شەوە بەو ماندوییە و لەسەر بانی ماڵی ئەو دێیە بچکۆلەبەدارو دڕك و خۆڵاویە فەقیرانەیە.

پێش ئەوەی بگەینە ئەم دێیەو دێیەکانی هەڵەدن و چوغماغ چوینە مالومە کە ئەشکەوتی مالومە زۆر بەناوبانگ بوو لەناو شۆڕش چونکە مەکتەبی سیاسی حیزب و پێشمەرگەی زۆری لێبوو. باوکی هێرۆ ناوی نهێنی مەلا قادر بوو سکرتێری پارتی بوو زۆر خۆشەویست بوو لەناو شۆرشگێڕو پێشمەرگەکان هەر خۆشی ناوی چەکدارەکانی نا پێشمەرگە خۆی ئینسانێکی دڵ گەورەو پاك و دڵسۆز بوو. و هیچ کات خۆی لەپێشمەرگەیەکی هەرە بچوکی لەشکر جیانەئەکردەوە و ئەو شتەی ئەخوارد کە ئەوان ئەیخۆن و نەیەهێشت فەرق و جیاوازی بکرێت لەبەینی پێشمەرگەو سەرکردە و ئەوانەی ئەیانتوانی شت بۆ خۆیان بکڕن و ئەبوو هەموو وەکو یەك بخۆن و لەو ڕوەوە چەندەها ڕوداوی پێکەنین ئەقەوما. وەکو جارێك برادەرێکی نەوسن و حاڵ باش چوبو بەدزیەوە ناردبوی بۆ خۆی مریشکی کڕیبوو چوبو لەپەنایێك لەگەڵ یەك دو کەس مریشکی ئەبرژاند کە بۆن بڵاوبوەوە و باوکی هێرۆ ئەنێرێت بزانێت کە ئەمە چیە ؟ ئەیێ و نەخۆشم ئەلێ سالار گیاندلک ماموستا وا ئەلێ کێئەوەو مریشکی برژاو بخۆم. ئەویش ئەنێرێتە سەری و کە جارێکی تر ئیشی وانەکرێت مریشك ئەبرژێنی بۆنی بەسەر پێشمەرگەکاندا تێ ئەپەڕێت ئەوانیش وەکو تۆ حەز لەمریشك خواردن ئەکەن ئەتەوێت مریشك بخۆیت بڕۆ بۆ شوێنێك کە پێشمەرگەی لێ نەبێت ، بڕۆ دێیەکی تر دانیشە مریشك بخۆ. ئەوکاتانە ٦١ و ٦٢ شۆڕش زۆر فەقیر و حیزب زۆر بێ دەرامەت بوون هەمیشە سێ ژەمە خواردنی پێشمەرگە پیالەچایێك و کولێرەی ڕووت بوو

ئەویش کولێرەکە هەمووی هەر زیخ و بەردو بوو چونکە فریا نەئەکەوتن گەنمەکە ببژێرن و پاکی کەنەوە بۆیە وا ئەڵێم چونکە ئێمەش لەو کولێرانەمان ئەخوارد لەدواییا کە گەیشتینە ژێر کەپرو ماڵی خۆمان.

حبیب محمد کریم کە ئەویش لەبەغدا هەڵهاتبوو خۆی گەیاندبوە ناو شۆڕش کوردی فەیلی بوو لەبەغدا لەسەر ئێستگەی بەغدا بوو. کاك حبیب محمد کریم قسەی زۆر خۆش و پێکەنین بوو. ناوی ئەو کولێرەو پیالەچایەی نابو ( الرفوف العالیە ) الرفوف العالیە بەرنامەیەك بوو لەرادیۆی بەغدا بلاوئەکرایەوە باسی گۆرانی و شتی کۆنی فۆلکلۆری ئەکرد. ئیتر ئەویش ناوی ئەو کولێرە زیخاویانە و ئەو پیالەچایەی وا ناو نابوو. هەندێ جار بۆ ئێوارە پێشمەرگە و سەرکردەکان نیسکێنەو پەڵپینە بەترشیان هەبوو دوایی وردە وردە پێشمەرگە شکور بەهێزبوون و هێرشی حکومەتیان ئەشکاند و چەکیان دەست ئەکەوت و حکومەت بەسەر شۆڕی ئەگەڕایەوە دواوە. زۆر چاك لەبیرم دێت جارێکیان هێزی حکومەت هێرشی کردە سەر پێشمەرگە ویستی سەرکەوێتە سەر ئەزمڕ. ئەوکاتە شەهید علی عەسکەری نەمر و هێزەکەی ڕێگایان بەو هێزەی حکومەت گرتبو ئەم ڕوداوە کە قەوما بەچاوی خۆم دیم هێشتا ئێمە لەسلێمانی بووین و هێشتا نەکەوتبوینە ڕێ بەرەو شاخ و ڕاکردن.

ئەو ڕۆژە هاتبومە ماڵی دڵسۆزانی کورد و کوردستان هەردوو خۆشەویست منیرە خانی قەفتان و کاك حامیدی نەمر ئەویش بۆیە هاتبوم چونکە لەمەراقا بووم هاتبوم بۆ هەواڵێك چونکە ئەمناسین و ئەمزانی کە چەند دڵسۆزن و پەیوەندیان چەند بە شۆڕشگێڕان و خەباتکەرانەوە هەبوو ، ئەوەندەی پێ نەچو یەکێ هاتو گوتی وا□□ وا لەشکری حکومەت هێرشی بردە سەر ئەزمڕ ، ئێمەش بەترس و ناڕەحەتیەوە ڕامان کردە سەربانەکەیان لەدورەوە تەپ و تۆز و تەقە دەستی پێ کردبوو دەبابەکان



گوڕیان ئەدایە خۆیان و سەرئەکەوتن و لەناوقەدی شاخەکە بە ڕاکردن دەبابەکان ئەگەڕانەوە دواوە یەك لەدوای یەك هەرچی لەوانەی ئەیانتوانی لەسەربانەکانیانەوە چاویان لێبوایە لەسەر بان بوون دەست بە دوعاوە بۆ پێشمەرگە قارەمانەکان. ئاخری لەشکری حکومەت شکان و گەڕانەوە لەو شوێنەی کە کاك علی عەسکەری نەمرو پێشمەرگە قارەمانەکان بەرگری ئەو لەشکرە زلەی حکومەتیان ئەکرد ئەو قارەمانانە نەك چەکی قورس و چاکیان نەبوو بگرە خواردنیشیان نەمابوو. لەو شوێنە چەند ڕۆژ لەوەو پێش جاشی حکومەتی لێبوو کە ڕۆیشتبون کولێرەو قەراغە کولێرەیان لێ بەجێ مابوو هەمووی لەبەر هەتاو وەکو پارچە تەختەیان لێهاتبو علی عەسکەری نەمر و پێشمەرگەکانی ئەو نانە کۆنەیان کۆکردبووەوە و ئاوی کولاوی کتلیان پیا کردبوو خواردبویان. بەڕاستی ئەوانە قارەمانی ڕاست بوون ئەوکاتانە بەبێ دەرامەت و بەسکی برسی و بەچەند تفەنگی خەڵکەکە خۆیان کەچی لەرزیان خستبوە ناو جەرگی عەسکەر و لەشکرو حکومەتەوە.

عەسکەرەکانی حکومەت بە پێشمەرگەیان ئەگوت ( جیش مەرگە ) نەیان ئەزانی بڵێن پێشمەرگە ئا بەم حاڵ و ڕوداو و کردارانەوە پێشمەرگە پێك هات و وردە وردە خۆی گرتەوە و بەهێز بوو ڕۆژنەبو مەخفەرو ناحیە و شوێنەواری حکومەت نەگرن لەپێچ و پەنای ئەزمڕ چەندەها جێبی سوتاو وەرگەڕاوی عەسکەرت لێ ئەبینی و چەندین دەبابەی پەك کەوتو وسوتاو ئەبینران. عەسکەری حکومەت لەدەورووبەری سلێمانی لەئێوارەوە خۆیان ئەخینە ناو ڕەبیەکانەو و بەهیچ جۆرێك نەئەهاتنە دەرەوە تەنیا ئەگەر گوێیان لەدەنگە دەنگ و ڕۆیشتنی وولاغ ببوایە لەبەرئەوە هەر گورج جۆرە لایتێکیان هەڵئەدا کە ئەو ناوانەی ڕوناك ئەکردەوە وەکو ڕۆژی لێئەکرد ئینجا ئەکەوتنە دەست ڕێژ ئیتر هەر کەسێك بەرکەوتایە بەتایبەتی

هەموو جارێك ئەو ماڵانەی بەرئەكەوت كە بەدزیەوە ڕایان ئەكردو خۆیان دەرباز ئەكرد بۆشاخەكان ئێمەش گەیشتبوینە سەرگەڵو لای شێخ جەلال و ژنە خانمە باشەكەی كەپرێكی گەورەی خۆشیان بۆ دروست كردبوین دیارە لەقەراغ دێیەكە لەشوێنێكی شاخاوی لەترسی فڕۆكەی حكومەت و بۆردومان و دو كەپری تریش لەم لاو ئەولامان بوو یەكێكیان هی مالەعەرەبێك بو پیاوەكە زەعیم و عەقید و ئەو پلەیە لەسوپای بوو عێراقیدا ئەویش ڕایكردبو ژن و مناڵەكانیشی لەگەڵ بوو ژنەكەی زۆر بەسەزمان و گوناح بو هەر ئەگریا و هەر خەریكی دو كوڕەكەی بو بۆ نەگبەتیش دەستیٚ جلی كوردیان كردبوە بەری شەپ و شۆڕ نەگبەتە هەر لێیببو بەبەلاّ لەگەڵ سەرپۆشێكیش بەسەریەوە ئەوان پێش ئێمە لەویٚ بوون كەئێمە گەیشتین زۆریان پیٚ خۆش بو بەتایبەتی كە ئێمە عەرەبیشمان ئەزانی و كەوتینە قسەو باس لەگەڵیان ئیتر ژنە هەر بوژایەوە و دڵی خۆش بوو.

لەمالومە باوكی هێرۆ پێشمەرگەیەكی باش و دڵسۆزی لەگەڵ بوو ناوی كاك صالح مالومەیی بوو ئەوە كە یەكەم جار گەیشتینە مالومە لەماڵی كاك صالح پشومان داو چاو ماستاو و ئەو شتانەمان خواردەوە لەبەر ئەوە باوكی هێرۆ كاك صالحی لەگەڵ ئێمە نارد كە بە دیارمانەوە بێت و ئاگای لێمان بێت چونكە زۆر شارەزای ئەو ناوانە بو ئێمەش مناڵمان ورد بوون و خێزانمان زۆر بوو.

سەبریەی خوشكم كە گەیشتینە سەرگەڵو ئیتر جەلال ئەتروشی مێردی هات بۆلای ئەویش بەدیارمانەوەما ، جەلال ئەتروشیش لەگەڵ دكتۆر صدیق ئەتروشی مامی كە ئەو زاوای من بوو مێردی ڕێسانی خوشكم بوو ئەوانیش لەبەغدا ڕایان كردبوو گەیشتبونە ناو هێزی پێشمەرگە و شۆڕش



، هەر خەرڵك بو و پیاوی ناسراو بو بەرێوەبوون كە ڕایان ئەكرد و ئەهاتنە شاخ و پەنایان ئەهێنا بۆ شاخ و شۆڕشی كوردستان.

سەرگەڵومان پیٚ خۆش بوو دەوری كەپرەكەمان هەموو دارە گوێزی زل زل بو جۆگە ئاومان لەبەردەم تیٚ ئەپەڕی بەلاّم لەهەمووی ناخۆشتر سەرگەڵو دوپشكی زۆر بوو دوپشكی بەناوبانگ بوو كە هێشتا هەر بەرێوە بوین و نەگەیشتبوینە سەرگەڵو خاڵە هەمزەم جوابی بۆ ناردم كەلەسەرگەڵو ئاگاتان لەخۆتان بێت دوپشكی زۆرە خاڵە هەمزەم چونكە زۆر ژیانی هەر شاراوەو قاچاغ بو لەحكومەتە بەد ناوەكانی عێراق و دائم و تێكڕا بە دوایەوە بوون كە بیگرن لەلای جەنابی سەید ئەحمەدی خانەقا بو ولای ئەو و لەدێهاتی ئەودا شاراوەبوو سەرگەڵو دێی سەید ئەحمەدی خانەقای نەمر بوو بۆیە شارەزای بوو ئەیزانی كە دوپشكی زۆر تایبەت و زیان كاری لێیە.

كوردەی كچم عمری شەش مانگان بوو لەناوەڕاستی كەپرەكە بە كۆڵەكەوە گوریسمان بۆ كردبو بە جۆلانە بەلاّم مناڵی ترم و خۆم و هەمومان هەر لەسەر ئەرز و لەناو ئەو خۆلەجێگایان بۆ ڕائەخستین و ئەنوستین بەترس و لەرز شەوێكیان هەروەك یەكیٚ خەبەرم كاتەوە و بڵێت ـمـ تە زوكە كە ڕاپەڕیم و سـ ەیریگی مناڵەكا[] كرد یەك دوپشكی ەقەد ە لەپی دەستێكم دیت لەسەر پەتوەكەی سەر سنگی هێڤی كچم كەبەپەلەڕایكرد بچێتە ناو جێگاكەیەوە هەر ئەوەندەم توانی كە وەك بروسكە و شێت پەلاماری پەتوەكەی بدەم و هەڵی دەمە ئەولایە ئیتر ئەو شەوە هەموومان نەنوستین و خەو نەچوە چاومان لەترسانا. ئەوە مەراقی هەرە گەورەمان بوو ، هەموو ڕۆژێك هێزی پێشمەرگەی قارەمان بەلاماندا ئەهاتن و تێكڕا لای شێخ جەلال دائەنیشتن پشویان ئەداو نانیان ئەخوارد زۆری سەر لەشكرو سەركردەیان كە ناسیاومان بوون ئەهاتن سەلامێكیان

لیّ ئەکردین و هەندیّ لەژێر کەپرەکەمان دائەنیشتن و ئەحواڵیان ئەپرسین ، ڕۆژێکیان یەکێکیان کە ناوی مەلا ناصح بوو ئامر هێزی پێشمەرگە بوو هات سەلامی کرد و هەواڵی پرسین و گوتی ئێرەتان پیّ خۆشە چۆنن شێی گوتم وا زۆر خۆشە بەڵام بەشەو ناوێرین بنوین منداڵەکان زۆر ئەترسن لەبەر دوپشك. مەلا ناصح گوتی : بەڕاست ئەترسن بنون منیش گوتم ئەی وا وەکو پێت ئەڵێم گەلا ظح هەلیّ دلی وگوتی . مەمت : نەبێت بە خوا دوێنیّ مەخفەر و شوێنی زۆر گەورەی حکومەتمان گرتوە مێزو کورسی درێژیشی تیایە هیچ خەمت نەبێت دو ڕۆژی تر بۆتان ئەنێرم ئیتر هەستا و لەگەڵ پێشمەرگەکانی ڕۆیشتن منیش لەدڵی خۆما گوتم ئەوە دڵم خۆش ئەکات ویستی هەندیّ وورەمان بەرزکاتەوە مێزی چی و قەنەفەی چی لەناو ئەم شاخ و داخە دا دێت و ئەگاتە دەستمان ، خۆ ڕێگای ئوتومبیل نیە قابیلەبە وولاغ ئەو جۆرە شتانە بگوێزرێنەوە ؟ دو سیّ ڕۆژی پێچو کە ئێوارەیەك خولەشێتی خۆمان بەدەمەلالەپەتەکەیەوە ڕاپەڕی و گوتی : ئەوە چیە بەکۆڵ و سەر پشتی ئەو وڵاخانە وا دێنە خوارەوە بەرەو لای خۆمان. ئەوەندەی پیّ نەچو کەسەری وڵاخەکان لەناو دارو درەختی ئەوناوە هاتنە دەریّ مێزو کورسی و کەل و پەلی بەسەر کۆڵەوە. منداڵەکان و ئەوانەی لەگەڵمان بوون قاو وقریشکیان تیّ کەوت و چوون بەپیریانەوە.

وولاخ گەیشتن لەگەڵ خاوەنەکانیان و کەوتنە داگرتنی کەل و پەلەکان. کەل و پەلەکان زۆر نایاب و جیّ باوەڕنەکەردەنی بوون بۆ ئەو شوێنە شاخاوی و سەختە و بریتی بوون لەکورسی یەك کەسی ئاسنی سپی زۆر تۆکمە و لەهەرە باشەکان.

دو کورسی داری درێژی سیّ کەسی کە پێیان ئەڵێن ( کەرەویت )و یەك مێزی گەورەی وەك هی نان خواردنی شەش کەسی و یەك کارتۆنی پڕ لەقاپی وەرشاوی نایابی فەرەنسی هەروەها فەرشێکی جوانی ئێرانیش.

لەبەرئەوە ئینجا ئەو شەوە منالان لەخۆشیانا نەنوستن. بەینێك لەسەر گەڵوماینەوە. سەبیحە خانی ژنی شەهید علی عەسکەری و منالەکانیش لەویّ بوون ، ومنالەکان ورد بوون. باوکی هێرۆ هەرچەند ڕۆژێك نامەیەکی بۆ ئەناردم لەدوا نامەیدا نوسیبوی خۆتان کۆکەنەوە وا دێن بەدواتانا تاوەکو بێن بۆ ماوەت خۆمان کۆکردەوە دیسان بە هەمان ڕێگادا کەوتینەوە ڕیّ بەلام بۆ ماوەت بە ئوتومبیل بردیانین. لەماوەت شەو گەیشتین لەخانوێکی خۆشدا لەچاو خانوی لادیّ دابەزین دوایی زانیمان ئەمە خانوی قایمقامی حکومەت بوەو کە پێشمەرگە ماوەتیان گرت قایمقام ڕایکردبو بەلام خانوەکە چۆڵ بو هیچ کەل و پەلی تیا نەبوو. لەوەش ئەچو وەکو پیشەی هەمیشەیی میلەتانی دواکەوتو ماڵەکە تالان کرابوو لەلایەن خەڵکەوە کاتیّ پێشمەرگە سەرقاڵی شەڕبوون. هەرچۆنێك بوو شوێنەکەمان زۆر پیّ خۆش بوو بەتایبەتی کە خانوەکە حەمامێکی زۆرچاکی تیابو و ئێمەش زۆر پێویستمان بەحەمام هەبوو چونکە لەو شوێنەی ئێمە سەرگەلۆشویلی خۆشتنی لی نەبوو هەرچەندە کە من ئەتوا بەبیّ نان خواردن بژیم بەلام بەبیّ حەمام و خۆشتن بە هیچ جۆرێك هەڵناکەم و ناژیم بەتایبەتی بەو گەرما و ڕێگاوبانە سەختانەی کە پیا ئەهاتین و ئەچوین بۆیە چەند جارێك کە ئەگەیشتینە دێیەك ئەلی دەی منالەکا کە زۆر خۆشەویستمان بوو زۆر دڵسۆزی هەموو شتێکمان بوو گورج بەپەلەخولەشێتی ئەبرد بۆ پەناییێك ئەگەڕا و مەنجەڵی گەورەی ئاوی ئەخستە سەر ئاگر و تەشتی دائەنا و ئەکەوتە جل شتن و سەری منالان شتن.

جارێك شوێنی خۆشتنەکە زۆر نارێك و خراپ بوو چوون دەرگایەکی شکاوی کۆنیان هێنا و خستیانە سەر چوار بەردی زل و چوین لەسەر ئەو دەرگایە سەرمان شت دیارە ئاسیێ شوێنەکەی خۆش ئەکرد و پەردەی بە شوێنەکەوە ئەکرد و بەدیار ئاگرەکەوە دائەنیشت ئاسیێ دەمێك بو لەلامان بوو خەڵکی دێی ئەتروش بوو مێردەکەی ژنی بەسەر هێنابوو ئەویش هاتبو بۆ لای ئاشناکانی لەبەغدا ، خۆی زۆر ژنێکی ڕێك و پێك و لێهاتوو کەیبانو پاك و تەمیزبوو لەدێیەکەیان ناوی دەرکردبوو بە زیرەکی و ئاقڵی و لێهاتویی دایکی سێ کوڕو کچێك بوو کەچی مێردەکەی چو بو ژنێکی زۆر تەمەڵ و پیسی و پۆخڵ و بێ دەسەڵاتی بەسەرا هێنابوو. ئاسیێ زۆرجار ئەیگوت : خۆزگە صالح کە ( ناوی مێردی بوو ) ژنێکی لەمن چاکتری بهێنایە بەخوا پیرۆزم ئەکرد لێی و دائەنیشتم بەدیاریەوە و ئەمگوت کە ئەم ژنە زۆر لەمن باشترە ، کەچی چو ئەو ژنە تەمەڵ و سست و پیس و پۆخڵەی بەسەر منی بەناوبانگ هێناوە ئیتر من چۆن دائەنیشم. ئاسیێ زۆر قسە خۆش بوو قسەو بەسەرهات و پێکەنینی بۆ ئەکردین کە ئەهات بۆلامان کوڕە بچوکەکەی لەگەڵ بوو ناوی علی بوو لەمەکتەب بوو ئێمەش زۆرمان خۆشەویست وەکو کوڕی خۆمان ڕفتارمان لەگەڵ ئەکرد ، علی لەسنفی پێنجی سەرەتایی بوو.

نزیك حەفتەیەك لەماوەت ماینەوە بەیانێکیان لەبەر پەنجەرەی ژوورەکە ڕاوەستابووم کە سەیرم کرد وا کۆمەڵێ عەسکەری عێراقی لەدەرەوە ڕاوەستاون و بەشەقامەکەی بەردەمانا دێن و ئەڕۆن. زۆر شڵەژام بانگی ەکیێ لەکورگکانی خۆما کرد و وتم ئەیەرۆ ئەوە عەسکەر و حکومەت ی ەێتنەسەرمان برگ بزانەچیە زۆرش پرزە بووم و بانگی مناڵەکا کرد و کۆم کردنەوە کوڕەکەمان لەگەڵ پێشمەرگەیەکی خزممان بوو ناوی لطیف بوو برای شەهید محمد قودسی بوو کە لەگەڵ سێ ئەفسەرەکەی تری



حکومەت مصطفی خۆشناو عزەت عبدالعزیز کە خاڵی دکتۆر صدیق شئەتروشی زاوام بوو شەهید کران و ەهید خیرا لطیف چاوی هەندێ ورد و نارێك بوو پێیان ئەگوت مشان زۆر گاڵتەچی و قسە خۆش بوو ئەوانەی لەگەڵی ئەبوون دائم و هەمیشە قاقا پێکانینیان بەرزئەبوەوە ، مشان کردی بە ژورا و گوتی ئەوە چیە ترساون لەدیمەنی عەسکەر گوتم ەێی ێوا وەم زانی دایان بەسەرمانا مشان پێ کەنی و گوتی ئەوە : عەسکەرە ئەسیرەکانن شەقام و ڕێگاوبانیان پێ پاك ئەکەمەوە.

لەقسەکەی نارەحەت بووم و گوتم : بۆچی عەسکەری قوڕبەسەری معیدی کە بەفەرمانی حکومەت هاتون بۆ شەڕ ئەهێنیت شەقامت بۆپاك کاتەوە بۆچی جاشی کورد ناهێنیێ بۆچی لوت بڕاو ناهێنیێ کە کوردن و بونەتە جاشی حکومەت و دێن هێرش ئەهێننە سەر دێهات و پێشمەرگە و زۆریان لەلاتان گیراو ئەسیرن لەو چەند ڕۆژانەدا پێشمەرگە جاشێکی کوردی زۆر خراپ و خراپکاریان گرتبوو لوتیان بڕیبو بۆیە منیش گوتم بڕۆ لوت بڕاو بێنە عەسکەری ئەسیر ئیشی پێ مەکە. ئینجا ئەو جاشە لووت بڕاوە چوبو ماڵی ئێمەی پیشانی ئەمن و حکومەت دابوو لەسلێمانی. چونکە شەوی منع التجولەگەورەکە ماڵی ئێمەیان نەنا سیبو وەیان ئەزانی هێشتا لەبەغداین و خانوەکەمان کە ئێستە ( زاموایە ) لەناو بازاڕە وەیان زانیبو کە مزگەوتە یا جێ شتی بازاڕی ( جملەیە ) و بۆ سبەینێ لەهەر کەسێکیان پرسی بوو گوتوبویان نازانین ماڵیان لەکوێیە. تاوەکو جاشی لووت بڕاو هات و یەکسەر عەسکەری هێنابوە سەرماڵەکەمان بەڵام ئەوکاتە ئێمە لەماڵەکەمان نەبووین دەچوبوین تەنیا دوکوڕمان بەدیار ماڵەکەوە بەجێ هێشتبو تاوەکو چارێکی بۆ بدۆزنەوە بەتایبەتی بۆ کتێبخانەکەی باوکی هێرۆ کە زۆر کتێبی نایابی تیابوو. ئیتر کە هاتبونە ماڵەکەمان دو کوڕکەیان هەر نیوە مردوکردبو بە لێدان و شەق

کوڕەکانیش ئەحمەد هەورامی کوڕمان بو کەبەمناڵی بەخێومان کردبو لەگەڵ علی ( ئاسیٚ ).

لەماوەت ئێواران پێشمەرگە پەڵپینە بەترشیان لیٚ ئەنا هەموو ئێوارەیەك پڕ قاپێكیش بۆ منیان ئەنارد ئەو پەڵپینە بەترشەی پێشمەرگەکان زۆر خۆش بوو نازا□□ بۆچی دوایی چەند پەڵپینە بەترشمان دروست ئەکرد لەکاتی بون و خۆشیدا بەڵام هیچ کاتیٚ تامی پەڵپینە بەترشی مەنجەڵی پێشمەرگەکانی نەئەدا هەروەها وەکو پێشتر باسم کرد تامی قەرەخەرمانەکەی شەوی سەربانی ئەو دێیەی لێی نوستین نەئەدا و وەکو ئەوان خۆش نەبوون. وەکو مەسەلەکوردیە ئەڵێت ( تاسوق ) و بەتام نەبون. وەکو عەرەب ئەڵێن ( کل شیء ممنوع مرغوب ) چونکە ئەوکاتە لەزروفێکی پڕ مەترسی و نائاسا و نائارامدا ئەژیاین و بەڕێگاوە بووین ماندو بیٚ دەرامەت بوین بۆیە پەڵپینە بە ترشمان لا بوبو بە حەڵوا و شیرو شەکر و خۆشترین خواردن.

لەماوەت دوای هەفتەیەك گەیشتنە ژاژەلەئێوارە گەشتین ڕوداوێکی زۆر نالەبار و ناخۆش ڕوی دا ئەویش هەر مناڵەکان دابەزین لەسەرپشتی ووڵاخ ئەشیایان داگرت هێشتا ووڵاخەکان ڕاوەستابوون و کەل و پەلیان لەوناوە کەوتبوکە مارێکی درێژی زلی ئەستوری سەر زل لەژێر کەپرەکە هاتە دەریٚ بوبە قاوقرشکی مناڵان کاك صالح مالومە و ئەو خەڵکانەی تر ڕاپەڕین و بۆی چون باش بو توانیان مارەکە بکوژن و ڕانەکات لەدەستیان چونکە ئەو ناوەو دەروپشتەیان هەمووی درك داڵ و شینایی و بەردو خۆڵ بوو.

مناڵەکان ترسان لەپێش هەموویان هێرۆی کچم کە ئەوسا مناڵ بو عمری هەر یانزە دوانزە ساڵ ئەبو توڕە بوو گوتی من ئەڕۆمەوە بۆ لیمٚانی و لیرٚە نا□□ ئەوەندەی پیٚ نەچو هەڵۆی براشی هاتە پیلڵی و گوتی



یرٚە نا□□ ئەوە چیە ئەم هەموو شوێنە پڕ لەمارودوپشکە لێرە نانوین و نابین تاقەتمان چوو. کەوتینە دڵدانەوەیان و هەر یەکە لەلایێکەوە کەوتە باسی شاخ و کێو و ماری وا کە چەند خێرو بەرەکەتە وا لەپڕدەرپەڕێت ( دیارە لەبەر دڵی مناڵەکان ئەو قسانەیان ئەکرد ) بەتایبەتی کاك صالح مالومە و خولەشێتەکەمان.

هەرچۆنێك بو مناڵ بیٚ دەنگ بوون بۆ شەویٚ هێشتا شتەکانمان پرش و بڵاوبوون خەڵکی دێیەکە هاتن بۆ بەخێر هاتنمان زۆر خەڵکی باش و دڵسۆز و چاك بوون. هەرچەندە زۆر ماندوبوین و مناڵان بۆڵەی نوستن و جێگایان بوو ( ئاسیٚ ) بادینی بو وەکو پێشتر گوتم خەڵکی ئەتروشی بوو دوای دو ڕۆژیش هەر بۆڵەی ئەهات و ئەیگوت دایکم خەڵکی (ئاژڵە) هەر نەیانهێشت هەناسەیەك بکێشین بەو شەوە بەوحالەهاتن بۆ بەخێرهاتنمان سەرەڕای دەردان هەر هەڵنەئەستان و زۆر دانیشتن ، ئاسیٚ بە ژاژڵەی ئگوت ( ئاژلە) چونکە بادینی بوو.

چەند ڕۆژێك لەژاژلەماینەوە دوایی بردیانینە ( خەزێنە )هەر لەویٚ کەپریان بۆکردین شوێنەکەمان بەتەنیا و خۆش بوو گردەڕەش ئەیڕوانیە سەر شوێنەکەمان هەروەها چەمەکەشمان زۆر لیٚ نزیك بوو ئەولاتریشمان مەکتەبی سیاسی بو بۆ دە دەقیقەیەك لێمانەوە دور بوون. کونە تەیارەشیان بۆ دروست کردبوین. کەپرەکەمان گەورەو خۆش بو لەسەربانەکەش ئەنوستین. هەروەها کانی و حەوزە ئاوێکی خۆشیشمان لەبەردەم بو لەلای حەوزی ئاوەکەش کەپری کاك صالح مالومە و پیاوەکانی لەگەڵمان بوون.

گردە ڕەش ئێستگەی شۆڕشی لێبو هەرچەندە ڕێگاکەی زۆر سەخت بوو بەوڵاخ بەرمیلەئاویان بۆ ئەبردن پێشمەرگە و پرسگای ئێستگەکە لەویٚ بوون بەشەو چاومان لەچراکانیان بوو ئێستگەکە ئێواران دەستی پیٚ

ئەکرد و ئەوناوەی ئەهێنایە جۆش و دڵی هەموو پێشمەرگە و شۆڕشگێڕانی خۆش ئەکرد و ورەی گوێگرانی بەرز بەرز ئەکردەوە کە گوێیان لەخوێندنی ئەو بەیان و نوسینانەی ئەبو هەروەها گوێیان لەدەنگ و باسی شەڕ و پەلاماردان و تێکشکاندنی هێزی حکومەت ئەبو هەروەها دوایش چەندەها گۆرانی هونەرمەندی دەنگ خۆشی بەسۆزیان پەخش ئەکرد. هەمووومان و هەموو ئەوانەی دەنگی ئێستگەکەیان بۆ ئەچو کەلەناو شارانیش گوێیان لێ ئەبوو بەپەلەو لەسەر ئاگر چاوەڕێی ئەوکاتە ئەبوون کە ئێستگەی شۆڕش ئەکرایەوە.

لەوێ بەتەواوی دامەزراین ناردمان مانگاێکمان کڕی لەبەر شیر بۆ کوردەی کچم کە شیرە خۆر بوو هەروەها ئاسێ ماستیشی بۆ دروست ئەکردین هەر لەو شیرە. منالەکانیش گیسکیان بۆ هات ، گیسکەکە سپییێکی زۆر جوان بوو گوایە یەکێ بۆی ناردوین کە سەری بڕین و بۆ خواردن بەلام ئێمە چۆن دلمان ئەهات سەری بڕین منالان هەر زو بردیانە سەر پلوسك و حەوزی ئاو و شتیان و ووشکیان کردەوە و مویان داهێنا و قردێلەیەکی پەمەییان کردە ملی و سەر پەرچەمیان داهێنا و ناویان نا(بێ بێ). ئەوسا برجیت باردو لەوپەڕی جوانی و هونەر ناسین دابو بۆیە ناویان نا ب. ب.منال هەندێك سەریان قال بوبە( ب. ب )وە بەلام دوای ماوەیەکی کەم سەرەتای پایز بە درم و هەلامەت و نەخۆشیەوە هەڵی کوتایە سەرمان. خۆ فرۆکە هاتن و لەناکاو گەیشتنە سەرمان ئەوە هەر باس ناکرێت هەر بەوەدا ئەگەیشتن ڕاکەینە کونە تەیارە کەمانەوە دیارە منالان بەبێ ( بێ بێ ) نەئەچون و ئەبو بێ بێ شیان لەگەل بێت.

بەلام لەهەموو ناخۆش تر نەخۆشی مەلاریاش بلاو بوەوە منالەکان هەمیشە یەك دوانێکیان لەجیاکەوتبون خوێنی لوتیان بەرئەبو و زۆر نەخۆش بوون بەسەزمانانە. کەمەکتەبی سیاسی هاتنە خەزێنە ئەشکەوتی



مالومە کرا بەخەستەخانەی شۆڕش. دکتۆر سەروەری حەمەی دەروێش کەریمی خزممان هەروەها دکتۆر ئەحمەد شالی و دکتۆری تریش لەوێ بوون و خەریکی بریندار و نەخۆش بوون دکتۆر سەروەر و دکتۆر ئەحمەد هێشتا بەتەواوی نەبوبون بە دکتۆر و سنفێکیان مابو کە هەلهاتن و پەیوەندیان بە شۆڕشەوە کرد کاتێ کە خەریك بوون بیان گرن لەبەغدا. بەڕاستی شۆڕشەکە شۆڕشێکی زۆر دەولەمەند بو بە سەرکردەی ئازاو زیرەك و دلسۆزی کە زۆریان لەگرتنی قەلەم و باسی ئەدەب و عیلم زیاترو هەر نەیان ئەزانی چەك و تفەنگ و گولەو شەڕ چیە بەتایبەتی ئەوانەی وەکو مامۆستا برایم ئەحمەدی نەمر ( باوکی هێرۆ ) کەلەتەمەنی شانزە سالیدا مەژی بۆ مردن و بمرە بۆ ژیانی گوتبوو. و هەروەها لەتەمەنێکی زۆر کەمیشدا ڕۆمانی انگلیزی گۆڕیبوەوە بۆ کوردی. هەروەها یەکێکی وەکو مام جەلال کەلەتەمەنی پانزە سالیەوە خەریکی چالاکی و کوردایەتی ناو تەلەبە بوە بوبوبە پێشمەرگەیەکی دلسۆزو قارومان و لەپەنا ئەشکەوتەکانا سەرکردایەتی هێزەکانی پێشمەرگەی ئەکرد زۆرجار بەبرسی کەلەناو تەنەکە ڕۆنی بەتال لەچەمی ڕەزان و پەنا ئەشکەوتەکان نیسکێنەیان لێئەنا و ئەخوارد ئەگەر دەستیان کەوتایە هەروەها خەباتکەرانی تریش کە وەکو کاك نوری شاوەیسی ڕەحمەتی کە کاتی خۆی مدیر عامیش بو لەلای حکومەت گیرفانەکانی و چەکمەچەی مێزی دائیرەکەی نامەو بەیانی وای تیا ئەبو کە حکومەت زەلامی سێ جار لەسەر هەلەواسی یا یەکێکی وەکو سەید عزیز شمزینی پیاو و مەرد و دلسۆز و ئازا یا وەکو کاك عومەر دەبابەی نەمر کە کاتێ تەلەبەیی سنگی نابوبە دەبابەی حکومەتەوە لەبەغدا و ناو شۆڕشیش بە هەفتە دەوری خۆی و پێشمەرگەی ئەگێڕا لەهەیبەت سولتان و شوێنانی تر دوایی قارەمانانە لەدەوردانەکەیان ئەشکاند و بەسەر و پۆتەلاکی شکاوەوە عەسکەریان

ئەناردەوە دواوە کە چەندەها ئوتومبێلی سوتاو و دەبابەی شکاویان لێبەجێ ئەما.

یاخود یەکێکی بلیمەتی زۆر زیرەکی وەکو کاك سمایل سەرهەنگ کە هەموو شفرەی حکومەتی وەرئەگرت بە هۆی بیٚ تەلەوە و دەست بەجیٚ ئەکەوتە ئاشکرا کردنی کە سبەینیٚ ئەدەن بەسەر کویٚ دا وڕیٚی بەرەو گویٚ ئەگرن و کویٚ بۆردومان ئەکەن. ێر بەرێلە تی نازا باسی کیٚ بکەم و باسی کیٚ نەکەم ڕۆڵەی دڵسۆز و نەبەز و خەباتکەر و شۆرشگێرٚ و قارەمانی زۆر زۆر هەبوون کە هەمیشە میلەت ئەبیٚ لەناو دڵ و چاویان جیٚ گیریان کەن و ئەوەش بزانن کە ئەم ڕۆژەی ئەوان ئەیبینن و پیٚی سەربەرزن ئەوە هەموی ڕەنجی شان و بەری خوێنی گەشی پێشمەرگەی قارەمان و هەوڵ و تەقەلا و زانین و عیلم فیداکاری ئەو جۆرە سەرکردە نەبەزانەیە.

بەرە بەرە پێشمەرگەی قارەمان پڕچەك بوون و کاتیٚ کە عەسکەری حکومەت ئەشکان و هەڵەهاتن و چەکەکانیان ئەکەوتە بەر دەست پێشمەرگە. شۆڕش حاڵی بەرەو باشی ئەڕۆیشت و بەهێز ئەبو و لەدەری وولأت خەریك ئەبوون شۆڕشەکە ناوی دەرئەکرد و ناسراو ئەبو ، تا ئەهاتیش پێشمەرگەی قارەمان زیڕەیان ئەخستە ناو دڵی حکومەتەوە بەجۆرێك پێشمەرگەی قارەمان کەوتنە ڕیٚ پیٚ گرتنی شەمەنەفەری بەینی کەرکوك و بەغداش. تاوەکو جارێك بەسەرکردەیی ڕەئیس کمال موفتی شەمەندەنەفەرەکەیان گرت عەسکەری زۆری تیابوو هەموویانیان بەئەسیر گرت. حکومەت وای لێهات کە ئازوقە و مانگانەی ئەنارد بۆ هێزو مأمورەکانی ناوشارەکان بە قەد لەشکری پەلاماردانێك هێزی لەگەڵ ئەو ئازوقە و پارەی مانگانەکانی ئەنارد.



شای ئێران کەئەمەی زانی و لەسەرکەوتنی شۆڕش ئاگادار بوو ئەویش کەوتە پشی پشی بۆ شۆڕش و سەرکردەکانی و جوابی بۆ ناردن کە ئەتوانن بنێرن بۆ هێزەکانیان خواردن و هەموو جۆر کەل و پەلێك بکڕن هەروەها سەرکردەکانیشی ئەتوانن بە ئێراندا بێن و بڕۆن بۆ دەرەوەی وولأت و هەموو ڕێگایەکیان بۆ ئەکەینەوە. ئەمەش دیاربو لەبەرخاتری چاوی ڕەشی کورد نەبو ئەگینا ئەگەر باش ئەبوون لەگەڵ کورد با لەگەڵ کوردی ئێران باش بوایە هەر هیچ نەبێت بیهێشتایە بەزمانەکەی خۆیان بخوێنن و زۆربەیان لەحەپسخانەکانی و لەژێر ئەشکەنجەدانا نەبونایە.

بەو ڕێکردنەوەیەی ئێران پێشمەرگە و شۆڕش بوژانەوە و کەوتنە ناردنی خەڵك بۆ شت کڕین و خواردن و کەل و پەل کڕین ( کاك عبدالرحمن روتە ) هەر بەوەدا ئەگەیشت بچێت بۆ ئێران و لەوسەر بێتەوە لەگەڵ ڕیزێکی درێژی قەتارچی و وڵاخی بارکراو لەبرنجی سەدری نایاب و ڕۆنی شاپەسەندی بۆن خۆش و شەکرو هەموو پێویستیەکانی ژیان ئەگەرچی شۆڕش دەرامەت و پارەی کەم بوو حاڵ باش نەبو بەلأم وردە وردە بەرەو باشی ئەچوون بەتایبەتی لەڕوی چەك و تەقەمەنیەوە چونکە هی عەسکەری حکومەتیان دەست ئەکەوت کاتیٚ ئەشکان و هەموو کەل و پەلیان بەجیٚ ئەهێشت و ڕایان ئەکردە دواوە لەوکاتانە قاوێك بڵاوببووەوە کە ئەیانگوت هەندیٚ عەسکەری داماوی معیدی کە زیڕەیان ئەکردو لەو ڕێگاو بان و شاخ و داخە هەندێکیان ئەیان قیڕندو ئەیانگوت ( ا انی وین و گوەیژە وین ) خوایە من لەکویٚ و گۆیژە لەکویٚ مەبەستی شاخی گۆیژە بوو کەنەشی ئەزانی بەسەزمانە بڵێت گۆیژە ئەیگوت ( گوەیژە )دیارە ئەوکاتە سوپای عێراقی وا زۆر قایم و شارەزا نەبو وەکو کاتی صدامی خوێن ڕێژ کە بەپیٚ و لەسەر مۆدیل و چەشنی سوپای هتلر سوپای عێراقی دروست کرد بوو کەوای لێکردن بە زەهری کوشندە و

قەدەغەی جیهانی کورد و هەموو کەسێکی غیرە کوردیش بکوژێت و بەصەدان دێهات وێران بکات بێجگەلەئەنفال کردنی هەزاران کەسی بێ خەتاو و بێ دەسەڵات و بێ چەك کە چونکە کورد بوون. و هەزاران هەزار گوناهی تر کەلەژمار نایێن. بۆیە بۆردومان و لەشکر ناردنی حکومەتە پێشێوەکانی عێراق لەچاو دڕندەیی کاتی حوکمی بەعسی صەدام هەر زەڵاتە و خواردن بوون.

پایز گەیشتە سەرمان دونیا ساردی کرد و باران خەریك بو گوڕ بداتە خۆی. ئێمە هەر لەخەزێنە بوین لەژێر کەپر ماوەیەك لەوەو پێش ناردمان گەنمیان بۆکڕین کە ئاسێ بیکوڵێنێت و بیکات بە ساوەر ئەویکەش بۆ نان.گەنمی ساوەر کوڵاو ووشك بوو کەوتنە ئەوەی خەڵك پەیاکەن بیبەن بیکوتن ، ئاسێ خۆی حازر کردو گوتی سبەینێ بەیانی زو ئەڵێن زەلام دێن ساوەرەکەمان بۆ ئەکوتن ، ناردیان دەسکەوان و کەل و پەلی ساوەر کوتانیان هێنا لەدێهاتی دەوربەرمان و لەژێر کەپری پێشمەرگەکان و کاك صالح مالومە هەموو شتەکانی ئامادەکرد. ئێمەش لەژێر کەپری خۆمان هەستاین و خەریکی منالان بوین بۆ بەرچایی خواردن منیش بەیانیان هەر زو ڕادیۆکەم ئەکردەوە کە گوێم لەدەنگ و باس بێت زۆرتری ئەمخستە سەر ڕادێۆی عەرەبی بەغدا تابزا[illegible] چیمان پێ ئەڵێن یەرنامەیەك هەبوو . دروست کرابوو بۆ هاندانی عەسکەرو سوپا و جاشی حکومەت. جاشی عەرەب ناویان فرسان الولید بوون. جاشی کورد ناویان فرسان صلاح الدین بو. عەسکەریش ئەوە بانگی ئەکردن یا قواتنا المسلحە الأبطال.

ڕادیۆ دەنگی بەرزبووەوە و کاتی ئەوبەرنامەیە بو هەروەها دو گۆرانی بێژیش کە یەکێکیان گۆج بوو بۆیە ناویان نابوو شەلەو گۆجە شەلەو گۆجەش بەین بەین گۆرانی یان ئەگوت کە ئەویش هەر پیا هەڵدان بوو سەیر ئەوە بوو شەلەو گۆجە پێکەوە گۆرانیان ئەگوت دیسان لەبەینی



قسەکاندا بێژەری ڕادیۆ گوتی یا فرسان الولید المفواویر یا فرسان صلاح الدین الشجعان یاقواتنا المسلحە الباسلەالأبطال منیش لەوکاتە لەدەرێی کەپرەکە بووم کە گوێم لێبوو دەنگێك لەژێر کەپری ساوەر کوتانەکە دێت دەنگەکە چەند کەسێك قسە ئەکەن و یەکێك ئەڵێت : ( هەی کلب ابن الکلب قواتك المسلحە جاعدە تهبش ) یەعنی هەی سەگی کوڕی سەگ هێزی چەکدارت دانیشتوە ساوەر ئەکوتێت.

من سەرم سوڕما و گورج چومە بەردەمی کەپرەکە کەسەیر ئەکەم چوار عەسکەری قوڕ بەسەری ئەسیر دانیشتون بە دیار ساوەر و دەستکەوانی گەورەی دارەوە خەریکی ساوەر کوتانن. سەلامم لێ کردن و بەعەرەبی قسەم لەگەڵ کردن دڵیان زۆر خۆش بوو کە قسەم لەگەڵ کردن بە عەرەبی و زۆر ناڕەزایی خۆیانیان دەربڕی بۆ ئەم شەڕەی حکومەت و کەوا بەدەستیان نیە کە نێرراون و زۆر مەتحی شۆڕش گێڕان و پێشمەرگەیان کرد کە زۆر باشن لەگەڵیان تەنیا یەکێك هەیە ناوی مشانە عەزیەتیان ئەدات منیش پێم گوتن دەست هەڵگرن و ئیتر هەستن وەرن دەستان بشۆن و بانگم کردە خولەو ئاسێ و ئەحمەد هەورامی کوڕمان کە نانیان بۆ بێنن و چایان بدەنێ هێلکەو ڕۆنیان بۆ کردن بە کاك صالح مالومەشم گوت کە بۆچی دیسان عەسکەری ئەسیریان هێناوە بڕۆ خەڵك بگرە بەکرێ عەسکەر لەخۆشیانا گوتیان بەخوا کەس نابێت بێت لەئێمە زیاتر و ئێمەش حەزئەکەین ئەم ئیشەیان بۆ بکەین ئیتر چەند ڕۆژە لەبەیانیەوە ئەهاتن و خەریکی ساوەر کوتان بوون هەڵۆی کوڕم کە ئەوکاتە هەر دەساڵ بو هەر بەوەدا ئەگەیشت بچێت ناوجلەکانمان بگەڕێت و گۆرەوی و پاکەتە جگەرە و شتیان بۆ بێنێت. نان و چاو ئەوەی ئەمانخوارد بەشی ئەوانیشمان ئەدا.

عەسکەر ئیتر دڵیان کرایەوە کە ساوەریش تەواو بو گوێیان هەڵەخست بۆ کارێك کە بیانێرێن ( بۆ بیت المامۆستا ) بەتایبەتی کەلەویەوە و لەشوێنی ئازوقەوە. تەنەکە نەوت و ئازوقەمان بۆئەهات.

زستان و سەرما و بارانی پەلەدەستی پێ کرد ناچار ئەبو بچین بۆ ناو دێ و ناو خانو لەوکاتانە ماڵی کاك ئەحمەدی تەهاش گەیشتبونە دێی (ئاوەکورتێ) باوکی هێرۆ نامەی بۆ ناردم کە بچم لەو دەورە شوێنێك ببینم کە ئەگەر بە دڵم بو بگوێزینەوە ئەوێ لەبەر زستان. یەکەم جار هاتن بەدواما کە بچم بۆ دێی (ئاوە کورتێ) بەتایبەتی کە ماڵی کاك ئەحمەد تەهای برادەرو ناسیاومان لەوێ بوون. کەوتینە ڕێ بەسواری وڵاخ خەزێنە زۆر دوریش نەبو لەئاوەکورتێ ئاخری گەیشتینە لای نەجیبەخانی ژنی کاك ئەحمەد تەها و دایکی کە ژنێکی زۆر ڕو خۆش و قسە خۆش بوو تا ئێوارە لەوێ ماینەوە نان و چێشتی خۆشیان داینێ و زۆر بەقسەکانی دایکی نەجیبە خانی قسە خۆش پێ کەنین. هەستاین کە بگەڕینەوە خەزێنە دونیا خەریك بو تاریك ئەبوو لەڕێگا بەسەر پشتی وڵاخەوە کە گەیشتبوینە ئاخری دێکەی ئاوە کورتێ سەرم هەڵبڕی کە سەیر ئەکەم شەوقی چرا لۆکسێك لەبەرزاییێکی ناوقەد شاخێکەوە دیارە دیمەنەکە زۆر جوان و دڵگیر بو لەدڵی خۆما گوتم ئێرە کوێیە و ماڵی کێیە خۆزگەم بە خۆیان بۆ ئەو شوێنە خۆشە دوای لەکاك صالح مالومە و پێشمەرگەکەی ترم پرسی و گوتم : ئەم چرا و شوێنە هی کێیە بەڕاستی جوان و دڵگیر دیارە.

جوابیان دامەوە و گوتیان باجی ئەوە ماڵی و موڵکی علی ئاغایە ئەم شوێنە پێی ئەڵێن کانی حسینی ئیتر قسەی بەسەردا هات و تاگەیشتینە شوێنەکەمان هەر بیریشم نەما باسی ئەو شوێنە خۆش و جوانە. چەند ڕۆژێکی ترمان پێ چو دیسان باوکی هێرۆ نامەیەکی تری بۆ ناردم و



گوتی شوێنێکیان بۆ پەیا کردون بڕۆ سەیرکە ئەگەر بە دڵت بێت بەڵام ئەڵێن بۆ زستان نسرمە و زو هەتاوی لێ ئاوا ئەبێت لەبەر شاخەکانی دەورووپشتی.

دیسان هەستاین لەگەڵ یەك دو مناڵ و کاك صالح و خەڵکی تر کەوتینە ڕێ بە ووڵاخ بۆ شوێنەکە. سەیرئەکەم هەر بەرەو ئاوەکورتێمان ئەبەن گوتم ئەوە دیسان بۆ ئەوێ ئەچین گوتیان نەو شوێنێکی ترە بەڵام ڕێگاکەی بەلای ئاوەکورتێ ئەچێت دیارە کاك صالح مالومە و ئەوانەی خۆشمان نەیان ئەزانی کوێیە خەڵکی کە هاتبون بەدوامانا.

کە نزیك ئاوە کورتێ بوین سەیرم کرد قەتارچی سەری ووڵاخەکانیان ڕاکێشا بەلای ڕێگایەکی باریك و بەرزەوە کە هەمووی دارستان و میوەو باخ و ڕەز بوو بەرە بەرە سەرکەوتین حەپەسام و گوتم ئەوە بۆ کوێ ئەچین و ئەوانەی هاتبون بە دوامانا گوتیان ئەچین بۆ ئەو سەرە پێی ئەڵێن کانی حسینی موڵکی علی ئاغایە. علی ئاغا بە مامۆستای گوتوە ئێمە هاوینان لەم شوێنەین زستانان ئەچینەوە ناو دێیەکە ئەگەر ماڵەوەتان ئێرەیان پێ خۆشە بابێنە شوێنەکەمان من زۆر زۆرم پێ خۆش بوو هەر سەرم سوڕما لەم ڕێکەوتە و بۆ ئەو شوێنەی کە ئاواتم پێ خواست بوو ئەو ڕۆژە چەند ۆرزگەم بە خۆیا گوتبو لەدڵی خۆما خێرەد ا ئەمەوێ ش تیگی بلێم کە . جاری پێشوش لەچواردەی تەموز کە چووین بۆ بەغدا و لەوێ ماوەیەك بۆ خانوو گەڕاین دوایی بەبەردەمی خانوێکدا تێ پەڕین و گوتم ئۆ خوا خۆزگە کەلاوەیەکی وەکو ئەمەشمان دەست کەوتایە کەچی دوای دوسێ ڕۆژ بردیا سەیری کەم کەچی ئەو ماڵەدەرچو کە گوتبوم خۆزگە کەلاوەیەکی واشمان دەست کەوتایە. لەشوێنێی تر ئەم باسەم بە تەواوی کردووە پێش ئەم لاپەڕانە زۆر ڕێکەوتەکە سەیرە لەژیانما سێ جار خۆزگەم بەشوێنێك خواستوە کەچی بۆم بووە. سێهەم شوێن لەناو تەیارەدا

بووم ئەچووم بۆ شام لەلندەنەوە شوێنەکەم ناوەڕاستی دوکەس بوو زۆرم پێ ناخۆش بوو لەو لاشەوە دو ژن دانیشتبون شوێنەکەیان زۆر خۆش بوو بەڵام دیسان کورسی ناوەڕاست چۆڵ بو منیش زۆرم ڕق لەناوەڕاستە لەدڵی خۆما گوتم خۆزگەم بەو دوژنە شوێنەکەیان چەند بێ دەنگ و خۆشە کەچی دوای نیو سەعاتێك سەیر ئەکەم شوێنەکە چۆڵ بوو ئەو دوژنە چوونە شوێنێکی تر کە هیچی یەکیش نەبوون و هەر قسەشیان ئەوەندە لەگەڵ یەکتری نەئەکرد. کە دیم شوێنەکە چۆلەهەر زو بانگی میوانداری فڕۆکەکەم کرد و گوتم ئەوتوا بچمە ئەو شوێنە ژنەکە گوتی ڕاوەستە زا ئەو ژنانە بۆ کوێ چون چونکە ڕەنگە ئێستە بێنەوە گوتم جانتاکانیشیان برد تۆزێ ئەو لاچو دوایی گەڕایەوە و گوتی : ئەتوانی بچیت ئەوانە هەرکەسە چونە تەنیشت ئاشنا و خزمی خۆی خەریك بوو باڵ گرم لەخۆشیانا و هەستام وشتەکا برد کورسیەکان بوون بەسێ چونکە یەکێکیان هی ناوەڕاست بەتاڵ بوو هەندێ لەپشتەوە بو لەبەرئەوە زۆر خۆش بوو بۆ خۆم پاڵ کەوتم تاوەکو شام ئەمە لەژیانما سێ جار وا ئاواتم هاتۆتە دیی بۆ شوێنێکی حەزم کردبێ دیارە هەمووشی هەر ڕێکەوتبوە.

ئێستە بێنەوە سەرباسی ئاوەکورتێ و کانی حسینی موڵکی علی ئاغا بەڕاستی علی ئاغا و ئەو ئاغایانەی ئەو دەوروپشتە زۆر زۆر پیاو چاك و لەپشت شۆڕش بوون بۆ هەموو یارمەتی دانێك. گواستمانەوە کانی حسینی جاری پێشو کە چووم سەیرم کرد زۆرم بە دڵ بوو ماڵی علی ئاغا هێشتا لەوێ بوون و ئەیانگواستەوە بۆ ناودێ زۆر ماڵی باش و موحتەرەم و دڵسۆز بوون هەر هەموویان بەژن و پیاوەوە بەتایبەتی دایکە بەڕێزو خاتون و موحتەرەمەی هەر ئەتگوت وەکو مەسەل گوتەنی شەکر و هەنگوین بوو باوەشی بۆ کردینەوە و هەر بەقوربان و حەیرانمان ئەبوو



قەت چاکی ئەوانەم لەبیرناچێتەوە لەکاتی تەنگانەدا چۆن خۆیان ئەخستە مەترسیەوە لەبەر شۆڕش و شۆڕشگێڕانی.

ماڵی علی ئاغا لەکەپرێکی زۆر درێژو گەورەدابوون لەولا تریشەوە شوێنێکی خۆشی بەردەم فەرەح و کراوە خانوێکی ڕوخاوی لێبوو بۆیە هەر زو وەستاو کرێکار هاتن خانوەکەمان بۆ ئاوەدان کەنەوە سەر لەنوێ چونکە دیواری هەمووی نیوە بوو سەقفی نەبوو دەمێك بوو وابو بۆیە ئێمە پێویستمان پێ بوو چونکە خۆ نەئەبو لەکەپرابین لەبەر باران و سەرما هەرچۆنێك بوو پایز بەهەراو هوریاوە هەڵی کوتایە سەرمان کە هێشتا لەکەپرا بووین بارانی پەلەدایگرتین نیوەشەو بوو هەمووومان بەڕیز نوستبوین وەکو گوتم کەپرەکە زۆر درێژ و گەورە بوو بەڵام ئەوشەوە چیمان بەسەرهات ئەوە دەفتەر و کتێبی تایبەتی ئەوێت بەڵام من ئەمەوێت لەدوسێ دێڕدا باسی بکەم بە کورتی. کەپرەکەمان پڕبوو لەئاو و هەر ئەتگوت هیچمان بەسەرەوە نیە. نوێن و مناڵ و زەخیرە و برنج و ئاردو ڕۆن و شەکر و ساوەرەکەی پێوە ماندوبوین لەگەڵ عەسکەری ئەسیر هەر هەمووی بوون بە هەویر و قوڕ مناڵ هەر لەتەپڵی سەریانەوە تاوەکو قاچ و قۆڵ و پەنجەی پێیان ئەتگوت بەجلەوە خەریکی مەلەکردنن. شەو زۆر درەنگ بوو ئەو کەسانەی لەلامان هەموو هەر خەریکی مناڵەکان بوون چونکە شتی تر دەستی لێ شۆرابو بارانیش بە لێشاو ئەباری بێجگەلەهەورە تریشقە و گرم و هوڕ ، هەر ئەوەندەمان زانی لەناو دێیەکە پێشمەرگە قارەمانەکان بە دەنگمانەوە هاتن بەو حاڵ و باران و بروسکە و هەڵایە چونکە ئەیانزانی ئێستە چیمان بەسەر هاتوە و ئاگاداری هەمووکارێکمان بوون.

لەناو دێیەکە پێشمەرگەی لێ بوو چونکە لەبەینی ئێمە و ئەودیو کوردستانی ئێران چەمێك بوو بۆیە ئازوقە و کەل و پەلی پێشمەرگە

هەمووی لەناودێیەکە بوو لەودیوەوە دابەش ئەکرا بەسەر بنکەکانا هەروەها خانوێکی چەند ژووری بەمەکینەی جل درونەوە لەوێ کە جلی خاکیان بۆ پێشمەرگەکان ئەدرو هەمووشیان کوڕی باش و دڵسۆزی میلەت بوون هەروەها جل دروش بوون لەشار بۆیە پەیوەندیان بە شۆڕشەوە کردبوو لەوێ گرد ببونەوە و جلیان ئەدروو هەروەها لطیف یا وەکو ناسرابو مشانی خزمیشمان لەوێ بو لێپرسراوی دابەش کردنی ئازوقە بوو پێشمەرگە گەیشتنە سەرمان و بەو حالەپەلاماری مناڵەکانیان داو یارمەتی گەورەکانیان دا کە بمانگەیەننە ناو دێیەکە. من هەر لەمناڵیەوە لەهەورە تریشقە ئەترسام و تاوەکو ئێستەش هەر حەزی لێ ناکەم و پێی ناڕەحەتم ئەترسم هەموو منداڵەکانیشم ئەوە ئەزانن بەڵام ئەوشەوە لەتاو منداڵەکا و لەسامی ئەو شەوە تۆفانیە هیچ بەخەیاڵما نەئەهات و ئەمگوت تازە لەچی بترسم ؟ لەم تۆفانە قەت خراپتر نابێت شوێنەکەمان زۆر بەرزبوو دوریش بوو لەناو دێیەکەو زۆر سەرەو لێژبو بروسکەکان دونیایان ڕوناك ئەکردەوە هەرچۆنێك بە هەر حاڵێك بو گەیشتنە ماڵی کاك نوری ئەحمەد تەها لەدێیەکە لەناو خانوێکی لەچاو لەلادێدا خۆش و تۆکمە بوو کاتی خۆی مەکتەب بوو. دیارە فەقیرانە چاوەڕێیان ئەکردین و ئاگادار کرابون کە ئەچینە لایان هەروەها خۆشیان بۆمان ناڕەحەت بوبون چونکە ئەیانزانی کە ئێستە وامان لێهاتوە.

ماڵی کاك ئەحمەد تەها هەموو لەخەو هەستابوون و هاتن بە پیرمانەوە سۆپای داریان بۆ داگیرساندین تاوەکو وشك ببینەوە مناڵ بەهەر حاڵێك بو چارەسەرکران هی وایان هەبوو خاولی و سەرجێگایان پیایان دراو تێوەیان ئاڵاند تاوەکو بەیانی. بەیانی دونیا هەندێ خۆشی کردو هەتاو تۆزە تۆزە دەرکەوت. ئاسێ و خولەشێتمان و کاك صالح مالومە و ئەحە هەورامی کوڕمان کە بەخێومانکرد و لەمناڵیەوە ئەوەندەش ئازابو هەموکاتێك کە



ئەمناردە ماوەت یاخود بەدزیەوە بۆ سلێمانی کە شتمان بۆ بێنێت بارەکەی ئەخستە سەر پشتی و کۆڵی و بەو شاخ و داخانەوە سەری ئەخست و ئەیهێنا بۆمان هەروەها لەئیشوکاردا زۆر ئازابوو جاری وا هەبوو کە باوکی هێرۆ سەری ئەدایەن زۆری کە سەر لەبەیانیان بوو لەگەڵ پێشمەرگە و ئەوانەی لەگەڵی لای ئێمە بەرچاییان ئەکرد ئەحمەد بە چاوتروکاندنێك بیست و سی کەسی ڕایی ئەکرد بەنان و چاو هێلکەو ڕۆن و هەمووشتێکەوە بەڵام ئەوەندە توڕە و عەصەبی بوو کە توڕە ئەبوو یەکسەر تاوەی هێلکەو ڕۆنی قلَپ ئەکردە ناو ئاگردانەوە. ئاسێ و ئەو خەڵکەی ماڵەکەی برد و سەر کەوتنە سەرێ بۆ شوێنەکەمان هەروەها دوژنی ناو دێیەکەش چوون یارمەتی بدەن یەکێکیان ناوێ بوکە حەبێ بوو بوکەحەبێ دانی لەدەما نەمابو ئەوەندە پیربو ئەو نانی تیری بۆ ئەکردین خولەشێتەکەمان زۆر بەزمی هەبو لەگەڵی کە بانگی ئەکرد نەنە حەبێ ئەویش توڕە ئەبو هەویرەکەی بەجێ ئەهێشت و ئەڕۆیشت بەدەم جنێودانەوە بە خولەئەیگوت دایکت نەنەیە باوکت نەنەیە ئیتر کاك صالح مالومە بەهەڵەداوانەوە ئەچو ئاشتی ئەکردەوە ئیتر ئەمە هەموو جارێك بەزممان بوو لەگەڵ خولەشێت و بوکە حەبێ. دوای ماوەیەك کە ئەوان سەرکەوتنە شوێنەکەمان هەر ئەوەندەمان زانی تەناف گرێدران و متیل و چەرچەف و نوێن بە شۆراوی و پاکی خرانە سەر تەناف و بەرهەتاو لەدورەوە ئەدرەوشانەوە چەند ڕۆژێك لەماڵی کاك ئەحمەد تەها ماینەوە بەڵام لەتۆفان و هەمووشتێك ناخۆش تر لەماڵی کاك ئەحمەد تەها ئەسپێ تێمان بەربوون مناڵ هەموو لەشیان بوبە زیپکە و سور هەڵگەڕا بەتایبەتی کوردەی کچم کە زۆر ناسك و سپی کەلانەبو. ئەپسیەکانیش هی خەڵك و ڕێبوارو لادێیی بو ئەوەندە لەسەرە ڕێگاوە ئەهاتنە ماڵی کاك ئەحمەد و لەوێ ئەنوستن بەسەرزمانانە دائم و هەمیشە ماڵەکەیان پڕبوو ئیتر ئەوانە کە

